

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣٨) پاییزی ٢٠٢٢



بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی


خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٢٢٦٢٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com





سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار

# ناوەڕۆک



## تەوەری ژمارە:


| | | |
|---|---|---|
| تێگەیشتنی زانستی بۆ هاوڕەگەزخوازی | د.جەعفەر عومەر - د.زانا ئەحمەد قەساب | ٥ |
| نارێکی ڕەگەزی | د.زانا ئەحمەد قەساب د.جەعفەر عومەر | ٣١ |
| هاوڕەگەزبازی ڕەفتارێکی بەدەستهاتووە یان بەهۆی جینەکانەوەیە کە کۆنترۆڵ ناکرێن | ڕێدار ئەحمەد | ٤٢ |
| هۆمۆ زیان بە نزیکترین کەسی خۆی دەگەیەنێ [گفتوگۆ لەگەڵ د.هێمن خورشد] | ئا: ئازاد جەلال | ٥١ |
| لادانی سێکسی یان هەڵبژاردنی سێکسی | د. دیاری أحمد قصاب | ٥٨ |
| پرۆسەی بەهێزکردنی ژنان لەنێو ئەجێندای نەتەوەیەکگرتووەکاندا جیاوازی لێکدانەوەکان | د. هەتاو حەمەساڵح | ٦٧ |
| لادانە غەریزەییەکان، دیدی یاسایی و هونەری بەرەنگار بوونەوەی | دانا دارا حسەین | ٧٥ |
| چەند ڕەگەزێک؟ قسەی بێمانا | وەرگێڕانی: بنار جەبار | ٧٩ |
| نەخۆشی دەروونی یان بژاردەی سێکسی | د. دانیال سەعدی حامد | ٨٥ |


## بابەتی گشتی:


| | | |
|---|---|---|
| هەڵویستی پارتی دیموکراتی تورکیا بەرامبەر بە ئایین (١٩٥٠-١٩٦٠) | عادل صدیق | ٩١ |
| سنەویزادە مەسعوود مەردۆخی | د.هێمن عومەر خۆشناو | ١١٧ |
| هەڵەبجە و ڕاپەڕینەکانی لە بیرەوەری ئازاد تۆفیق (پارێزگاری هەڵەبجە)دا | ئا: عادل صدیق | ١٢١ |
| دەستنووسی زانایانی کورد لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاران | کاروان عوسمان خەیات «ڕێبین» | ١٤٥ |
| ئایا خوێنەر سەنتەرە؟ | محەمەد جەمیل عەلی | ١٥٠ |
| بیبلیۆگرافیا ئیسلامی سیاسی ١٩٩٧- ٢٠١٠ | بوار نوورەدین | ١٥٥ |







# ئاریشەکانی خوێندنی ئایینی لە کوردستان

خوێندنی ئایینی لە سەدەکانی ڕابردوودا لە کوردستان چەقی هەموو زانست و خوێندەوارییەك بوو، زانای ئایینی وێڕای زانستە شەرعییەکان گەلێك زانستی تری دەخوێند، وەك زانستی فەلەك و بیرکاری و لۆجیك و فەلسەفە.. هتد. هەروەها زانا ئاینییەکان دەستێکی باڵایان هەبوو لە زمانزانی و ئەدەبیاتدا، شاکارەکانیان ئەمڕۆ جێگەی شانازی هەموو کوردێکی ڕەسەنە. بەڵام لە دوا نیوەی سەدەی پێشووەوە بەهۆی ئەو هەموو گۆڕانکارییەی کە لە هەموو کایەکانی ژیانی مرۆڤدا ڕوویاندا -بەتایبەت لە سیستمی خوێندن و پەروەردەدا- خوێندنی ئایینی پاشەکشەی کرد؛ بەشێوەیەك هەست دەکرێت کە ئەم خوێندنە لەم چەرخەدا لە قەیرانێکی قوڵدایە هەم لەڕووی میتۆد و پرۆگرامەوە هەم لەڕووی شێوازی فیربوون و پێگەیاندنی زانای ئاینییەوە. هەربۆیە لەم ژمارەیەی (خاڵ)دا بەپێویستی دەزانین هۆکاری ئەم پاشەکشە و ئاریشانەی خوێندنی ئایینی بخەینە بەرباس و ئەم پرسیارانە بخەینەڕوو:

١. حوجرەکانی کوردستان لەڕابردوودا چ ڕۆڵێکیان هەبووە لە پێشخستنی ئەدەب و زمان و زانست لە کۆمەڵگەدا؟ توانیویانە چی زیاد بکەن بۆ زانست و مەعریفە لەم ناوچانەدا؟

٢. تێکەڵکردنی زانستەکان لە خوێندنی ئاینیدا تا چەند توانیویەتی بازنەی زانستەکان فراوانتر بکات؟

٣. ئاریشەکانی بەردەم خوێندی ئایینی لەم چەرخەدا چین و کێ لێیان بەرپرسیارە؟

٤. لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی تێکەڵکردنی پرۆگرامی کۆنی خوێندنی ئایینی لەگەڵ پرۆگرامی نوێی ئەکادیمیدا چین؟ ئەم ئاوێتەکردنە چ خزمەتێکی کردووە بە ڕەوتی خوێندنی ئایینی؟

٥. ئەو ئەرکانە چین کە دەزگا پەیوەندیدارەکان پێویستە ئەنجامی بدەن بۆ بەرەوپێشبردنی خوێندنی ئایینی لە کوردستان؟

٦. ئایا پرۆگرامی خوێندنی ئایینی ئێستا دەتوانێت توێژەری بەتوانا بەرهەم بهێنێت؟

٧. هەڵسەنگاندنتان بۆ ڕۆڵی کۆلیجە زانستییە ئیسلامییەکان چییە؟ ئایا توانیویانە بە ئەرکی ئایینی و کلتووری خۆیان هەڵبستن؟

٨. هۆکارەکانی بێ قەدرکردنی خوێندنی ئایینی لە کوردوستاندا چین؟

٩. ئەو ڕەخنانە چین لە پرۆگرامی خوێندنی حوجرەکانی کوردستان لە ئێستادا دەگیرین؟

١٠. چۆن بتوانین ڕۆڵی خوێندنی ئایینی بگەیەنینە ئاستی شایستەی خۆی؟

**بابەت و لێکۆڵینەوەکانتان لەم بوارانەدا تا ڕێکەوتی (٢٠٢٣/١/١) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.**




# لادانە سێکسییەکان و گرفتی جێندەری

## لە نێوان زانست و بەرژەوەندیدا

ڕۆژئاوا بەچەشنی کاڵا و شمەکەکانی، لە بوارە ڕۆسنبیریی و کۆمەڵایەتییەکانیشدا مۆدیلی نوێ ناردەی ڕۆژهەڵات دەکات، ڕێگای جۆراوجۆریش دەگرێتەبەر بۆ پێشوازی لێکردن و وەرگێڕانی. ئەمڕۆش بەناوی زانستەوە گرفتی جێندەری بۆ هاوردە ناردوین و فشاری زۆریش بەکاردەهێنێت بۆ وەرگرتنی.

گۆڤاری خاڵ ئەم بابەتەی کردووە بە تەوەرەی ئەم ژمارەی، بۆئەم مەبەستە ڕووی لە کۆمەڵێک شارەزا و پسپۆڕی بوارەکە ناوە، هەتاکوو لەڕووی زانستییەوە بابەتەکە شەن و کەو بکەن، حەقیقەتی ئەو بابەتە چیە و چۆنە؟ ڕۆڵی زانستی دەروونناسی و قوتابخانەکانی لەم کێشەیەدا چییە؟ ئەدی کۆنگرە و کۆڕبەندە جیهانییەکان کاریگەرییان لەسەر سەپاندنی ئەم کەلتوورە چییە؟ گرنگترین ئەو ڕەخنە و گازندانەی لەو بوارەدا ئاڕاستەی دەروونناسی هاوچەرخ دەکرێت کامانەن؟ ڕۆڵی دامەزراوە پەروەردەیی و فێرکارییەکان لە وەرگرتن یات ڕەتکردنەوەیدا چین؟ زۆر لەم پرسیارانە و پرسیاری دیکەش کراون، بەوئومێدەی نووسەرانی ئەم جارەمان توانیبێتیان زانستییانە و بابەتیانە ئەم بابەتەیان ڕوون کردبێتەوە.

گۆڤاری خاڵ





نووسینی: د.جەعفەر عومەر - د.زانا ئەحمەد قەساب
پزیشکی پسپۆڕی دەروونی، دکتۆرا لە پزیشکی دەروونی

# تێگەیشتنی زانستی بۆ هاوڕەگەزخوازی



## ١. پێشەکی:

بابەتێکی گەرمی ڕۆژگار بریتییە لە «هاوڕەگەزخوازی»، بەشێوەیەک کۆی گشتی پێکهاتەکانی کۆمەڵگە پێیەوە سەرقاڵن، کۆمەڵگە گرنگییەکی زۆر بەم بابەتە دەدات(١). لە هەندێکباردا میدیا و کەسەکان بەگوێرەی ئارەزوو و ئایدۆلۆژیی خۆیان زانست و زانیارییەکان بڵاودەکەنەوە، بۆ نمونە هەتا ئێستا باوەڕێکی باوی گشتی هەیە پێیانوایە کە توشبوون بە هاوڕەگەزخوازی بەهۆی گۆڕانی ئاستی هۆرمۆنەکانەوەیە لەناو جەستەی مرۆڤدا (٢). خەڵکانی گشتی لە ڕێگەی هەواڵەکانی میدیاوە ئاشنای دۆزینەوە زانستییەکان دەبن، هەرچەندە ڕۆژنامەنووسان هەوڵدەدەن ڕێگەیەکی دروست لە نێوان وردی زانستی و تێگەیشتنی سادەدا بکەن، بەڵام ناتوانن. تەنەناتە هەندێکجار زاناکانیش ناتوان بە وردی ئەو بابەتە باسبکەن وەکو ئەوەی هەیە (١). ئەوەی کەمترین قسەی لەوبارەوە کردووە و بەشدارە پسپۆڕان و شارەزایانی بوارەکەن! زۆر بابەتی پەیوەست بە بابەتەکەوە لە دەرەوەی سەرچاوە زانستییەکانە، وەکو هەواڵی میدیایی، بانگەشە سیاسییەکان و پۆستەکان (١). ئەمەش هۆکارە بۆ هەڵەتێگەیشتنی زیاتر، دەرئەنجام کەسانێک کە هاوڕەگەزخوازن یاخود هەستی هاوڕەگەزخوزازییان هەیە، دەبنە قوربانی (٢).

لە سەدەی نۆزدەدا هاوڕەگەزخوازی لەلایەن فەیلەسوفان و پزیشکانەوە بە نەخۆشی و تاوان دانراوە، تەنانەت بە جۆرێک لە شێتی هەژمارکراوە (٣)، لە ئێستادا تێڕوانینی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی زۆر گۆڕاوە بەرانبەر بە هاوڕەگەزخوازی، لە ڕابردوودا هاوڕەگەزخوازی بە نەنگی سەیردەکرا، وەکو کێشەیەک کە دەبێت لەپێناو خۆپاراستن جەنگی لەگەڵ بکرێت و وەکو نەخۆشییەک دادەنرا بۆ چارەسەرکردن (٢). مشتومڕە سیاسییەکان لە سەرتاسەری جیهاندا، نمونەیەکە بۆ پەسەندنەکردنی هاوڕەگەزخوازی یان ڕەدکردنەوەی (١). سەرەڕای ئەوەی کە لە ماوەی ٥٠ ساڵی ڕابردوو گۆڕانکاری گەورە لە ماف و تێڕوانینی ئەرێنی بۆ هاوڕەگەزخوازان لە زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا بەدەستهاتووە، بەپێچەوانەوە لە زۆربەی وڵاتانی ئەفریقا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، وڵاتانی دەریای کاریبی و بەشەکانی ئاسیا، هاوڕەگەزخوازی نایاساییە و سزای توندی هەیە (١).

دوو ئاڕاستەی جیاواز دروستبووە، یەکێکیان پێیوایە هاوڕەگەزخوازان هۆکارن بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکان بەتایبەت ئایدز، زیادبوونی ڕێژەی ئەم جۆرە لە تاکەکان دەبێتە هۆی تێکچوونی گەشەی دانیشتوان، لەکاتێکدا کە ئەوان نەوە ناخەنەوە بەهۆی سێکسکردن لەگەڵ هەمان ڕەگەز (٤). ئاڕاستەی دووەم پێیوایە کە هاوڕەگەزخوازی ڕەفتارێکی ئاساییە و پێویست بە گۆڕین ناکات، بەڵکو پێویستە بە نەنگی سەیرکردنی




هاوڕەگەزخوازان لاببرێت و نەهێڵدرێت (٥، ٦).
هاوڕەگەزخوازی لە زۆربەی کۆمەڵگە و کلتورە جیاوازەکاندا بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی هەبووە(٦) (٧). زانستی ئاڕاستەی سێکسی جێگەی سەرنجی خەڵکی گشتییە لەبەر دوو هۆکار: یەکەم، هەروەکو تێبینیکراوە کە ئەم زانستە زۆربەی کات بەکاردێت بۆ پشتیوانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی هاڕەگەزخوازان. دووەم، زانستی ئاڕاستەی سێکسی (لێکۆڵینەوەی سەرەکی بۆئەوەیە کە بۆچی هەندێک کەس سەرنجڕاکێشانی سێکسیان بۆ پیاوانە و ئەوانی تر بۆ ژنانە) ئەمەش لە ناوەڕۆکدا بابەتێکی سەرنجڕاکێشە[١].
ئەم بابەتە پێویستی بە لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی هەیە، دەبێت تێگەیشتنی دروست لە ڕوانگەی پزیشکی و دەروونزانی بخرێتە ڕوو، هەتا بتوانین لە دیاردەکە تێبگەین و بڕیاری لەبارەوە بدەین. دەتوانین بڵێین بەچەند هۆکارێک تێڕوانینی زانستی ون و نادیارە، ئێمە لێرەدا لەچوارچێوەی سەرچاوە زانستییە نوێکانەوە باسی بابەتەکە دەکەین و هەوڵدەدەین تێڕوانینی دروست و ڕاست بخەینە بەردەست.

## ٢. هاوڕەگەزخوازی چییە؟

سەبارەت بە وەڵامی ئەم پرسیارە دەبێت لە چەند لایەنێکی تایبەتی سێکسی مرۆڤ تێبگەین، پاشان دەتوانین بەڕوونی بیناسێنین، ئێمە لێرەدا چەند لایەنێکی گرنگ ڕووندەکەینەوە کە پەیوەستن بە تێگەیشتن لە تەواوی بابەتەکە.

### ٢. ١. زاراوەکانی تایبەت بە ڕەفتاری سێکسی:

چەندین لایەن هەن کە پەیوەستن بە سێکسەوە، ئێمە لێرەدا چوار زاراوەی تەواو پەیوەست باس دەکەین:

### ٢. ١. ١. سێکس (Sex):

لایەنێکە کە لە لەدایکبوونەوە دیاریکراوە (یاخود لە پێش لەدایکبوون کە بە سۆنەر دەزاندرێت)، لەسەر بنەمای ئەندامە دەرەکییە سێکسییەکانی تاک. کاتێک کە ئەندامەکانی زاوزێ شێواو و ناتەواوبن ئەوە دیاریکەرەکانی (وەکو ئەندامەکانی زاوزێی ناوەکی، کرۆمۆسۆمەکان، و هۆرمۆنە سێکسییەکان) دەبنە هۆی دیاریکردنی سێکس. سێکسیش بەگشتی گونجاوە لەگەڵ ڕەگەزی تاکدا (٨). بەگشتی دابەشدەبن بەسەر نێر، مێ یان نێوانسێکس (٩)

- نێر (Male)؛ ئەو کەسانەن کە ئەندامەکانی زاوزێیان (ناوەکی و دەرەکی) نێرانەیە، پێکهاتەی کرۆمۆسۆمیان (XY)ی تێدایە، هۆرمۆنی سێکسی نێرینە تیایاندا بەرزە.
- مێ (Female)؛ ئەو کەسانەن کە ئەندامەکانی زاوزێیان (ناوەکی و دەرەکی) مێیانەیە،

پێکهاتەی کرۆمۆسۆمیان (XX)ی تێدایە، هۆرمۆنی سێکسی مێینە تیایاندا بەرزە.

- نێوانسێکس (Intersex)؛ ئەو کەسانەن کە بەهۆکاری تایبەتی تێکچوونێک لە ئەندامەکانی زاوزێیان هەیە و لە لەدایکبوونەوە دەردەکەون و بە ئاسانی و بە بینین ناتواندرێت بزاندرێت کەسەکە نێرە یان مێیە. (لە بەشەکانی داهاتوو باسی چەند نمونەیەکمان کردووە)

**٢. ١. ٢. ڕەگەز (Gender):**

ئاماژەیە بۆ تێڕوانینەکان، هەستەکان و ڕەفتارەکان کە کلتوورێکی تایبەتی دەیداتە کەسێک لەگەڵ لایەنی سێکسی بایۆلۆجی تاک. ئەو ڕەفتارانەی تاک کە گونجاون لەگەڵ چاوەڕوانییە کلتوورییەکان بۆ سێکسی کەسەکە بە ڕەگەز ئاسایی دادەندرێن، ئەو ڕەفتارانەش کە ناگونجێن لەگەڵ تێڕوانینەکان (ڕەگەز نەگونجاوی) پێکدەهێنن. (١٠)

- ڕەگەزی نێر ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ڕەفتاری نێرانە دەکەن لە کۆمەڵگەدا.
- ڕەگەزی مێ ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە ڕەفتاری مێیانە دەکەن لە کۆمەڵگەدا.

کەواتە؛ سێکس بەکاردێت بۆ لایەنی بایۆلۆجی نێربوون و مێبوون، لەکاتێکدا ڕەگەز بریتییە لە لایەنەکانی دەروونی، ڕەفتاری، کۆمەڵایەتی و کلتووری نێربوون یان مێبوون (١١).

**٢. ١. ٣. ناسنامەی ڕەگەزی (Gender Identity):**

بریتییە لە ناسینەوەی خود بەوەی کە نێرە یان مێیە، لەژێر کاریگەری هۆکارە بایۆلۆجیی و ژینگەییەکاندایە (١١). بەواتەیەکی تر هەستێکی قوڵی ناوەکی تاکە بۆ هەستکردن بەوەی کە کوڕ، پیاو یان نێرە، یاخود کچە، ژنە یان مێیە. لەوانەیە ئەم هەستکردنە بە ڕەگەز هاوتا بێت لەگەڵ سێکسی کەسەکە کە لەکاتی لەدایکبوونەوە هەیەتی یان نیشانە سێکسییە دووەمییەکان یاخود هاوتا نەبێت (٨). (لە بەشەکانی داهاتوو باسی ئەو کەسانە کراوە سێکسی بایۆلۆجیان هاوتانییە لەگەڵ ناسنامەی ڕەگەزییان.)

**٢. ١. ٤. ئاڕاستەی سێکسی (Sexual Orientation):**

پێکهاتەیەکی ناسنامەیە کە سەرنجڕاکێشانی سێکسی و هەڵچوونی دەگرێتەوە کە تاک هەیەتی بەرانبەر بە کەسێکی تر، هەروەها ڕەفتار و پەیوەستی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە کە بەهۆی ئەم سەرنجڕاکێشانەوە دروست دەبێت (٨). دەشتوانین بڵێین بریتییە لە سەرنجڕاکێشانی سێکسی بەردەوامی تاک بەرانبەر بە هاوبەشێکی نێر، هاوبەشێکی مێ یان هەردووکیان، ئاڕاستەی سێکسی لەوانەیە جیاڕەگەزخواز (heterosexual)، هاوڕەگەزخواز (homosexual) یاخود دووڕەگەزخواز (bisexual) بێت (١١).
ئاڕاستەی سێکسی بەکاردێت بۆ شێوازی وروژانی جەستەیی و هەڵچوونی تاک بەرانبەر بە کەسانی تر(٧):

- جیاڕەگەزخوازان؛ کەسانێکن کە سەرنجڕاکێشانیان بۆ سێکسی جیاواز لە خۆیانە.
- هاوڕەگەزخوازان؛ سەرنجڕاکێشانیان بەرەو کەسانی هەمان سێکسی خۆیانە.
- دووڕەگەزخوازان؛ سەرنجڕاکێشانیان بۆ هەردوو سێکسەکەیە.

هاوڕەگەزخوازە نێرەکان بە زاراوەی گەی (gay) ناسێندراون و هاوڕەگەزخوازە مێیەکانیش زۆرجار بە لیسبیان (lesbian) (٧).

**٢. ٢. ڕەهەندەکانی ئاڕاستەی سێکسی:**

ئاڕاستەی سێکسی بریتییە لە سەرنجڕاکێشانی سێکسی و پەیوەستی هەڵچوونی بە کەسێکی تایبەت یان جۆرێک لە جەستەوە. دەتوانین لە ئاڕاستەی سێکسی تێبگەین کە لە سێ ڕەهەندی جیاواز پێکهاتووە؛ ناسنامەی سێکسی (sexual identity)، ئارەزووی سێکسی (sexual desire)، و ڕەفتاری سێکسی (sexual behaviors) (٣). بەواتایەکی تر گرنگە کە جیاوازی بکەین لە نێوان سێ لایەنی هاوڕەگەزخوازی، ئەوانیش بریتین لە دەرخستنی ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی (expression)، سەرنجڕاکێشانی هاوڕەگەزخوازی (homosexual attraction)، و ناسینەوە و پەسەندکردنی ئەو سەنجراکێشانە لەناو کۆمەڵگەدا (recognition/acceptance of this attraction) (٢). هەندێکجار ئاڕاستەی سێکسی دابەشدەکرێتە سەر چوار دیاردەی پەیوەندیدار کە دەچنە چوارچێوەی ئاڕاستەی سێکسییەوە، بەڵام لە ڕووی بیرۆکەیی و ئەزموونی لەیەکتری جیاوازن (١):

١. ڕەفتاری سێکسی (sexual behavior)؛ پێکدێت لە کارلێکی سێکسی لە نێوان دوو کەسی هەمان سێکس (هاوڕەگەزخواز)، لەگەڵ سێکسی جیاواز (جیاڕەگەزخواز)، یان هەردوو سێکسەکە (دووڕەگەزخواز).
٢. ناسنامەی سێکسی (sexual identity)؛ بریتییە لە بیرۆکەی خودی تاک (هەندێک کەس بۆ خەڵکی ئاشکرای دەکەن، هەندێکیش ئاشکرای ناکەن) وەکو هاوڕەگەزخواز، جیاڕەگەزخواز، دووڕەگەزخواز.
٣. پلەی سەرنجڕاکێشانی سێکسی (degree of sexual attraction) بۆ هەمان سێکس، هەردوو سێکسەکە یان سێکسەکەی تر.
٤. وروژانی جەستەیی سێکسی (physiological sexual arousal) بەرانبەر پیاوان یان ژنان.

بەگشتی دەتوانین بڵێین هاوڕەگەزخوازی سێ ئاستی هەیە (وێنەی ژمارە ١) (٣):

- ناسنامەی سێکسی: کە بریتییە لە پەسەندکردنی هاوڕەگەزخوازی و ناسینەوەی خود وەکو کەسێکی هاوڕەگەزخواز.

- سەرنجڕاکێشانی سێکسی؛ کە ئارەزوو و وروژانی سێکسی دەگرێتەوە؛ کەسەکە ئارەزووی سێکسی هەبێت بەرانبەر بە ڕەگەزی خۆی و لەڕووی سێکسییەوە بورووژێت.
- ڕەفتاری سێکسی؛ کەسەکە کردەی سێکسی لەگەڵ ڕەگەزەکەی خۆی ئەنجام بدات.

ئەم پێکهاتانە هەمیشە بەیەکەوە گونجاونین، لەبەرئەوەی لایەنەکانی ناسنامە و ڕەفتاری تاک لە لایەن چەندین هۆکارەوە هاندەدرێن (کلتوور و ئایین نمونە دیارەکانن)، هەروەها بەیەکەوەبەسترانی ئەم ڕەهەندانە لەوانەیە جێگیر و دەتوانێت بەگوێرەی کات بگۆڕێت. بۆ نمونە لەوانەیە کەسێک بە یەکێک لە ئاڕاستە سێکسییەکانی گرووپی (هاوڕەگەزخوازی و دووڕەگەزخوازی) بناسرێتەوە، بەڵام بەشداری دەکات لە ڕەفتارێکی سێکسی کە ناگونجێت بۆ ناسنامە سێکسییەکەی (٣). بۆ نمونە ئەنجامدانی ڕەفتاری سێکسی بەرانبەر بە هەمان ڕەگەز بەشێوەیەکی ناوبەناو یان تەنانەت دووبارەبووەوەش زیاتر پەیوەستە بە نەبوونی ڕەگەزی بەرانبەر بە هۆکارێکی دیاریکراو، ئەمە لە ئاژەڵان و مرۆڤیشدا ڕوودەدات. ئەمەش بە بەردەستبوونی ڕەگەزی بەرانبەر کۆتایی بە ڕەفتارەکە دێت و ئەم کەسانە بە هاوڕەگەزخواز داناندرێن، چونکە پاڵنەرەکە تەنها تێربوون و خاڵیبوونەوەی پاڵنەری سێکسییە(٢).




وێنەی (١) ڕەهەندەکانی ئاڕاستەی سێکسی

## ٢. ٣. ئاڕاستەی سێکسی هێڵێکی بەردەوامە:

کینسی و هاوڕێکانی لە ساڵی ١٩٤٨، پێوانەی کینسیان دانا بۆ ڕەفتاری سێکسی (Kinsey Scale of Sexual Behavior)، هەتا نیشانی بدەن کە چۆن کردەی سێکسی ناتواندرێت سنورداربکرێت بەوەی کەسێک کە هاوڕەگەزخوازە یان جیاڕەگەزخوازە! بەڵکو مەودایەکی بەردەوامە لەسەر بنەمای چەند هۆکارێک، کە بریتین لە ڕەفتار (behavior)، ئارەزوو (desire)، و خەیاڵ (fantasy) (١٢). توێژینەوەکان بە درێژایی چەندین سەدە

ئەوەیان دەرخستووە کە ئاڕاستەی سێکسی مەوداکانی بە درێژاییەکی بەردەوام دەڕوات، لە سەرنجڕاکێشانی تەواوی (exclusive) بۆ سێکسی بەرانبەر هەتا سەرنجڕاکێشانی تەواوی بۆ هەمان سێکسی خۆی (٦).

بە بەکارهێنانی پێوانەی کینسی لەسەر زیاتر لە ١١ هەزار بەشداربوو، ئەنجامەکان ئەو نیشاندەدەن کە ئاڕاستەی سێکسی زۆر گۆڕاو و جیاوازە، بەشێوەیەک کە زۆرێک باسیان لە ئەزموون و بیرکردنەوەکانیان کردووە کە لە نێوان «جیاڕەگەزخوازی» و «هاوڕەگەزخوازی» دایە (١٢). پێوانەی کینسی حەوت خاڵ دەگرێتەوە کە بریتین لە: (١٢)

٠١ بە تەواوی جیاڕەگەزخوازە، لەگەڵ نەبوونی هاوڕەگەزخوازی

(Exclusively heterosexual with no homosexual)

٢ بەردەوام جیاڕەگەزخوازە، تەنها ناوبەناو هاوڕەگەزخوازە

(Predominantly heterosexual, only incidentally homosexual)

٣ بەردەوام جیاڕەگەزخوازە، بەڵام زیاتر لە ناوبەناو هاوڕەگەزخوازە

(Predominantly heterosexual, but more than incidentally homosexual)

٤ بە یەکسانی هاوڕەگەزخواز و جیاڕەگەزخوازە

(Equally heterosexual and homosexual)

٥ بەردەوام هاوڕەگەزخوازە، بەڵام زیاتر لە ناوبەناو جیاڕەگەزخوازە

(Predominantly homosexual, but more than incidentally heterosexual)

٦ بەردەوام هاوزڕەگەزخوازە، تەنها ناوبەناو جیاڕەگەزخوازە

(Predominantly homosexual, only incidentally heterosexual)

٧ بە تەواوی هاوڕەگەزخوازە (Exclusively homosexual)

### ٢. ٤. پێناسەی هاوڕەگەزخواز:

بەشێوەیەکی گشتی ئاڕاستەی سێکسی لە سێ بەشدا باسکراوە (٦):

- جیاڕەگەزخواز؛ بوونی هەستوسۆز، ڕۆمانسییەت، یان سەرنجڕاکێشانی سێکسی بۆ ئەندامانی سێکسی تر. واتە ورووژان و کرداری سێکسی ژن بەرانبەر پیاو، و پیاویش بەرانبەر ژنە.
- هاوڕەگەزخواز؛ بوونی هەست و سۆز، ڕۆمانسیەت یان سەرنجڕاکێشانی سێکسی بۆ ئەندامانی سێکسەکەی خۆی. واتە پیاو ئارەزوو و کرداری سێسکی لەگەڵ پیاو هەبێت و ژنیش لەگەڵ ژن.
- دووڕەگەزخواز؛ بوونی هەست و سۆز، ڕۆمانسیەت و سەرنجڕاکێشانی سێکسی بۆ

هەردوو سێکسەکە (واتە بۆ هەردوو سێکسی پیاوان و ژنان کەسەکە وروژان و سەرنجڕاکێشانی سێکسی هەیە).

لێرەوە تێدەگەین کە هاوڕەگەزخوز کەسێکە کە بۆ تێرکردنی لایەنی سێکسی ئارەزووی لە تاکێکە کە لە ڕەگەز و سێکسی خۆی بێت، لە ڕووی ئارەزوو، وروژان و ئەنجامدانی کاری سێکسییەوە. بەو واتایەی کە نێر ئارەزوو و کردەی خۆخاڵیکردنەوەی سێکسی لەگەڵ نێرێک بێت، و ڕەگەزی مێش بۆ مێ!

### ٣. **هاوڕەگەزخوازی چی ناگرێتەوە؟**

ئەو کێشە سێکسییانەی تر کە لەگەڵ هاوڕەگەزخوازی تێکەڵ دەبن، بەتەواوی جیاوازن لە هاوڕەگەزخوازی دوو لایەنی سەرەکی دەگرێتەوە، پێویستە جیایان بکەینەوە:

٣. ١. تێکچوونە سێکسییە ئەندامییەکان:

چەند جۆرێک لە شڵەژان هەن کە لە مرۆڤدا ڕوودەدەن و تێکچوون لە لایەنی سێکسی تاکدا دەکەن. ئەو تێکچوونانە لەناو سکی دایکدا ڕودەدەن و منداڵ کە لەدایک دەبێت تێکچوونەکەی هەیە، زۆرجار لە کۆمەڵگەدا بە ڕەگەزی سێیەم یان نێوانسێکس (Intersex) یاخود نێرەمووک ناویان دەبرێت. ئەم نەخۆشیانەش زۆر و هەمەچوشنن!

لێرەدا دوو نمونە باس دەکەین:

**٣. ١. ١. کۆنیشانەی نەبوونی هەستیاری بۆ ئەندرۆجین (Androgen Insensitivity Syndrome):**

لەم شڵەژانەدا، کەسێک کە بە بۆماوە سێکسەکەی نێرە (XY)، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە وەرگرەکانی هۆرمۆنی نێرینە بە باشی کارناکەن، دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسەکە نەتوانێت ئەندامەکانی نێرینەی بەتەواوی دروست ببن (٢)، ئەمەش بەگوێرەی جۆری کێشەکە کە بەتەواوی کەسەکە وەرگرەکانی کارناکەن یاخود چەندەیان کاردەکەن دەگۆڕێت (١٣). ئەم جۆرە کەسانە زۆرجار وەکو ڕەگەزی مێ گەورە دەکرێن لە کۆمەڵگەدا (١٤). لەبەر ئەم هۆیەش ئاڕاستەی سێکسیان جیاواز دەبێت کە ئایا بەهۆی کاریگەری وەرنەگرتنی هۆرمۆنەکەیە لەسەر مێشکی کەسەکە کاتێک کە لە سکی دایکیدایە، یاخود بەهۆی شێوازی گەورەکردنییەوەیەتی (٢).

**٣. ١. ٢. گەورەبوونی زگماکی ڕژێنی ئەدرینال (Congenital adrenal hyperplasia):**

بریتییە لە گرووپێک لە نەخۆشی زگماکی کە تیایدا هۆرمۆنە ستیرۆیدییەکان کەمتر دەردەدرێن ئەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی درووستبوونی کۆرتیزۆڵ (١٥)، بەوهۆیەوە هۆرمۆنی نێرینە زۆر دەردەدرێت لەلایەن کۆرپەی ناو سکی دایکەوە و دەرئەنجام

جیابوونەوە و دروستبوونی ئەندامی زاوزێی نێر و مێ تێکدەچێت (٢)، خودی خۆی کەسەکە لەڕووی سێکسییەوە کرۆمۆسۆمەکانی سێکسی مێی هەیە کە بریتیین لە (XX)، بەڵام بەهۆی کاریگەری هۆرمۆنەکانەوە ئەندامەکانی زاوزێی دەرەکی لە ڕووکاردا لە ڕەگەزی نێر دەچن (١٥). ئەمەش هەندێکجار دەبێتە هۆی هەڵەکردن بە دەستنیشانکردنی منداڵەکە بە ئاڕاستەی نێردا لەکاتێکدا کە خودی منداڵەکە کچە (١٦).
ئەم کەسانە دەگونجێت وەکو کوڕ گەورە بکرێن، بەتایبەت لە ڕابردوودا، ئەمەش وادەکات هەندێکجار ئاڕاستەی سێکسیان بگۆڕێت (٢). دەرکەوتووە کە توشبووان بەم نەخۆشییە زیاتر لە کەسانی تر ئاڕاستەی هاورەگەزخوازییان هەیە (١). ئایا ئەمە بەهۆی کاریگەری هۆرمۆنەکانەوە کە لەسکی دایکیدا زۆرتر هۆرمۆنی نێرینەی دەرداوە، یاخود بەهۆی گەورەکردنی منداڵەکەوە وەکو نێرە (٢).

**٣. ٢. ناڕێکی ڕەگەزی:**

یەکێکە لە نەخۆشییە دەروونییەکان کە لە هەردوو سەرچاوەی زانستی (DSM) و (ICD) ئاماژەی بۆکراوە؛ لە کتێبی (DMS5) بە زاراوەی بێزاری لە ڕەگەز (Gender dysphoria) (٢٠) لە کتێبی (ICD11) بە ناڕێکی ڕەگەزی (Gender incongruence) ناوی هاتووە (١٨). ئەم گرفتە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کێشەیان لە ناسنامەی ڕەگەزیدا هەیە (٨)، بەشێوەیەک کە جیاوازییەکی زۆریان هەیە لە نێوان ئەو ناسنامەی ڕەگەزییەی کە هەیانە لەگەڵ سێکسی بایۆلۆجییان. ئەو کەسانەی کە تووشی ناڕێکی ڕەگەزی بوون، ناڕەزایی خۆیان لە سێکسی بایۆلۆجیان دەرئەبڕن، وەک خواستێک بۆئەوەی جەستەی سێکسی بەرانبەریان هەبێت، یان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە وەک کەسێکی سێکسی دیکە سەیر بکرێن (١٩). بەمانایەکی تر ناتەباییەک لە نێوان ئەو سێکسەی کە هەیەتی لەکاتی لەدایکبوونیدا و ئەوەی خۆی هەستی پێدەکات و لەخۆی دەڕوانێت دروست دەکات (١٧). ئەم حاڵەتە پێویستە ببێتە هۆی بێزارکردنی کەسەکە بەڕادەیەک کە بەدوای چارەسەردا بگەڕێت ئەوکاتە بە نەخۆشی دادەندرێت (١٨).
ئەم جۆرە کەسانە ئارەزوو دەکەن کە هەموو شتێکیان ببێتە ڕەگەزی بەرانبەر نەک تەنها لایەنی تێرکردن و ڕەفتار و ئاڕاستەی سێکسییان گۆڕابێت (١٧، ١٨) واتە بە هاورەگەزخواز هەژمار ناکرێن.
لە بابەتێکی تری جیاوازدا بەوردی باسی نیشانەکان و هۆکارەکانی توشبوون و چارەسەرییەکانی کراوە.

### ٤. ڕێژەی بەربڵاوی هاوڕەگەزخوازی:

زۆربەی ژنان و پیاوان لەڕووی سێکسییەوە لەلایەن ڕەگەزی بەرانبەرەوە سەرنجیان ڕادەکێشرێت واتە جیاڕەگەزخوازن، لە هەمانکاتدا کەسانێک هەن کە تاکەکانی ڕەگەزی خۆیان سەرنجیان ڕادەکێشێت لەڕووی سێکسییەوە واتە هاوڕەگەزخوازن (٢). ناتوانین ڕێژەی وردی بەربڵاوی هاوڕەگەزخوازی دیاری بکەین، لەبەر چەند هۆکارێک (١):

١. دیاردە پەیوەستەکان بە هاڕەگەزخوازیی و دووڕەگەزخوازییەوە (ڕەفتار، ناسنامە، سەرنجڕاکێشان) لەڕووی ڕوودانەوە لە کەسەکاندا جیاوازن. بۆ نمونە خەڵکی کە ناسنامەی جیاڕەگەزخوازیان هەیە، هێشتا ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی دەکەن، یان سەرنجڕکێشانی هاوڕەگەزخوازییان هەیە. لەبەرئەوە هەڵسەنگاندنی دانیشتوان پشتدەبەستێت بەو دیاردەی هەڵسەنگێندراوە.
٢. دیاردە پەیوەستەکان بە هاوڕەگەزخوازیی و دووڕەگەزخوازییەوە بەگوێرەی کات جیاوازە. لەبەرئەوە لەوانەیە ڕێژەی جیاواز دەربچێت بەپشتبەستن بە هەڵسەنگاندنی ڕەفتاری سێکسی لە ئێستادا، یاخود لە ماوەی ڕابردووی ژیانی کەسەکە. بۆ نمونە ڕێژەی ئەو کەسانەی کە لە ژیانیاندا ئەزموونی هاوڕەگەزخوازیان هەبووە زیاترە لە ڕێژەی ئەوانەی لە ساڵی ڕابردوو ئەو ئەزمونەیان هەبووە.
٣. هاوڕەگەزخوازی بە نەنگی دادەندرێت، تەنانەت لە کۆمەڵگە کراوەکانیشدا، لەبەرئەوە لەوانەیە هەندێک کەس ناسنامە و ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی بشارنەوە.
٤. لەبەرئەوەی کە هەندێک دیاردەی هاوڕەگەزخوازی (بەتایبەت ناسنامەی هاوڕەگەزخوازی و سەرنجڕاکێشانی هاوڕەگەزخوازی) دەگمەنن، دەرخستنی ڕێژەی ورد پێویستی بە نمونەیەکی گەورەی دانیشتوان هەیە، ئەمەش گران و قورسە بۆ ئەنجامدانی ئەو ڕاپرسییە.
٥. ناتواندرێت یەک لایەن هەڵبسەنگێندرێت بۆ هەموو شوێن و کاتەکان، بەتایبەت ناسنامەی ڕەگەزی و ڕەفتاری ڕەگەزی کە زۆر نەرمتر و گۆڕاون لەڕووی کلتوورییەوە لە سەرنجڕاکێشانی سێکسی.

بەوهۆیانەوە ڕێژەی جیاواز و جۆراوجۆر هەیە سەبارەت بەو کەسانەی کە هاوڕەگەزخوازن، یەکەم لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێژەی ئەو کەسانەوە لە کۆتایی چلەکانی سەدای ڕابردوو کرا لەلایەن کینسی و هاوڕێکانی کە ڕێژەکەی بە (٥-١٠٪)ی کۆمەڵگەی ئەمریکی داناوە (٢). ڕاپرسییەکی تازە لەناو پێگەیشتووان لە ئەمریکا کە لەسەر

(٣٤٥٥٧) كەس كراوە، دەرکەوتووە کە (٩٦.٦٪)ی بەشداران جیارەگەزخوازن، (١.٦٪) هاورەگەزخوازن، و (٠،٧٪)یان دوورەگەزخوازن. ئەم رێژەیەش هاوتایە بە پێداچوونەوە بە نۆ لێکۆڵینەوەی گەورەی تر کە لە وڵاتانی ئەورووپی کراوە، کە دەرئەنجامەکان دەڵێن رێژەی (٣.٥٪) پێگەیشتوانی ئەمریکا هاورەگەزخواز یان دوورەگەزخوازن (١). وێنەی ژمارە (٢).




**وێنەی (٢) رێژەی بەربڵاوی پێنج گرووپ لە ئاراستەی سێکسی لەناو دانیشتوانی رۆژئاوا**

داتا و زانیارییەکان لەمبارەیەوە کەمن (٢٠)، هەروەها رێژەکان بەگوێرەی شێوازی توێژینەوەکان دەگۆڕێت (٢)، هەندێک سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە بەگشتی (٢-٦٪)ی خەڵکی هاورەگەزخوازن (٢١). سەنتەری ئاماری تەندروستی نەتەوەیی لە ساڵی ٢٠٠٥، بە بەکارهێنانی راپرسی خودپرکردنەوە، ئاماژە بەوەدەکات کە بە نزیکەیی (١.٥٪) ی پیاوان و (٠.٧٪)ی ژنان بە تەواوی هاورەگەزخوازن (٢).

رێژەی هاورەگەزخوازی بەگوێرەی کلتوور و ناوچەکان دەگۆڕێت، لە توێژینەوەیەک کە لە کۆکراوەی (٦٧) توێژینەوەی تایبەت کراوە، سەبارەت بە رەفتاری سێکسی رەگەزی نێر یان پەیوەندی سێکسی نێر لەگەڵ نێر، کە رێژەکەی لە ناوچە جوگرافییەکان جیاوازە. رێژەی ئەنجامدانی سێکسی رەگەزی نێر لەگەڵ نێر بە درێژایی ژیان لە رۆژهەڵاتی ئاسیا (٣-٥٪)، باشوور و باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا (٦-١٢٪)، رۆژهەڵاتی ئەورووپا (٦-١٥٪)، ئەمریکای لاتین (٦-٢٠٪) (٢٠). جیاوازیی هەیە لە نێوان رێژەکە لە وڵاتان سەبارەت بە هاورەگەزخوازی (٢)، خشتەی ژمارە (١).

| ڕێژەی هاوڕەگەزخوازی | وڵاتەکان |
|---|---|
| ٥-٩ | بەریتانیا |
| ٥.٨ | یابان |
| ٧.٨ | هۆڵەندا |
| ٤.٨ | ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا |
| ٢ | فلیپین |
| ٤.٧ | مالیزیا |
| ٣.٦ | تایلەند |

**خشتەی (١) ڕێژەی هاوڕەگەزخوازی لە پیاواندا بەگوێرەی وڵاتان**

### ٥. هاوڕەگەزخوازی نەخۆشییە؟

#### ٥. ١. هاوڕەگەزخوازی لە ڕابردوو و ئێستادا:

هاوڕەگەزخوازی مێژوویەکی درێژی هەیە، مەبەستی ئێمە لەم نوسینەدا باسکردنی دیاردەکەیە لەڕووی زانستییەوە کە چۆن بووە؟ ئەگەرنا لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هەتا ئەمڕۆش لەسەرتاسەری جیهان بە ڕەفتارێکی نەشیاو دادەندرێت و زۆرێک دژایەتی دەکەن (٢، ٣، ٦)، لەڕووی یاساییشەوە لە سەدەی ڕابردوو لە ئەورووپا بە تاوانێکی گەورە دانراوە و هەتا ئەمڕۆش لە چەندین وڵات بە تاوان دادەنرێت (١). هاوڕەگەزخوازن ڕووبەڕووی چەندین جیاکاریی و توندوتیژی دەبنەوە و بوونەتەوە، هەرچەندە لە ئێستادا تێڕوانینەکان کەمێک گۆڕاون، بەڵام هێشتا توندوتیژی بەرانبەریان لە کۆمەڵگەی ئەمریکی باوە (٦).

لە ڕۆژئاوا و لە کتێبە زانستییەکاندا هەتا ساڵی ١٩٧٣، خودی هاوڕەگەزخوازی بە نەخۆشی دەروونی دانراوە (٣، ٢٢). لەسەر ئاستی جیهان دوو سەرچاوەی زانستی هەن بۆ دیاریکردن و دەستنیشانکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان؛ سیستەمی دابەشکاری نێودەوڵەتی بۆ نەخۆشییەکان (ICD)، کە لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە دانراوە، لەگەڵ سیستەمی دەستنیشانکردن و ئامارکردنی نەخۆشییە دەرونییەکان (DSM) کە لەلایەن کۆمەڵەی دەروونپزیشکی ئەمریکی (APA) دەردەکرێت (٢٣).

چاپی یەکەمی (DSM) کە لە ساڵی ١٩٥٢ بڵاوکرایەوە، هاوڕەگەزخوازی بە تێکچونێکی کەسێتیی کۆمەڵایەتی (sociopathic personality disturbance) دانا (٢٢). لەو کاتانەدا ڕێگەنەدەدرا بە کەسانی هاوڕەگەزخواز بۆ کارکردن و خوێندن و بەشداریکردن

لە سوپا، لەوکاتەدا چارەسەرکارانی دەروونی هەوڵی چارەسەری هاوڕەگەزخوازیان دەدا لە ڕێگەی بەکارهێنانی چارەسەری دەروونشیکاری، هۆرمۆن، خەساندن، و تەنانەت نەشتەرگەری مێشک (٣). لە چاپی دووەمیش (DSM)، کە لە ساڵی ١٩٦٨ دەرچوو، بە هەمانشێوە هاوڕەگەزخوازی وەکو نەخۆشییەکی دەروونی و لادانی سێکسی ناساند، لە چاپی سێیەمی (DSM) کە لە ساڵی ١٩٧٣ دەرچوو، هاوڕەگەزخوازی لە نەخۆشییە دەروونییەکان دەرهێندرا، بەڵام بێزاری خودی لە هاوڕەگەزخوازی (Ego-dystonic homosexuality) وەکو گرفتێکی دەروونی لە هەمان کتێب دانرایەوە (٣، ٢٢)، ئەم گرفتەشی پێناسەکرد بە: «هەستکردن بە گوناهـ شەرم، دڵەڕاوکێ خەمۆکی سەبارەت بە هاڕەگەزخوازبوون» (٣). لە ساڵی ١٩٨٧ پاش پێداچوونەوە بە چاپی سێیەم، ئەم گرفتەش لابراو و ناوەکەی گۆڕدرا بە (بێزاری بەردەوام و زۆر سەبارەت بە ئاڕاستەی سێکسی تاک)، ئەم دەستنیشانکردنەش لە چاپی چوارەم مایەوە و لە کۆتاییدا لە ساڵی ٢٠١٣ ئەو حاڵەتەش بەتەواوی لابرا (٢٢).

**لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە هاوڕەگەزخوازان لەبەر چەندین هۆ سەردانی پزیشکانی دەروونی دەکەن و داوای هاوکاری دەکەن**

بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٤٨ هاوڕەگەزخوازی لە چاپی شەشەمی (ICD) وەکو نەخۆشی دانرا، لە چاپی هەشتەم لە ساڵی ١٩٦٥ هاوڕەگەزخوازی پیاوان و ژنان وەکو نەخۆشی دەروونی مانەوە لە بەشی لادانە سێکسییەکان. لە چاپی دەیەم، لە ساڵی ١٩٩٠، بەتەواوی هاوڕەگەزخوازی لە نەخۆشییەکان دەرهێندراو، لەجیاتی بێزاری خودی لە ئاڕاستەی سێکسی (Ego-dystonic sexual orientation) دانرا، بەواتای بێزاربوونی کەسەکە لە هەست و ئارەزووی هاوڕەگەزخوازی، لە کۆتاییدا لە چاپی یانزەیەم لە ساڵی ٢٠١٩ ئەم حاڵەتەشی لابرد (٢٢).

لە ساڵی ٢٠١٥، ١١٨ وڵات هاوڕەگەزخوازیان لە ڕیزبەندی تاوانەکان دەرهێنا. لە (٧٥)

وڵات لە ئاسیا و ئەفریقا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەشێوەیەکی یاسایی قەدەغەیە، ١١ وڵاتیان سزای لە سێدارەدانی هێشتۆتەوە بۆ ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی (١). سەرەڕای جیاوازی لە ڕێگەی سیاسەتکردن، چەندین لێکچوونی هاوشێوە هەیە لە زۆربەی نەتەوەکانی ئەمڕۆدا، هەموویان مێژووی دژە هاوڕەگەزخوازیان هەبووە (١). لە ئێستادا هاوڕەگەزخوازی لەلایەن کۆمەڵەی دەروونپزیشکی ئەمریکییەوە (APA) بە جۆرێکی ئاسایی ئاڕاستەی سێکسی مرۆڤ دادەندرێت، خودی خۆی نەخۆشی دەروونی نییە (٥). هەروەها لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە بە نەخۆشی دانانرێت (٢٢).

٥. ٢. بێزاری خودی لە هاوڕەگەزخوازی:

لە زانستی دەروونپزیشکیدا ئەگەر ڕەفتارێک لە تاکدا ڕوویدات و کەسەکە بەهۆی ئەو ڕەفتارەوە هەست بە بێزاری بکات یان کاربکاتە سەر ژیانی کەسەکە، بەواتایەکی تر ئەگەر کەسەکە خۆی ئارەزووی لەو ڕەفتارە نەبوو و بەهۆیەوە هەستی بە ناڕەحەتی کرد، بە نەخۆشی دادەنرێت (١٧، ١٨). ئایا ئەگەر کەسێک بەهۆی بوونی سەرنجڕاکێشانی هاوڕەگەزخوازییەوە هەستی بە نیگەرانی کرد و بەهیچ شێوەیەک ئەو هەستەی پەسەند نەبێت دەبێت چی بکات؟ ئایا نەخۆشییە؟ لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتوە کە هاورەگەزخوازان لەبەر چەندین هۆ سەردانی پزیشکانی دەروونی دەکەن و داوای هاوکاری دەکەن، لە ٢٦ کەسی هاوڕەگەزخواز ٦ کەسییان (٢٣٪)، بەهۆی هاوڕەگەزخوازییەکەیانەوە هەست بە بێزارییەکی ناوەکی دەکەن (٢٤). لە لێکۆڵینەوەیەک لە ساڵی ٢٠٠٩ دەرکەوتووە کە یەک چارەسەرکاری دەروونی لە شەش چارەسەرکار لە ماوەی کاری پیشەییدا یارمەتی چارەخوازێکی داوە کە ویستیوویەتی هەستی هاوڕەگەزخوازی بگۆڕێت (٢٥).

ئەم گرفتە هەتا ئێستا لە وڵاتی چین بە نەخۆشی دادەنرێت، لە چاپی سێیەمی دابەشکردن و دەستنیشانکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان (Chinese Classification and Diagnostic Criteria of Mental Disorders) کە لە ساڵی ٢٠٠١ دەرچووە، وەکو نەخۆشییەک ئاماژەی بۆ کراوە (٢٦). لە توێژینەوەیەک لە وڵاتی چین کراوە سەبارەت بە پەسەندکردنی هاوڕەگەزخوازی، زۆربەی بەشداران بەڕێژەی زیاتر لە (٧٨٪)ی بەشداران بڕوایان وایە کە «هەمیشە هاوڕەگەزخوازی ڕەفتارێکی هەڵەیە» (٢٧).

ئەم بابەتە (ئەگەر کەسێک بێزار بێت لە ئاڕاستەی سێکسی خۆی) پێویستی بە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی زیاتر هەیە و بابەتێکی مشتومڕاوییە، هەتا ئێستا وەڵامێکی زانستی نییە و پزیشکان لەسەر بنەمای تێگەیشتنی خۆیان چارەسەری ئەم لایەنە دەکەن، بەڵام کۆمەڵەی دەروونپزیشکی ئەمریکی بەتەواوی هەموو هەوڵێکی بۆ دژایەتیکردنی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسییە (٥). لە بەشەکانی داهاتوو باسی هەوڵەکانی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی کراوە.

### ٥. ٣. ڕێژەی نەخۆشییە دەروونییەکان زیاترە:

ڕاستە کە هاوڕەگەزخوازی نەخۆشی نییە، بەڵام ڕێژەی نەخۆشییە دەروونییەکان و جەستەییەکان لەناو کەسانی هاوڕەگەزخوازدا زیاترە لە کەسانی تر، ئەمەش چەند نمونەیەک (٣):

دەروونددروستی؛ لە توێژینەوەیەک لە ساڵی ٢٠٠٨ کراوە، دەرکەوتووە کە ڕێژەی بیرۆکەی خۆکوژی، خەمۆکی و دڵەڕاوکێ لەناو کەسانی هاوڕەگەزخوازدا زیاترە لە کەسانی جیاڕەگەزخواز. لە توێژینەوەیەکی تردا دەرکەوتووە کە هەوڵی خۆکوژی لەناو کەسانی هاوڕەگەزخواز دوو هێندەی کەسانی جیاڕەگەزخوازە (٣١٪) لە هاوڕەگەزخوازان و (١٤٪) لە جیاڕەگەزخوازان.

ماددەی هۆشبەر؛ گرووپەکانی هاوڕەگەزخوازی ڕێژەیەکی زیاتر مەی، جگەرە و ماددەی هۆشبەر بەکاردەهێنن. ڕاپرسییەک نیشانی دەدات کە (٧٢٪)ی هاوڕەگەزخوازان تووشی بەکارهێنانی مەی بوون بە بەراورد بە (٦١٪)ی کەسانی ئاسایی.

شێرپەنجە؛ هەندێک شێرپەنجە لەناویاندا زیاترە لە کەسانی ئاسایی، بۆ نمونە شێرپەنجەی ملی مڵداندان لە ژنان، تێکچوونی کۆم و شێرپەنجەی کۆم ..

نەخۆشییەکانی هەوکردن؛ لە ساڵی ٢٠١٤ ڕێژەی (٣٧٪)ی ئەو کەسانەی کە تووشی گۆنۆرۆیا بوون لە گرووپی هاوڕەگەزخوازان بوون، ئەو پیاوانەی سێکس لەگەڵ پیاوان دەکەن یەک لە چوار کەسی توشبوو بە سیفلس پێکدەهێنن، هەروەها لە ساڵی ٢٠١٧ ڕێژەی توشبوون بە ئایدز لەناو پیاوان کە سێکس لەگەڵ پیاو دەکەن (٦٦٪) بووە.

توندوتیژی؛ ڕێژەی توندوتیژی بەرانبەر بە گرووپی هاوڕەگەزخوازان زیاترە لە کەسانی گشتی.

### ٦. هۆکارەکانی توشبوون:

هۆکاری توشبوونی کەسێک بە هاوڕەگەزخوازی زۆر و هەمەلایەنە و لەڕووی هۆکارزانییەوە ئاڵۆز و ناڕوونە (٢). لە دەرئەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکان نەتوانراوە هۆکارێکی ورد و ڕاست دیاری بکرێت کە بۆچی کەسێک دەبێتە هاوڕەگەزخواز؟ (٤) لە ڕابردوو بڕوا وابوو کە هۆکاری سەرەکی پەیوەندی بە ژینگەی کۆمەڵایەتی تاکەوە هەیە واتە بەتەواوی وەرگیراوە لە ژینگەوە (٧)، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا توێژینەوەکان بە ئاراستەی دۆزینەوەی هۆکارە بایۆلۆجییەکانی وەکو بۆماوە و هۆرمۆنەکانەوەن (١،٢).

پرسیاری دووبارە لەوبارەوە بریتییە لە «ئایا خەڵکی خۆیان هەڵیدەبژێرن کە هاوڕەگەزخواز یان جیاڕەگەزخوازن؟»، ئەمە پرسیارێکی خراپە، لەبەرئەوەی بەلای

کەمەوە «هەڵبژاردن» دوو مانای جیاوازی ناتەبای هەیە؛ هەڵبژاردن وەکو کردارێکی توشنەبوون، واتە کەسەکە لە دەستی خۆیدا نەبێت یان هەڵبژاردن وەکو بڕیاردان بۆ ئەنجامدانی ڕەفتارەکە، ئەم دووانەش دژ و پێچەوانەی یەکن (١). گفتوگۆیەکی درێژ و بەردەوامە کە ئایا ژینگە یان بۆماوە هۆکارە بۆ توشبوون بە هاوڕەگەزخوازی (٤). هەتا ئەمڕۆ بیردۆزێکی دیاریکراوی تەواو نییە سەبارەت بە هۆکاری دیاریکردنی ئاڕاستەی سێکسی (١)، بەڵام دەتوانین بڵێین ئەم هۆکارانەی خوارەوە ڕۆڵیان هەیە:

**٦. ١. هۆکارە بایۆلۆجییەکان:**

بەشێک لە توێژینەوەکان پێشنیازی کاریگەری هۆرمۆنەکان و بۆهێڵەکان (gene) دەکەن بەڕێژەیەکی گەورە لە قۆناغی کۆرپەلەیی و سەرەتای شیرەخۆری، کە کاریگەری لەسەر کۆرپە دروست دەکەن بۆ توشبوون بە هاوڕەگەزخوازی (٢). لێرەدا لە سێ خاڵدا گفتوگۆی ئەو لایەنانە دەکەین:

**٦. ١. ١. ئاستی هۆرمۆنەکانی نێرینە و مێینە هیچ ڕۆڵیان نییە:**

لە ڕابردوو باوەڕ وابوو کە ئەو کەسانەی کە هاوڕەگەزخوازن ئاستی هۆرمۆنەکانی جەستەیان جیاوازە لەگەڵ کەسانی ئاسایی کە ئاڕاستەی سێکسیان بۆ ڕەگەزی بەرانبەرە، تەنانەت چارەسەری هۆرمۆنیش بەکارهاتووە، بۆ نمونە بڕوا وابووە کە کەمی هۆرمۆنی نێرینە (Testosterone) دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەسێک ئاڕاستەی سێکسی بۆ ڕەگەزەکەی خۆی بێت! (٢)

ئەم باوەڕە لە ئێستادا بەتەواوی ڕەدکراوەیە، چونکە ئاستی ئەو هۆرمۆنانە پەیوەندی نییە بە ئاڕاستەی سێکسی تاکەوە، بەڵکو پەیوەستە بە ئارەزووی سێکسییەوە، ئەمەش لە چەندین توێژینەوەدا دەرکەوتووە کە زۆربوونی هۆرمۆنی نێرینە نابێتە هۆی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی، بەڵکو تەنها ئارەزووی سێکسی کەسەکان زیاد دەکات (١). سەرجەم توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە زیادکردنی هۆرمۆنی نێرینە لەو کەسانەی کە ئاستی هۆرمۆنەکانیان کەمە دەبێتە هۆی زۆربوونی چالاکی و خەیاڵاتی سێکسی. بەپێچەوانەوە پێدانی ئەم هۆرمۆنە کاریگەری نییە لەسەر ئەو کەسانەی کە ئاستی هۆرمۆنەکەیان ئاساییە. هۆرمۆنی نێرینە تەنها کاریگەری هەیە لەسەر چالاکبوونی پاڵنەری سێکسی (٢).

لە کۆمەڵگەی کوردیدا ئەم باوەڕە زۆر باوە و زۆرجار کەسانی هاوڕەگەزخواز داوای پشکنینی هۆرمۆنی دەکەن، هێشتا پزیشک هەیە کە ئەم پشکنینانە بۆ ئەو مەبەستە دەکات کە هیچ ڕۆڵێکی نییە لە ئاڕاستەی سێکسی تاکدا.

٦. ١. ٢. کاریگەری هۆرمۆنەکان لە قۆناغی کۆرپەلەیی:

زانای بواری هۆرمۆنزانی (endocrinologist)، گونتەر دۆرنەر (Günter Dörner)،

بیردۆزێکی دانا کە پێیوایە هاوڕەگەزخوازی بەهۆی مۆرکردنی هۆرمۆنی کۆرپەلەییەوەیە (hormonal embryonic imprinting)، بەگوێرەی ئەم بیردۆزە منداڵانی کۆرپەلەی ناوسکی دایک کە لە گەورەییدا دەبنە هاوڕەگەزخواز، لەناو سکی دایکیاندا بەشێوەیەکی نائاسایی ڕەگەزی سێکسیان جیادەبێتەوە، بۆ نمونە بەهۆی بەرکەوتنی نائاسایی کەمی هۆرمۆنی نێرینە لە کوڕان یان بەرکەوتنی ئاستی بەرزی هۆرمۆنی نێرینە لە کچاندا، یاخود بەهۆی گۆڕانی وەڵامدانەوەی مێشک بۆ ئەو هۆرمۆنانەوەیە (٢). ئەم بیردۆزە لە ئێستادا کاری زۆری لەسەر دەکرێت و وەکو هۆکارێکی توشبوون سەیری دەکرێت (١)، ئەم مۆدێلە لەلایەنی تیۆرییەوە باسی بابەتەکەی کردووە و لەگەڵ توێژینەوەکان لەسەر ئاژەڵان دەگونجێت (٢). زۆر قورسە بتوانرێت ئەم بیرۆزە لەسەر مرۆڤ تاقیبکرێتەوە بەهۆی مەترسی لەسەر پێوانی هۆرۆنەکان لەناو سکی دایکدا! (١)، لێکدانەوەی هۆرمۆنی هەرگیز نابێتە وەڵامی کۆتایی، چونکە هەمیشە دەبێتە هۆی دروستبوونی پرسیاری دواتر، چی دەبێتە هۆی ئەوەی کە هۆرمۆنەکان بە ڕێژەیەکی نائاسایی لە سکی دایکدا دەربدرێن؟ ئایا شتێکی هەرەمەکییە یان بەهۆی کۆنترۆڵی بۆهێڵەکانەوەیە؟ (٢)

٦. ١. ٣. کاریگەری بۆماوە:

بەگشتی توێژینەوەکان ئاماژە بە ڕۆڵی بۆماوە دەکەن لە دروستبوونی ئاڕاستەی سێکسی لە ڕەگەزی نێردا (٢١، ٢٨). لێکۆڵینەوەکان لەسەر دووانەکان و بۆهێڵەکانی هاوڕەگەزخوازان چەند دەرئەنجامێکیان داوە؛

بەگشتی توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ڕێژەی بۆماوەیی ئاڕاستەی سێکسی (٥٠-٦٠٪) دەبێت لەناو پیاواندا لەناو کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی (٢). لە توێژینەوەی تردا ڕێژەی بۆماوەیی هاوڕەگەزخوازی (٥٢٪) دەبێت (٢١).

لە توێژینەوەکانیدا زانا هەرپەر بانگەشەی دۆزینەوەی بۆهێڵێکی تایبەتی بە هاوڕەگەزخوازی کرد، ئاماژەی بەوەدا کە بۆهێڵی (Xq28) بەرپرسە لەم ڕەفتارە و هاوڕەگەزخوازی بەتەواوی بۆماوەییە (١). ئەم بابەتە جێگەی مشتومڕێکی زۆر بوو کە نەتوانرا ئەنجامەکان دووبارە بکرێنەوە (٢١)، بەڵکو توێژینەوەکان سەرکەوتوونەبوون لە دۆزینەوەی بۆهێڵی هاوڕەگەزخوازی، لە توێژینەوەکانی دواتردا نەتوانرا ئەوە بسەلمێندرێت و توێژینەوەی تر ئاماژەیان بە چەندین بۆهێڵی تر کرد (وەکو بۆهێڵەکانی «7q36» و «8q12» لە باوکان و بۆهێڵی «10q26» لە دایکاندا) کە کاریگەرییان هەیە لەسەر هاوڕەگەزخوازی، بەبێ ئەوەی کە هیچ کامێکیان بەتەواوی بتوانێت بیسەلمێنێت کە هۆکاری سەرەکی توشبوون بە هاوڕەگەزخوازییە (١، ٢). دەزانین کە بۆهێڵی تایبەت نییە بە هاوڕەگەزخوازی یان جیاڕەگەزخوازی لە ژنان و پیاواندا، بەڵکو تۆڕێک لە

بۆهێڵەکان ڕۆڵیان هەیە لە دیاریکردنی ئاڕاستەتی سێکسی (٢، ٢١، ٢٨).
هێشتا ئەم توێژینەوانە کێشەی هەڵەکردنیان هەیە لەڕووی کۆکردنەوەی زانیارییەکان و بەراوردکردنی دووانە وێکچووەکان لە ژینگە جیاوازەکان، لەبەرئەوە ناتوانرێت بەتەواوی پەسەند بکرێن (٢). هەروەها ئەو ڕێژەی بۆماییەی دۆزراوەتەوە بەس نییە هەتا بڕیار بدەین کە ڕەفتارێک بەتەواوی لە ڕێگەی بۆماوەوەیە، بەڵکو پێشنیازێکی بەهێزە بۆ ڕۆڵی ژینگە لە هاندانی ئاڕاستەی سێکسیی (٢١). لەڕووی بیردۆزی پەرەسەندنەوە بڕوانینە بابەتەکە کە کەسانی هاوڕەگەزخواز زیاد ناکەن لەناو کۆمەڵگە و ناتوانن نەوەیان هەبێت ئەوە دەبوو بۆهێڵەکانی بەرپرس لە هاوڕەگەزخوازی نەمانایە بەدرێژایی مێژوو! بەڵام بەهۆکاری تایبەتی هاوڕەگەزخوازەکان ئاڕاستەی سێکسیان دەگۆڕن، و بەوهۆیەوە زیاد دەکەن، بۆ نمونە بەهۆی فشارەکانی کۆمەڵگەوە هاوسەرگیری دەکەن. سەلماوە کە هاوڕەگەزخوازەکان کەمتر لە کەسانی ئاسایی نەوە دەخەنەوە، چۆن ئەم ڕێژە کەمەی نەوە خستنەوە بۆتە هۆی مانەوەی بۆهێڵێک یان زیاتر (٢).
٦. ٢. هۆکارە ژینگەییەکان:
بە پیاچوونەوە بە لێکۆڵینەوە لە دووانەکاندا، دەرکەوتووە کە ژینگە کاریگەری هەیە لەسەر ئاڕاستەی سێکسی (١). هۆکارە ژینگەییەکان هەمەلایەنن و لێرەدا ئاماژە بە چەند هۆکارێک دەکەین:
**٦. ٢. ١. خراپی پەیوەندی نێوان دایباب و منداڵ؛**
فرۆید و بیردۆزی دەروونشیکاری هاوڕەگەزخوازی دەگێڕنەوە بۆ هۆکاری مامەڵەی دایباب بەرانبەر بە منداڵەکانیان (٢). بەگشتی توێژەرانی بواری دەروونشیکاری لۆمەی تێکشکانی پەیوەندی نێوان منداڵ و دایبابی دەکەن بۆ توشبوونی منداڵ بە هاوڕەگەزخوازی (١). ئەم بیردۆزە دەڵێت؛ «پەیوەندی نێوان منداڵ و دایباب ئاڕاستەی سێکسی مرۆڤ دیاری دەکات لە گەورەییدا». بۆ نمونە دایکی زاڵ و خاوەن دەسەڵات، هەروەها باوکی ئامادەنەبوو و دوور لە منداڵەوە، دەبێتە هۆی دروستبوونی کوڕێک کە ئاڕاستەی هاوڕەگەزخوازی هەیە، ئەمەش لە ڕێگەی تێکچوونی قۆناغی ئۆدیپەڵی (Oedipal phase) گەشەی سێسکی دەروونییەوە ڕوودەدات! (٢)
**٦. ٢. ٢. قوتابخانەی ڕەفتاری و فێربوون:**
ئەم قوتابخانە گرنگی زۆر دەدات بە کاریگەری فێربوون لەسەر گەشەکردنی ڕەفتاری مرۆڤ، بیردۆزەکانی فێربوون پێشنیازی ئەوە دەکەن کە ئاڕاستەی سێکسی دەتوانرێت لە ئەنجامی فێربوونی نائاگا یان ئاگاوە بێت کە لەلایەن دایباب، مامۆستا و تەنانەت کۆمەڵگەوە ئەنجامدەدرێت (٢). لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە پەیوەندی بەهێز

هەیە لە نێوان ئاڕاستەی سێکسی و ڕیزبەندی لەدایکبوون و ئەو تاکانەی کە خوشک و برای هاوڕەگەزخوازیان هەیە (٤). ڕەخنەش لەم تێڕوانینە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی هیچ دایبابێک نایەوێت کە منداڵەکەی هاوڕەگەزخواز بێت، لەبەرئەوە دەبێت فێربوون لەوانەوە بێت و ئەوانیش ئارەزووی ناکەن کەواتە چۆن گوازرایەوە، هەروەها چەند توێژینەوەیەک هەیە ئاماژە بەوەدەکات کە ئەو دایبابانەی کە هاوڕەگەزخوازن منداڵەکانیان کە پەروەردەیان کردوون هاوڕەگەزخواز نابن (٢). ئەم تێڕوانینە پێیوایە کە دایبابی هاوڕەگەزخواز منداڵی هاوڕەگەزخوازی زیاتریان هەیە بەهۆی هاندانە کۆمەڵایەتییەکانەوە (١).

٦. ٢. ٣. کاریگەری برا گەورەکان (THE OLDER BROTHERS EFFECT)؛

بوونی برای گەورەی زیاتر دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەگەری هاوڕەگەزخوازی لە منداڵە کوڕەکاندا، ئەمەش لە چەندین توێژینەوەدا دەرکەوتووە، بەڵام ئەنجامەکان تەنها بۆ هاوڕەگەزخوازی لە پیاواندایە و کچان ناگرێتەوە (١). بەڵگەکان سەبارەت بە پەیوەندی هاوڕەگەزخوازی تاک بە ژمارەی برا گەورەکان کە لە یەک دایکەوەن هەیە (٢)، میکانیزمەکەش بەشێوەیەکی تەواوی نازانرێت کە ئایا بەهۆی چییەوەیە، دەگونجێت لەلایەنێکەوە پەیوەندی هەبێت بە کاریگەری پەروەردە و ژینگەوە (١) یاخود بەهۆی بەشداری بۆماوەوە بێت (٢). توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە پیاوێک کە برای گەورەی نەبێت ئەگەری بوون بە هاوڕەگەزخوازی (٢٪)، ئەگەر یەک برای گەورەی هەبێت دەبێتە (٢.٦٪)، ئەگەر دوو برای گەورەتری هەبێت (٣.٥٪)، سێ برای گەورەتر (٤.٦٪) چوار برای گەورەتر (٦٪) ئەگەری هەیە! (١)

**٦. ٢. ٤. دەستدرێژی کردنە سەر منداڵ:**

دەستدرێژیکردنە سەر منداڵ لەلایەن کەسانی گەورە و کامڵەوە بە هۆکارێکی تر دادەنرێت، لە توێژینەوەیەکدا لە ساڵی ٢٠١٢ دەرکەوتووە کە کەسانی هاوڕەگەزخواز و دووڕەگەزخواز لە هەردوو سێکسەکە زیاتر لە کەسانی جیاڕەگەزخواز ئەزموونی دەستدرێژی سێکسییان هەبووە لە منداڵیدا (١). توێژینەوەیەکیش لە فلیپین ئاماژە بە کاریگەری زەبری دەروونی لە قۆناغی منداڵیدا لەسەر توشبوون بە هاوڕەگەزخوازی دەکات (٤).

**٦. ٣. کامیان:**

بوونی پەیوەندی لە نێوان دوو شتدا مانای ئەوە نییە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان هەیە بەیەکەوە لەڕووی هۆکارزانییەوە، بۆ نموونە ئەگەر ئێمە بۆمان دەرکەوت کە ڕەفتارێکی تایبەتی وەکو ژمارەی خەیاڵی سێکسی پەیوەندی هەیە لەگەڵ

ئاستی هۆرمۆنی نێرینە لە خوێندا، ئەوە دەگونجێت کە هۆرمۆنی نێرینە هانی ڕەفتارەکەی دابێت، یان ڕەفتارەکە بووبێتە هۆی ڕژانی هۆرمۆنی نێرینە، یان هەردوو لایەنەکە لەلایەن هۆکاری سێیەمەوە هانبدرێن یان ڕێگریان لێ بکرێت، بۆ نمونە ئاستی تەنگژەی دەروونی یان هێوربوونەوەی تاک (٢). ئەم تێڕوانینە بۆ هۆکارە بایۆلۆجییەکانی توشبوون بە هاوڕەگەزخوازیش ڕاستە، هاوڕەگەزخوازی بەهۆی یەکێک لە هۆکارەکانەوە ڕوونادات، بەڵکو بەهۆی پێکەوەبەسترانی هۆکارە بۆماوەیی، هۆرمۆنی و ژینگەییەکانەوەیە (٧). واتە ناتوانرێت هۆکارێکی دیاریکراو دابنرێت (٦)، سەرەڕای کاریگەری بۆماوە و هۆرمۆنەکان لە قۆناغی منداڵی (١)، ناتوانین نکۆڵی کاریگەریی و گرنگی هۆکارە کلتووری، پەروەردەیی و ژینگەییەکان بکەین (٢).

بەهۆی کەمی ڕێژەی بۆماوەیی ناتوانین بڕیار بدەین کە هاوڕەگەزخوازی بەتەواوی لە ڕێگەی بۆماوەوەیە، بەڵکو پێشنیازێکی بەهێزە بۆ ڕۆڵی ژینگە لە هاندانی ئاڕاستەی سێکسیی (٢١). بەهێزترین جۆری لێکۆڵینەوە لەسەر دووانەکان بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە دووانەی وێکچوو (Identical Twins) کە لە ژینگەی جیاوازدا گەورە دەکرێن، لەمکاتەدا هەر لێکچونێک هەبێت لە نێوان دوو کەسەکەدا ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ بۆماوە، بەڵام بەداخەوە جیاکردنەوەی دووانەی وێکچوو لەسەرەتای ژیانەوە دەگمەنە و لەناو کەسانی هاوڕەگەزخوازدا دەگمەنترە، لەبەرئەوە ئەم جۆرە لە توێژینەوانە نین (١).

## ٧. گۆڕان لە ئاڕاستەی سێکسی:

### ٧. ١. گۆڕانی ئاڕاستەی سێکسی بەگوێرەی کات:

چەند توێژینەوەیەک ئاماژە بە گۆڕانی ئاڕاستەی سێکسی تاک دەکەن لە مرۆڤدا لە ماوەی ژیانیاندا؛ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر (١٥٦) کەس کە هاوڕەگەزخوازی ژن و پیاو بوون لەگەڵ ئەو کەسانەی دووڕەگەزخوازن (bisexual) کرا، سەبارەت بە گۆڕانی ناسنامەی سێکسی بەگوێرەی کات. (٥٧٪)ی هاوڕەگەزخوازان بەشێوەیەکی جێگیر(consistently) هاوڕەگەزخواز ماونەتەوە، (١٨٪)یان لە هاوڕەگەزخوازییەوە گۆڕان بۆ دووڕەگەزخواز، هەروەها (١٥٪)یان بەشێوەیەکی جێگیر دووڕەگەزخواز مانەوە (٢٩). هەروەها لە توێژینەوەکەدا ئاماژە بەوە دەکات کە چەندین کەس ئاڕاستەیان گۆڕاوە بۆ جیاڕەگەزخوازی! بۆ نمونە ٤٪ی بەشداران پاش شەش مانگ لە بەدواداچوون بوونە جیاڕەگەزخواز (٢٩).

بەگشتی ئاڕاستەی سێکسی جێگیرە، تەنها ڕێژەیەکی کەم لە کەسەکان ئاڕاستەی سێکسیان دەگۆڕێت بەگوێرەی کات (٢). گۆڕانکاری لە ناسنامەی سێکسیدا بەربڵاوە (١)،

توێژینەوەکان ئاماژە بە جێگیری و گۆڕانکاری لە سەرنجڕاکێشان و ناسینەوەی سێکسی دەکەن بەگوێرەی کات، لە توێژینەوەیەکی تردا کە لەلایەن ستۆک و هاوڕێکانییەوە کراوە لەسەر (٢١٦) پیاوی دووڕەگەزخواز (تەمەن ١٨-٣٠ ساڵی)، دەرکەوتووە کە لە ماوەی یەک ساڵی بەدواداچووندا ٤٩٪ گۆڕانکاری لە ئاڕاستەی سێسکیاندا ڕوویداوە، ٣٤٪ زیاتر بەرەو ئاڕاستەی هاوڕەگەزخوازی چوون، هەروەها ١٧٪ بەرەو ئاڕاستەی جیاڕەگەزخوازی (heterosexually) چوون (٢١).
ئافرەتان لە پیاوان زیاتر لەڕووی سێکسییەوە شلن (Sexual fluidity)، بەواتای گۆڕینی ئارەزووی سێکسیان بۆ ژن یان پیاو بەهۆکاری تایبەتی(١). لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخستووە کە ژنانی ئاڕاستە دوولایەن و ئەوانەی کە ئارەزووی تەواویان لە هاوڕەگەزخوازی نییە (nonexclusive preference for one sex) ئاڕاستەی سێکسیان زیاتر دەگۆڕێت لەو کەسانەی کە بەتەواوی هاوڕەگەزخوازن (٢).
٧. ٢. هەوڵەکانی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی (change efforts sexual orientation)
هەوڵەکانی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی؛ جێگەی مشتومڕن بەهۆی گرژی لە نێوان بەهاکان کە لەسەر بنەمای باوەڕی ئاینی هەیە لەلایەک و، ئەوانەش کە لەلایەن ڕێکخراوەکانی مافی هاوڕەگەزخوازان و پسپۆڕان و ڕێکخراوە زانستییەکانەوە هەیە لەلایەکی تر. هەندێک تاک و گرووپ ڕەواج دەدەنە ئەو باوەڕەی کە هاوڕەگەزخوازی نیشانەیەکە بۆ تێکچوون لە گەشە یان فەشەلهێنانی ڕەوشتی و رووحی، هەروەها باسی هەوڵەکانی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی دەکەن کە بریتییە لە چارەسەری دەروونی و هەوڵە ئاینییەکان کە دەتوانن هەست و ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی بگۆڕن (٥). گۆڕانکاری لە هاورەگەزخوازی لەلایەن پزیشکانی دەروونی و دەروونناسانەوە لە ڕابردوو ئەنجامدراوە لەسەر شێوازی چارەسەری گۆڕین (conversion therapy)، چونکە لە ڕابردوو هاوڕەگەزخوازی بە نەخۆشی دادەنرا (١).
لێکۆڵینەوەی تەواو لەبەردەست نییە هەتا بیسەلمێنێت ئایا شێوازە تازەکانی گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی کاردەکەن بۆ گۆڕینی ئاڕاستەی سێکسی تاک یاخود نا، لێکۆڵینەوە کۆنەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئاڕاستەی سێکسی ناتوانرێت بگۆڕێت بەو هەوڵانەی کە بۆی دانراوە، هەندێک لە تاکەکان فێردەبن کە سەرنجڕاکێشانەکانیان سنوردار بکەن یان لەیادی بکەن (٥).
بەڵام هەوڵەکان بۆ گۆڕانکاری لە هاوڕەگەزخوازیدا زیاتر لەلایەن گرووپە ئاینییەکانەوە دەکرێت (١). توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە دەبێت پزیشکانی منداڵان بە ئاگابن لە دەرخستنی هاوڕەگەزخوازی نەوجەوانان (coming out)، کە دەبێتە هۆی پەسەندنەکردنی

خێزانی توند. لە زۆرێک لە خێزانەکاندا دەبێتە هۆی دروستبوونی توندوتیژی جەستەیی و دەروونی یان تەنانەت تەقینەوە (٧). هەرچەندە (APA) هۆشداریداوە لەبارەی هەوڵەکانی گۆڕینی ئاراستەی سێکسی، بەڵام (APA) هانی پسپۆڕانی دەروونذروستی دەدات بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ئاڕاستەی سێکسیان بگۆڕن بە بەکارهێنانی ئەرێنییانەی پێکهاتە فرەلایەنە کلتوورییەکان و شێوازی بە سەنتەرکردنی چارەخواز، کە دەبێتە هۆی ناسینەوەی کاریگەری نەرێنی نەنگی کۆمەڵایەتی. هەروەها هاوسەنگی دروستکردن لە بنەما ڕەوشتییەکانی سودمەندبوون و زیاننەگەیاندن، دادوەریی و ڕێزگرتنی ماف و شکۆی تاکەکان (٥).

## ٨. دەرئەنجام و پێشنیازەکان:

### ٨. ١. دەرئەنجام:

گۆڕانکاری لە تێگەیشتن لە هاوڕەگەزخوازی بەهۆی کاریگەری سیاسەت و کۆمەڵگە و ئاینەوە بەردەوامە، دەگونجێت لە داهاتوو لەڕووی زانستییەوە بەڵگەی پێویست بەردەست بن سەبارەت بە هۆکارەکان و چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵی. لە مێژووی ڕابردوو هاوڕەگەزخوازی وەکو نەخۆشییەکی دەروونی دانراوە و قۆناغ بە قۆناغ لە چوارچێوەی نەخۆشی دەرهێنراوە و تەنانەت هەوڵەکان بۆ لابردنی هەر لەکە و نەنگییەک لەسەر هاوڕەگەزخوازی بەردەوامن و هەڵدەدرێت لە ڕوانگەی زانستییەوە بابەتەکە شیکار بکرێت کە هۆکارەکانی بایۆلۆجین و لە دەسەڵاتی تاکدا نییە کە تووشی ببێت. ئەمەش لەپێناو کەمکردنەوەی مامەڵەی توندوتیژانە و جیاکاری تاکەکان بەهۆی ئاڕاستەی سێکسییانەوە. لەڕووی زانستییەوە هیچ بەڵگەیەک نییە کە ئەم ڕەفتارەی مرۆڤ لە ڕێگەی بۆماوەییەوە بگوازرێتەوە، بەڵکو هەموو هۆکارە ژینگەیی و بایۆلۆجییەکان بەیەکەوە کارلێک دەکەن و دەبنە هۆی توشبوونی تاک بە هاوڕەگەزخوازی. ناتوانین خودی هەست و سەرنجڕاکێشان و ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی بە نەخۆشییەکی دەروونی دابنێین، چونکە تایبەتمەندییەکانی نەخۆشی دەروونی تێدا نییە، بەڵام هاوڕەگەزخوازان بەهۆی نەگونجانی ئاڕاستەی سێکسیانەوە لەگەڵ زۆرینەی کۆمەڵگە، پەسەندنەکردنی لەڕووی ئایینی و کلتوورییەوە تووشی چەندین گرفتی دەروونی و کۆمەڵایەتی دەبنەوە کە پێویستیان بە هاوکاری و پشتیوانی زیاتر هەیە.

هەروەها دەبێت جیاوازی بکەین لە نێوان هاوڕەگەزخوازان و ئەوکەسانەی کە تووشی تێکچوونی ئەندامی زاوزێ یان نارێکی ڕەگەزی بوون، ئەوان هۆکاری گۆڕانی ئاڕاستەی سێکسیان بریتییە لە هۆکارێکی دیاریکراو و ناچنە چوارچێوەی هاوڕەگەزخوازییەوە! لەڕووی زانستییەوە پێویستمان بە لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی زیاتر هەیە هەتا بتوانین

باشتر و ڕاستتر لە دیاردەکە تێبگەین و سەرجەم لایەنەکانی هۆکاری توشبوون و شێوازی مامەڵە لەگەڵیان بەدەستبهێنین، ئەم هەوڵانەش دەبێت دووربن لە پشتیوانی و ئاڕاستەی سیاسیی و ئایینی هەتا بێلایەنانە ئەنجامەکان بەدەستبێن.
لە کوردستان و جیهاندا دوو ئاڕاستە هەیە؛ ئاڕاستەیەک کە زیاتر لەلایەن میدیاکان و ڕێکخراوەکانی پاڵپشتی و هاندانی هاوڕەگەزخوازانەوەیە، کە دەیانەوێت مافەکانی تاکەکان کە هاوڕەگەزخوازن لە کۆمەڵگەدا بەدەستبهێنن، لەلایەکی ترەوە ئاڕاستەیەکی کلتووریی و کۆمەڵایەتی و ئایینی بەهێز دژایەتی هەموو کارەکان و ڕۆڵەکان بەو ئاڕاستەیە دەکات، ئەمەش وادەکات تێگەیشتن لە هاوڕەگەزخوازی لەجیاتی لێکدانەوەی زانستی بۆ بکرێت لەڕووی ئایدۆلۆژیی و سیاسییەوە دەکرێت. لەم نێوانەشدا کەسانێک کە هاوڕەگەزخوازن دەبنە قوربانی!

### ٨. ٢. پێشنیازەکان:

لە کۆتاییدا بەپێویستی دەزانین ئەم چەند پێشنیازە بخەینە بەردەم سەرجەم لایەنەکان:
١. کۆمەڵگە؛ پێویستە کە تاکەکانی کۆمەڵگە هەوڵبدەن لە جیاتی بینینی کەسانی هاوڕەگەزخواز بە تاوانبار و لادەری سێکسی، یارمەتییان بدەن هەتا بتوانن خۆیان لەگەڵ ئەو ڕەوشتەدا بگونجێنن، بەشێوەیەک کە بگەنە داخوازییە کۆمەڵایەتی و ئاینییەکانیان کە پێوەی پەیوەستن. دوورکەوتنەوە لە سوکایەتی و گاڵتەپێکردن و بەکەم سەیرکردن.
٢. ڕاگەیاندن؛ دەبێت میدیاکان بە وریاییەوە ئەم بابەتە بگوازنەوە و باسی بکەن و خۆیان بەدوربگرن لە هاندانی تاکەکان بۆ دەرخستن و ئەنجامدانی ڕەفتاری هاوڕەگەزخوازی بۆ کۆمەڵگە، چونکە دەرئەنجامەکەی بە خراپ بەسەر تاکدا دەشکێتەوە. هەروەها نابێت ببنە سەرچاوەیەک بۆ سوکایەتی و گاڵتەپێکردن و جیاکارییەک کە زیان بە دەروونددروستی و کەسێتییان بگەیەنێت.
٣. زانایانی ئاینی؛ لەکاتی باسکردنی ئەم ڕەفتارەدا هەرچەندە کە لەڕووی ئاینییەوە بە تاوان هەژمار بکرێت نابێت ببێتە هۆی شکاندنی کەسییەتی هاوڕەگەزخواز، چەندین هاوڕەگەزخواز هەن کەسانی باوەڕداران و بەشداری نوێژ و جومعە دەکەن و و دورن لە ئەنجامدانی کاری سێکسی و تەنها هەستی هاوڕەگەزخوازیان هەیە، کاتێک کە کەسێتی هاوڕەگەزخواز بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین دەخەیتە ڕوو، لەوانەیە ببێتە هۆی داڕووخانی دەروونی کەسەکە و لەناوبردنی کەسێتی، لەبەرئەوە گرنگە کە زانایانی ئایینی هەرکات باسی ڕەفتارەکەیان کرد بەوشێوە باسی بکەن کە لە ئایندا باسکراوە، بەڵام هەوڵبدەن لایەنە باشەکانی تری کەسانی هاوڕەگەزخواز ببینن!

دەبێت بەئاگابن کە لەوانەیە ئەو هاوڕەگەزخوازەی دانیشتووە و گوێی لێ دەگرێت خۆشی ڕقی لە ڕەوشتەکە بێت و بیەوێت نەیهێڵێت، بەڵام کاتێک سوکایەتی زۆر دەبینێت بەتەواوی بڕوخێت و بێهیوا ببێت!

٤. پسپۆڕان؛ هەتا دەتوانن هاوکاری کەسانی هاوڕەگەزخواز بکەن، بەوشێوەی کە لە توانایاندایە لە چارەسەری هەر نەخۆشییەک کە بەهۆی هاورەگەزخوازییەوە تووشیان دەبێت، هەتا دەگاتە چۆنییەتی خۆگونجان و مامەڵەکردن لەگەڵ هەست و ئارەزووی هاوڕەگەزخوازی. نابێت هاوڕەگەزخواز بە تەنها جێبهێڵن!

٥. ئەکادیمییەکان؛ لەکاتی نووسینی ئەم توێژینەوە زۆر گەڕاین بۆ سەرچاوەی زانستی بە زمانی کوردی یان توێژینەوە کە لەسەر کۆمەڵگەی کوردی هەبێت، بەڵام تەنها چەند نوسینێکی نازانستی و چەند هەواڵێک بەردەستبوون کە ئەوانیش داڕشتنەوە و نوسینەکانیان پڕبوون لە هەڵە. لەبەرئەوە ئەرکی کەسانی ئەکادیمی و توێژەرانە کە لێکۆڵینەوە لەم دیاردە لە کۆمەڵگەی کوردی بکەن، قەبارە و جیاوازییەکانی بدۆزنەوە و ڕێگەی زانستی و دروست بخەنە بەردەم لایەنە پەیوەندیدارەکان.

٦. دەسەڵات؛ ئەرکی دەسەڵاتە کە هەوڵبدات دیاردە و ڕووداوەکان لەسەر بنەمای زانستی و سود و بەرژەوندی گشتی کۆمەڵگە ڕێکبخاتەوە، بە لەبەرچاوگرتنی بەها ڕەوشتییە کۆمەڵایەتیی و ئاینییەکان بەشێوەیەک کە هیچ گرووپ و لایەنێک نەبێتە قوربانی. لە هەموو لایەنەکانەوە دەسەڵاتی سیاسی ڕۆڵی هەیە و کاریگەر دەبێت وەکو لایەنەکانی کەسی، کۆمەڵایەتی، یاسایی و تەندروستی. هەروەک بینیم کە ئەم ساڵ بابەتێکی گرنگی ناو کۆمەڵگە بریتیی بوو لە بڵاوبوونەوەی ئاوڵەی مەیموون، کە زۆرینەی توشبووان لە گرووپی هاوڕەگەزخوازان و دوورەگەزخوازانن (٣٠).

## تێبینی گشتی:

- وشەی هاوڕەگەزخواز کە لەم توێژینەوەدا بەکارهاتووە، زۆرجار لایەنی دووڕەگەزخوازیش دەگرێتەوە. ئێمە لەبەر دووبارە نەکردنەوەی هەوڵمانداوە تەنها وشەی هاوڕەگەزخواز بەکاربهێنین.
- بە گەڕانەوە بۆ لایەنی پشتیوانی توێژینەوەکان لە بواری ئاڕاستەی سێکسی زۆربەیان پاڵپشتی و پشتیوانیان لەلایەن گرووپەکانی هاوڕەگەزخوازییەوە دەکرێت و ئەمەش ڕاستی و درووستی ئەنجامەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. بۆ نمونە سەرچاوەی ژمارە (١) کە بەڕوونی ئاماژەی بە لایەنی پاڵپشتی کردووە.

## سەرچاوەکان


1. Bailey, J. M., Vasey, P. L., Diamond, L. M., Breedlove, S. M., Vilain, E., & Epprecht, M. (2016). Sexual Orientation, Controversy, and Science. Psychological Science in the Public Interest.
2. Balthazart, Jacques (2012). The Biology of Homosexuality. Oxford Academic.
3. Lehman, Diaz, K.M., Ng, H.H., Petty, E., Thatikunta, M., & Eckstrand, K. (2020). The Equal Curriculum: The Student and Educator Guide to LGBTQ Health. The Equal Curriculum.
4. Pimentel, J., & Garcia, A. J. S. (2022). Genetics or Environment: Tracing the Root Cause of Increasing Homosexual Population. Advances in Social Sciences Research Journal.
5. Anton, B. S. (2010). Proceedings of the American Psychological Association for the legislative year 2009: Minutes of the annual meeting of the Council of Representatives and minutes of the meetings of the Board of Directors. American Psychologist.
6. American Psychological Association. (2008). Answers to your questions: For a better understanding of sexual orientation andhomosexuality.
7. Barbara L. Frankowski, and Committee on Adolescence (2004). Sexual Orientation and Adolescents. Pediatrics.
8. American Psychological Association. (2015). Guidelines for Psychological Practice with Transgender and Gender Nonconforming People. American Psychologist.
9. American Psychological Association & National Association of School Psychologists. (2015). Resolution on gender and sexual orientation diversity in children and adolescents in schools.
10. American Psychological Association. (2012). Guidelines for Psychological Practice with Lesbian, Gay, and Bisexual Clients. American Psychologist.
11. American Psychological Association. (2015). APA dictionary of psychology (2nd ed.).
12. Quinan, C.L. (2016). Kinsey Scale. In The Wiley Blackwell Encyclopedia of Gender and Sexuality Studies.
13. Hughes, I. A., Werner, R., Bunch, T., & Hiort, O. (2012). Androgen insensitivity syndrome. Seminars in reproductive medicine.
14. Mongan NP, et al. (2015, Androgen insensitivity syndrome, Best Practice & Research Clinical Endocrinology & Metabolism.
15. El-Maouche, D., Arlt, W., & Merke, D. P. (2017). Congenital adrenal hyperplasia. Lancet (London, England).
16. Witchel, S. F., & Azziz, R. (2011). Congenital adrenal hyperplasia. Jour-

nal of pediatric and adolescent gynecology.
17. American Psychiatric Association. (2013). Diagnostic and statistical manual of mental disorders (5th ed.).
18. World Health Organization. (2019). ICD-11: International classification of diseases (11th revision).
19. Sadock B. J. Ahmad S. & Sadock V. A. (2019). Kaplan & sadock's pocket handbook of clinical psychiatry (Sixth).
20. C□ceres, C., Konda, K., Pecheny, M., Chatterjee, A., & Lyerla, R. (2006). Estimating the number of men who have sex with men in low and middle income countries. Sexually transmitted infections.
21. Ngun, T. C., & Vilain, E. (2014). The biological basis of human sexual orientation: is there a role for epigenetics?. Advances in genetics.
22. Jack Drescher (2015): Queer diagnoses revisited: The past and future of homosexuality and gender diagnoses in DSM and ICD, International Review of Psychiatry.
٣٢. جەعفەر عومەر (٩١٠٢). نەخۆشی دەروونی.
24. Prashanth NR, Rajagopalan M, Kuruvilla K. (1996) Homosexuals Presenting to a Psychiatrist. Indian Journal of Psychological Medicine.
25. Annie Bartlett, Glenn Smith, Michael King (2009). 'The response of mental health professionals to clients seeking help to change or redirect same-sex sexual orientation'. BMC Psychiatry.
26. Janssen DF. (2014). "Paraphilia": Acultural or Anti-Anthropological? Sexual Offender Treatment.
27. Xie Ying & Peng Minggang (2017): Attitudes towards Homosexuality in China: Exploring the Effects of Religion, Modernizing Factors, and Traditional Culture, Journal of Homosexuality.
28. Ganna, A., Verweij, K., Nivard, M. G., Maier, R., Wedow, R., Busch, A. S., et al,. (2019). Large-scale GWAS reveals insights into the genetic architecture of same-sex sexual behavior. Science (New York, N.Y.).
29. Rosario, M., Schrimshaw, E. W., Hunter, J., & Braun, L. (2006). Sexual identity development among gay, lesbian, and bisexual youths: consistency and change over time. Journal of sex research.
30. Ajmera, K. M., Goyal, L., Pandit, T., & Pandit, R. (2022). Monkeypox - An emerging pandemic. IDCases.



## پێشەکی:

زاراوەی ناسنامەی ڕەگەزی ئاماژەیە بۆ ئەو هەستەی کە مرۆڤ هەیەتی بۆ نێر یان مێ، کە زۆرترین جار لەگەڵ ڕەگەزی تویکاری (کۆئەندامی زاوزێ) کەسەکەدا دەگونجێت(١).

هەرچی زاراوەی ناڕێکی ڕەگەزیشە: ئاماژەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ناتەباییەکی بەرچاویان هەیە لە نێوان ڕەگەزی ئەزموونکراو (خۆیان چۆن لە ڕەگەزی خۆیان دەڕوانن)، یان دەربڕینیان(حەز دەکەن چۆن دەربکەون)و، ئەو ڕەگەزەی کە لەکاتی لەدایکبووندا هەیانە. ئەو کەسانەی کە تووشی ناڕێکی ڕەگەزی بوون، ناڕەزایی خۆیان لە ڕەگەزی دیاریکراویان دەرئەبڕن، وەک خواستێک بۆئەوەی جەستەی ڕەگەزی بەرامبەریان هەبێت، یان لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە وەک کەسێکی ڕەگەزی دیکە سەیر بکرێن(٢) .بەمانایەکی تر ناتەباییەک لە نێوان ئەو ڕەگەزەی هەڵیگرتووە لەکاتی لەدایکبوونیدا و ئەوەی خۆی هەستی پێ دەکات و لەخۆی دەڕوانێت دروست دەکات(٣). ئەم حاڵەتە پێویستە ببێتە هۆی بێزارکردنی کەسەکە بەڕادەیەک کە بەدوای چارەسەردا بگەڕێت(٤).

ناڕێکی ڕەگەزی لە گرووپە تەمەنییە جیاوازەکاندا بەشێوەیەکی جیاواز جیاواز دەردەکەوێت. ئەو کەسانەی پێش تەمەنی باڵغبوون لەکاتی لەدایکبووندا بە ناڕێکی ڕەگەزی مێینە دیاری دەکرێن، لەوانەیە هەستێکی دیاریکراو و بەردەوام یان قەناعەتێک دەرببڕن کە کوڕن، ڕق و کینە لە بیرۆکەی کچبوون دەرببڕن، یان جەخت لەوە بکەنەوە کە گەورە دەبن و دەبنە پیاو. زۆرجار جلوبەرگ و شێوازی قژی کوڕانیان پێ باشترە، لەوانەیە لەلایەن کەسانی نامۆوە وەک کوڕ هەستیان پێ بکات و لەوانەیە داوای ئەوە بکەن کە بە ناوی کوڕێکەوە بانگیان بکەن(٣).

هەندێکجار کاردانەوەی نەرێنی چڕ پیشان دەدەن بەرامبەر بە هەوڵەکانی دایک و باوک بۆئەوەی جلوبەرگ یان جلوبەرگی تری ژنانە لەبەر بکەن. ڕەنگە هەندێکیان ڕەتی بکەنەوە بەشداری قوتابخانە یان بۆنە کۆمەڵایەتییەکان بکەن کە ئەو جۆرە جلوبەرگانە پێویستیان پێیەتی. ئەم منداڵانە لەوانەیە ناتەباییەکی بەرچاوی ڕەگەزی لە ڕۆڵگێڕان، خەونەکان، یاریکردنی جۆری ڕەگەز و حەزەکانی یاری، شێواز، خەیاڵ و حەزەکانی هاوڕێیاندا نیشان بدەن. وەرزشی پەیوەندی، یاری زبر و زەق، یارییە تەقلیدییەکانی کوڕێتی و کوڕان وەک هاوڕێی یاریکردن زۆرترین جار بە باشتر دەزانرێت. ئەوان گرنگییەکی کەم بە یارییە ژنانەیی کلاسیکییانە (بۆ نموونە، بووکەڵە) یان چالاکییەکان (بۆ نموونە، جلوبەرگی ژنانە یان ڕۆڵگێڕان) نیشان دەدەن(٣) (٤).

## ڕێژەی سەدی ئەم پەشێوییە:

داتایەکی ڕوون نییە لە بەردەستدا کە بەدڵنیاییەوە بزانین چەند لەسەدی مرۆڤەکان ئەم پەشێوییەیان هەیە(٢). بەڵام هەندێک داتا لەبەردەستان کە زیاتر هی ئەو کەسانەن کە داوای چارەسەر دەکەن. ڕێژەی بڵاوبوونەوەکە بۆ دەستنیشانکردنی نارێکی ڕەگەزی لە سەرانسەری دانیشتوواندا هەڵسەنگێنراوە بۆ کەمتر لە ١/١،٠٠٠ (واتە، < ٠،١٪) بۆ هەردوو ڕەگەزەکە(٣).

ڕێژەی نێر بۆ مێ ٤:١ یە(واتە ڕێژەی لە ڕەگەزی نێردا چوار هێندەی ڕەگەزی مێیە). نزیکەی هەموو ئەو مێینانەی کە ڕەگەزیان تێکچووە، ئاراستەی هاوڕەگەزبازییان هەیە. لە ٥٠٪ی ئەو پیاوانەی کە ڕەگەزیان تێکچووە، ئاراستەی هاوڕەگەزبازییان هەیە، لە ٥٠٪ی تریش حەزیان هەیە بۆ هەردوو ڕەگەز، هەندێکیان حەزیان نییە بۆ هیچ کام لە ڕەگەزی نێر و مێ(٢).

## هۆکارزانی:

### ـ هۆکارە بایۆلۆجییەکان:

تێستۆستیرۆن کاریگەری لەسەر دەمارەکانی مێشک هەیە کە بەشدارن لە پیاوسالاریکردنی مێشک بەتایبەت لە بەشی هیاپۆثالامەس. مشتومڕ زۆرە دەربارەی ئەوەی ئایا هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن بەشدارە لە شێوازی ڕەفتاری بەناو پیاوانە یان مێینە لە تێکچوونەکانی ناسنامەی ڕەگەزیدا؟ هێشتا ئەمە یەکلایی نەبۆتەوە(٢). هۆرمۆنە تایبەتەکان بە سێکس کاریگەری لەسەر دەربڕینی ڕەفتاری سێکسی لە پیاوان و ژنانی پێگەیشتوودا هەیە (واتە هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن دەتوانێت ئارەزووی سێکسی و شەڕانگێزی لە پیاوان و ژناندا زیاد بکات، لەکاتێکدا ئیسترۆجین یان پرۆجسترۆن دەتوانێت ئارەزووی سێکسی و شەڕانگێزی لە پیاواندا کەم بکاتەوە) (٥).

هۆکارە جینییەکانی نارێکی ڕەگەزی لەژێر لێکۆڵینەوەدان، بەڵام تاوەکو ئێستا هیچ جینێک دەستنیشان نەکراوە کە بەرپرس بێت لەم پەشێوییە. تەنانەت هیچ گۆڕانکارییەکی کرۆمۆسۆمی بەدی ناکرێت لە ڕەگەزگۆڕاوەکاندا(Transgenders). هەندێک کەسی ڕیپۆرتکراو هەیە کە لەلایەن پزیشکانەوە بە نموونە وەرگیراون لە نێوان دووانە هاوشێوەکاندا، هەندێک لە دووانەکان هاوشێوەن بۆئەوەی هەردوو دووانەکە حاڵەتی ڕەگەزگۆڕاویان تیابێت و هەندێکی تریش لە ڕاپۆرتەکان هاوشێوەییان پیشان نەداوە(١). لە توێژینەوەیەکدا لەسەر دووانەکانی تووشبوو بە نارێکی ڕەگەزی، ٣٩٪ی دووانەی یەک هێلکە(Monozygotic)هاوشێوەبوون بۆ نارێکی ڕەگەزی(واتە هەردووکیان هەیان بووە)، لەکاتێکدا هیچ کام لە دوانەی دوو هێلکە (dizygotic)هاوشێوە نەبوون(٧).

ڕێبازی جۆراوجۆری دیکە بۆ تێگەیشتن لە ناڕێکی جێندەری لە ئارادان. لەوانە توێژینەوەکانی وێنە تیشکییەکان بۆ مێشکی مرۆڤ کە گۆڕانکاری لە کۆئەندامی ماددە سپییەکان(White Matter) و ڕۆیشتنی خوێنی مێشک و شێوازی چالاکبوونی مێشک لە نەخۆشانی تووشبوو بە ناڕێکی ڕەگەزی نیشانداوە، بەڵام ئەمە کارێکی سەرەتاییە(٨)(١). دۆزینەوەیەکی تر ئەوەیە کە کەسانی ڕەگەزگۆڕاو ئەگەری زۆرە چەپلەر بن، کە گرنگییەکەی نادیارە(١).

**ـ هۆکارە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان:**

بەگشتی منداڵان پەرە دەدەن بەو ڕەگەزەی پێوەی لەدایکبوون لەگەڵ ئەو ناسنامە ڕەگەزیییەی کە هەیانە(٩). زۆر هۆکار کاریگەرییان لەسەر دروستبوونی ناسنامەی ڕەگەزی هەیە، لەوانە میزاجی منداڵان و کارلێکی ئەو میزاجە لەگەڵ سیفەت و هەڵوێستەکانی دایک و باوکی. هەروەک ڕۆڵی ڕەگەزی پەسەندکراو لەڕووی کولتووریی و کۆمەڵایەتییەوە بوونیان هەیە: کۆمەڵگە چاوەڕێی ئەوە ناکات کوڕان ژن بن، یان کچان پیاوانە بن(١).

سیگمۆند فرۆید پێی وابوو کە کێشەی ناسنامەی ڕەگەزی لە ئەنجامی ئەو ململانێیانەی کە منداڵان لەناو سێگۆشەی ئۆدیبدا ئەزموونی دەکەن، دروست دەبێت. بە بۆچوونی ئەو هەم ڕووداوە ڕاستەقینەکانی خێزان و هەم خەیاڵە فەنتازیاییەکانی منداڵان هانی ئەم ململانێیانە دەدەن. هەرشتێک ببێتە هۆی تێکدانی ئەو خۆشەویستییە زۆرەی منداڵ کە هەیەتی بۆ دایکی یان باوکی، دەبێتە هۆی دروستبوونی ڕق بۆ ئەو ڕەگەزەی کە ئازارەکەی لای منداڵەکە دروستکردووە، لەسەرئەنجامدا مەیلی دەبێت بۆ ئەو ڕەگەزەی کە جێی ئارامی ئەمە(١).

بە نموونە: کچێک کاتێک خۆشەویستی زۆری هەیە بۆ باوکی، کاتێک دەبینێت دایکی هۆکارێکە بۆ تێکدانی باری ئەم خۆشەویستییەی خۆی و باوکی و سەرچاوەی ئازارە بۆ باوکی، ئەوا ئەو هەستە لای کچەکە دروست دەکات کە ڕقلێبوونەوەی هەبێت لە ڕەگەزەکەی خۆی(کە دایکییەتی) و حەزبکات بچێتە سەر ڕەگەزەکەی تر کە باوکییەتی(١).

دوای فرۆید، دەروونشیکاران ئەو گریمانەیەیان دانا کە کە کوالێتی پەیوەندی دایک و منداڵ لە ساڵانی یەکەمی ژیاندا لە پێش هەموو شتێکەوەیە لە دامەزراندنی ناسنامەی ڕەگەزی. لەم ماوەیەدا، دایکان بەزۆری ئاسانکاری بۆ هۆشیاری منداڵەکانیان دەکەن، و شانازی پێوە دەکەن بە ڕەگەزەکەیان: منداڵەکانیان وەک کوڕ و کچێکی بچووک بە نرخ دەزانن. شیکاران دەڵێن بێبەهاکردنی دایکی دوژمنکارانە بۆ منداڵەکەی دەتوانێت ببێتە هۆی کێشەی ڕەگەزی(١).

هەندێک لە منداڵان ئەو پەیامەیان پێدەگات کە ئەگەر ناسنامەی ڕەگەزی بەرامبەر بگرنەبەر، ئەوا بەهایان زیاتر دەبێت. ئەو منداڵانەی تووشی ڕەتکرانەوە بوون، یان دەستدرێژی کراوەتە سەریان دەتوانن بەپێی بیروباوەڕێکی لەو جۆرە کار بکەن کە گۆڕانکاری لە ڕەگەزدا لەوەیە هێز و شکۆیان بۆ بگێڕێتەوە(٦).

هەروەک مردنی دایک، ئامادەنەبوونی درێژخایەن، یان خەمۆکی دەتوانێت کاریگەری لەسەر پرۆسەکە هەبێت و، کوڕێکی گەنج لەوانەیە کاردانەوەی هەبێت بە ناساندنی تەواو لەگەڵیدا- واتە بە بوون بە دایک بۆ جێگرتنەوەی(١).

هەروەها ڕۆڵی باوک لە ساڵانی سەرەتاییدا زۆر گرنگە و بوونی دەتوانێت یارمەتی پرۆسەی جیابوونەوە-تاککردن بدات. ئەگەر باوک نەبێت، ڕەنگە دایک و منداڵەکە لە ڕادەبەدەر لە یەکتر نزیک بمێننەوە. بۆ کچێک، باوک بەزۆری نموونەی شتە خۆشەویستییەکانی داهاتووە؛ بۆ کوڕێک، باوک مۆدێلێکە بۆ ناسینەوەی نێر(١).

تیۆری فێربوون گریمانە دەکات کە منداڵان ڕەنگە لەلایەن دایک و باوک و مامۆستاکانەوە پاداشت بکرێنەوە یان سزا بدرێن لەسەر بنەمای ڕەفتاری ڕەگەزی، بەم شێوەیە کاریگەری لەسەر شێوازی دەربڕینی ناسنامەی ڕەگەزی منداڵان دەبێت. هەروەها منداڵان فێردەبن چۆن بەپێی ڕەگەز ناوی مرۆڤەکان دابنێن. لەکۆتاییدا فێر دەبن کە نابێت ڕەگەز بە پشتبەستن بە دەرکەوتنی ڕووکار وەک جلوبەرگ یان شێوازی قژ بڕین دەرخەن(١).

**دەستنیشانکردن و تایبەتمەندییە کلینیکییەکان:**

بەپێی ڕێبەری دەستنیشانکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان(DSM٥TR) سەر بە کۆمەڵەی پزیشکانی ئەمریکی بۆ ساڵی ٢٠٢٢، دەستنیشانکردنی ئەم پەشێوییەی بەسەر دوو تەمەندا دابەشکردووە، ئەوانیش منداڵان و گەوران، لێرەدا شێوازی دەستنیشانەکەی باس دەکەین(٣):

**لە منالاندا:**

A: ناتەباییەکی بەرچاو لە نێوان ڕەگەزی ئەزموونکراو(خۆیان چۆن لە ڕەگەزی خۆیان دەڕوانن)، یان دەربڕینیان(حەز دەکەن چۆن دەربکەون) و ڕەگەزی دیاریکراو، کە لانیکەم بۆماوەی ٦ مانگ بێت وابێت و، لانیکەم شەش لەم نیشانانەی خوارەوەی هەبێت (یەکێک لەوانە دەبێت پێوەرەکانی A١ بێت):

١. ئارەزووی بەهێز بۆئەوەی ببێتە ڕەگەزی بەرامبەر، یان پێداگربوون لەسەر ئەوەی کە ڕەگەزێکی دیکەیە.

٢- لە کوڕان (ڕەگەزی دیاریکراو)، پەسەندکردنێکی بەهێز بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگی

ڕەگەزی کچ یان هاوشێوەکردنی جلوبەرگی مێینە؛ یان لە کچاندا (ڕەگەزی دیاریکراو)، حەزێکی بەهێز بۆ لەبەرکردنی تەنها جلوبەرگی ئاسایی پیاوانە و بەرگرییەکی بەهێز لە بەرامبەر لەبەرکردنی جلوبەرگی ئاسایی ژنانە.

٣- پەسەندکردنی بەهێز بۆئەوەی ڕۆڵی ڕەگەزەکەی تر ببینێت لە ئەنجامدانی ئەو یارییانەی کە تایبەتە بە ڕەگەزەکەی تر.

٤- پەسەندکردنی بەهێز بۆ ئەو یارییانە، یارییەکان، یان چالاکییەکان کە تایبەتە بە ڕەگەزەکەی دیکە و تەنها ئەو ڕەگەزە دەتوانێت بەکاری بهێنێت یان بەشدارییان تێدا بکات.

٥- پەسەندکردنی بەهێز بۆ هاوڕێیکردنی ڕەگەزەکەی تر.

٦. لە کوڕان (ڕەگەزی دیاریکراو)، ڕەتکردنەوەی بەهێزی ئەو یارییانەی تایبەتن بە کوڕان و دوورکەوتنەوەیەکی بەهێز لە یاری زبر و کەوتن؛ یان لە کچاندا (ڕەگەزی دیاریکراو)، ڕەتکردنەوەی توندی یاری، یاری و چالاکییە تایبەتەکانی کچان.

٧- بێزارییەکی زۆر توند لە ڕەگەزەکەی خۆی.

٨. ئارەزووی بەهێز بۆ تایبەتمەندییە ڕەگەزییە سەرەتایی و/یان لاوەکییەکان کە لەگەڵ ڕەگەزی ئەزموونکراوی مرۆڤدا دەگونجێت.

B: ئەو نیشانەنەی خاڵی (A) دەبنە هۆی بێزارییەکی زۆر بۆ تاک یان کاردەکەنە سەر ژیانی کەسەکە لە ڕووی کۆمەڵایەتی، قوتابخانە، یان بوارە گرنگەکانی تری ژیان.

لە گەوراندا:

A: ناتەباییەکی بەرچاو لە نێوان ڕەگەزی ڕەگەزی ئەزموونکراو(خۆیان چۆن لە ڕەگەزی خۆیان دەڕوانن)، یان دەربڕینیان (حەز دەکەن چۆن دەربکەون) و ڕەگەزی دیاریکراو، کە لانیکەم بۆماوەی ٦ مانگ بێت وابێت و، لانیکەم دوو لەم نیشانانەی خوارەوەی هەبێت:

١. ناتەباییەکی بەرچاو لە نێوان ڕەگەزی ئەزموونکراو(خۆیان چۆن لە ڕەگەزی خۆیان دەڕوانن)، یان دەربڕینیان(حەز دەکەن چۆن دەربکەون) و تایبەتمەندییە ڕەگەزییە سەرەتایی و/یان لاوەکییەکان.

٢. خواستێکی بەهێز بۆ ڕزگاربوون لە تایبەتمەندییە ڕەگەزییە سەرەتایی و/یان لاوەکییەکانی مرۆڤ بەهۆی ناتەباییەکی بەرچاو لەگەڵ ڕەگەزی ئەزموونکراو(خۆیان چۆن لە ڕەگەزی خۆیان دەڕوانن)، یان دەربڕینیان(حەز دەکەن چۆن دەربکەون) و ڕەگەزی دیاریکراو (یان لە هەرزەکارانی گەنجدا، خواستێک بۆ ڕێگریکردن لە گەشەکردنی تایبەتمەندییە سێکسییە لاوەکییە پێشبینیکراوەکان).

٣. ئارەزووی بەهێز بۆ تایبەتمەندییە ڕەگەزییە سەرەتایی و/یان لاوەکییەکانی

ڕەگەزی بەرامبەر.

٤. ئارەزووی بەهێز بۆئەوەی لە ڕەگەزی دیکە بێت (یان هەندێک ڕەگەزی بەدیل جیاواز لە ڕەگەزی دیاریکراوی مرۆڤ).

٥. خواستێکی بەهێز بۆئەوەی وەک ڕەگەزی دیکە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت (یان هەندێک ڕەگەزی بەدیل جیاواز لە ڕەگەزی دیاریکراوی کەسێک).

٦. قەناعەتێکی بەهێز کە مرۆڤ هەست و کاردانەوەی تایبەتی ڕەگەزی دیکەی هەیە (یان هەندێک ڕەگەزی بەدیل جیاواز لە ڕەگەزی دیاریکراوی خۆی).

B: : ئەو نیشانانەی خاڵی (A) دەبنە هۆی بێزارییەکی زۆر بۆ تاک یان کاردەکەنە سەر ژیانی کەسەکە لەڕووی کۆمەڵایەتی، قوتابخانە، یان بوارە گرنگەکانی تری ژیان.

**چارەسەر:**

چاودێریکردنی نەخۆشانی تووشبوو بەناڕێکی ڕەگەزی کۆمەڵێک چارەسەر لەخۆدەگرێت و پێویستە بۆ هەر نەخۆشێک تاکەکەسی بڕیاری لێبدرێت. هەڵبژاردنی وردی چارەسەرەکان، پێداچوونەوە بە ئامانجەکان، و هەڵسەنگاندنی بەردەوامی وەڵامی کلینیکی بە تایبەتی گرنگن(١٠).

چارەسەرە ناپزیشکییەکان- وەک لابردنی مووی دەموچاو، ڕاهێنانی دەنگ، و ڕاوێژکاری پشتیوانی دەستێوەردانی کەم مەترسین کە سوودێکی بەرچاویان هەیە(١٠).

لە هەرزەکاراندا چارەسەری قورسە، بەهۆی پێکەوەژیانی قەیرانی ناسنامەی ئاسایی و سەرلێشێواوی ناسنامەی ڕەگەزی. خۆنواندن و جاولێکەریی و باو باوێنە لە نێوان هەرزەکاراندا زۆرە و  بە دەگمەن پاڵنەرێکی بەهێزیان هەیە بۆ گۆڕینی ڕۆڵی ڕەگەزی خۆیان(٢).

**ڕێگاکانی چارەسەرکردن:**

١. چارەسەری دەروونی. لەم جۆرە چارەسەرەدا دانانی ئامانجە بۆ یارمەتیدانی نەخۆشەکان بۆ ئاسوودەبوون بەو ناسنامەیە ڕەگەزییەی کە ئارەزووی دەکەن. ئامانج لێی هێشتنەوەی کەسەکە نییە لەو ناسنامە سێکسییەی ئێستا خۆی هەیەتی. هەروەک لەم چارەسەرەدا بەدواداچوون بۆ نەشتەرگەری گۆڕینی ڕەگەز دەکرێت و باسی لایەنە باش و ناباشەکانی بۆ دەکرێت، چونکە زۆرجار توشبووانی ئەم پەشێوییە لە دەرئەنجامی دڵەڕاوکێی زۆرەوە بەشێوەیەکی شپرزانە بڕیاری گۆڕینی ڕەگەز دەدەن(١).

٢. نەشتەرگەری گۆڕینی ڕەگەز. ئەم بڕیارە یەکلاکەرەوە و نەگەڕاوەیە. نەخۆشەکان دەبێت بە تاقیکردنەوەی ٣ بۆ ١٢ مانگیدا تێپەڕن کە بریتین لە پۆشینی جلوبەرگی ئەو ڕەگەزەی دەیانەوێت خۆیانی بۆ بگۆڕن، لەهەمانکاتدا چارەسەری هۆرمۆنی بۆ وەربگرن(١).

**پێشبینی و بەرەوپێشچوونی نەخۆشییەکە:**

**ئەوانەی پەشێوی نارێکی ڕەگەزییان هەیە:**

**لە منداڵاندا:**

ئەو منداڵانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون مەرج نییە کە گەورە بوون خۆیان وەک گەورەساڵانی ڕەگەزگۆڕاو بناسێنن. چەندین توێژینەوە دەریانخستووە کە زیاتر لە نیوەی ئەوانەی کە تووشی تێکچوونی ناسنامەی ڕەگەزی بوون لە منداڵیدا، دواتر لەگەڵ ڕەگەزی دیاریکراوی لەدایکبوونیان هەڵدەکەن و ئاسایی دەبێتەوە لایان کاتێک دەگەنە تەمەنی گەورەیی(١).

**لە گەوراندا:**

ئەو گەورەساڵانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون، ڕێژەیەکی زیاتر لە گەورەکانی دیکە لە نەخۆشی خەمۆکی، تێکچوونی دڵەڕاوکێ، خۆکوشتن، ڕەفتارەکانی زیانگەیاندن بەخۆ و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان نیشان دەدەن. ڕێژەی بیری خۆکوژی لە کەسانی ڕەگەزگۆڕاودا نزیکەی لە ٤٠٪ (١).

**هەندێک لە توێژینەوەکان دەریانخستووە ئەو کەسانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون مەترسی مردنیان بە خۆکوشتن زیاترە بە بەراورد بە خەڵکی گشتی.**

هەندێکی تر لە توێژینەوەکان دەریانخستووە ئەو کەسانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون مەترسی مردنیان بە خۆکوشتن زیاترە بە بەراورد بە خەڵکی گشتی. توێژینەوەیەک دەریخستووە کە ٤٨,٣٪ی ئەو بەشداربووانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون، بیرۆکەی خۆکوشتنیان هەبووە، هەروەها ٢٣,٨٪یان لانیکەم جارێک هەوڵی خۆکوشتنیان داوە(١١). توێژینەوەیەکی تر لە لوبنان ئەنجامدراوە کە نزیکەی ٤٦٪ ی ئەو کەسانەی ئەم پەشێوەییەیان هەیە هەوڵی خۆکوژیان داوە(١٢).

**داهاتووی نەخۆشەکە پاش چارەسەر چۆن دەبێت لەو کەسانەی نەشتەرگەری گۆڕینی ڕەگەزیان کردووە؟**

یەکێک لە توێژینەوەکان کە لەسەر ٣٢٤ کەسی ڕەگەز گۆڕدراو (١٩١ لە نێر بۆ مێ، ١٣٣ لە مێ بۆ نێر) ئەنجامدراوە لە سوید لە نێوان ساڵانی ١٩٧٣-٢٠٠٣ دەریخستووە کە، ڕێژەی مردن بۆ ئەو کەسانەی کە ڕەگەزیان بۆ ڕێککراوەتەوە(ڕەگەزیان گۆڕدراوە بە ڕەگەزی خوازراوی خۆیان) زیاتر بوو لە چاو ئەو کەسانەی کە خۆیان لە بنەڕەتدا ئەو ڕەگەزەیان هەیە، بەتایبەتی مردن بەهۆی خۆکوشتنەوە زۆر بەرزە تیایاندا. هەروەها ئەو کەسانەی کە ڕەگەزیان بۆ دانراوەتەوە مەترسی زیاتریان هەبووە بۆ هەوڵی خۆکوشتن و داخڵبوونیان لە نەخۆشخانە دەروونییەکان(١٣).

لە توێژینەوەیەکی تردا ئاماژە بەوە دەکات کە لە هەموو ١٠٠،٠٠٠ کەسێک کە ڕەگەزیان گۆڕیوە، ٨٠٠ کەسیان خۆیان کوشتوە(١٤).

**ئایا هیچ دەرهاویشتەیەکی نائاسایی هەیە ڕەگەز گۆڕین؟**

مەترسی جددی پەیوەندی بە گۆڕینی ڕەگەزەوە هەیە. لەوانە مەترسی نەخۆشی خەمۆکی و خۆکوشتن. پێویستە پزیشکان و پسپۆڕانی تەندرووستی دەروونی ئەم مەترسییانە و پەشیمانی ئەو کەسانە بزانن کە بە نەشتەرگەری گۆڕینی ڕەگەزدا تێپەڕیون. هەروەها پێویستە ئەم نەخۆشانە و خێزانەکانیان لە بژاردەکانی تری چارەسەری ئاگادار بکرێنەوە(١٥).

**بە تەنها تێچوی نەشتەرگەرییەکە چەندە؟**

تێچووی نەشتەرگەری دووبارە دەستنیشانکردنی ڕەگەز جیاوازە. نەشتەرگەری مێ بۆ پیاو لە تۆرۆنتۆ(کەنەدا) نزیکەی ١٠ بۆ ١٢ هەزار دۆلار تێدەچێت. لە بەریتانیا نەشتەرگەری لە نێر بۆ مێ نزیکەی ٩ هەزار پاوەندە (نزیکەی ١٠ هەزار دۆلای ئەمریکییە). ئەو زانیارییانەی کە لەسەر تێچووی نەشتەرگەری دووبارە دەستنیشانکردنی ڕەگەز لەبەردەستدان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ئەمریکا نەشتەرگەری نێر بۆ مێ دەتوانێت لە نێوان ١٠ هەزار بۆ ٢٨ هەزار دۆلار تێبچێت(٦).

**ئایا تەنها تێچووی نەشتەرگەری هەیە؟**

بە دڵنیاییەوە نەخێر، چونکە هەموو ئەو سەردانانەی کە بۆلای هەریەکە لە پسپۆڕییە جیاوازەکانی وەکو: پزیشکی دەروونی، پزیشکی پسپۆڕێکانی تری کە ئەزموونی تایبەتیان هەبێت لە هەڵسەنگاندن و بەڕێوەبردنی ئەو کەسانەی کە تووشی نارێکی ڕەگەزی بوون. زۆربەی چارەسەرەکان لەلایەن کلینیکەکانی ناسنامەی ڕەگەزەوە پێشکەش دەکرێن، لەگەڵ زانیارییەکانی کۆمەڵێک پسپۆڕ، لەوانە پزیشکانی نەشتەرگەری، پزیشکانی هەناویی و ڕژێنە هۆرمۆنێکان، پزیشکانی تەندرووستی سێکسی، چارەسەرکەرانی دەروونی(١٠). هەموو ئەمانە تێچووی خۆی هەیە.

## دەرئەنجام:

پەشێوی نارێکی ڕەگەزی پەشێوییەکی زۆر باو نییە، ڕێژەکەی کەمترە لە ١ کەس بۆ هەر ١٠٠٠ کەسێک و، هەندێک سەرچاوە باس لە ١ کەس دەکەن لە ١٠،٠٠٠ کەسدا. تائێستاش هۆکارێکی ١٠٠٪ی دیاریکراوی نییە کە چ شتێک هۆکاری دروستبوونی ئەم پەشێویەیە. زۆربەی چارەسەرەکان بەرەو گۆڕینی ڕەگەزی دەڕۆن پاش هەڵسەنگاندنی تەواو لەلایەن پسۆڕانەوە و، تێچووی گۆڕینەکەش هەزاران دۆلارە، هەروەک مەترسی خۆکوژی لە توشبووانی ئەم پەشێوییەدا زۆرترە بە بەراورد بە خەڵکانی ئاسایی. هەرچەندە ڕێگای چارەسەری هەیە بۆ ڕەگەز گۆڕین، بەڵام هێشتا مەترسی خۆکوژی تیایاندا بەرزە پاش گۆڕێنیش بەراورد بە خەڵکانی ئاسایی. میدیا و فیلمە ئاڕاستەکراوەکان و نەبوونی ئاستی هۆشیاری تاک خۆی و خانەوادە هۆکارێکی پاڵنەرن بۆ زیادبوونی گۆڕینی ڕەگەزی، چونکە زۆربەی کات درکی مەترسی و ماکەکانی ئەو گۆڕانکارییە ناکەن کە دوای گۆڕینی ڕەگەزی لەوانەیە ڕوبدات.

## سەرچاوەکان


(1) Robert Joseph Boland. Marcia L. Verduin(2022). KAPLAN & SADOCK'S CONCISE TEXTBOOK OF CLINICAL PSYCHIATRY FIFTH EDITION.
(2) BENJAMIN J. SADOCK. KAPLAN & SADOCK'S(2019). POCKET HANDBOOK OF CLINICAL PSYCHIATRY Sixth Edition. 6th edition.
(3) American Psychiatric Association.(2022) DIAGNOSTIC AND STATISTICAL MANUAL OF MENTAL DISORDERS FIFTH EDITION TEXT REVISION.
(4) KAPLAN & SADOCK'S (2015). Synopsis of Psychiatry Behavioral Sciences/Clinical Psychiatry. Eleventh edition.
(5) Stephen R. Hammes, and Ellis R. Levin. (2019). Impact of estrogens in males and androgens in females National Library of Medicine.
(6) www.ohrc.on.ca/en/discussion-paper-toward-commission-policy-gender-identity




(7) Heylens G et al. (2012). Gender identity disorder in twins: A review of the case report literature. Journal of Sexual Medicine, 9, 751–7.
(8) Ferdinand J O Boucher and Tudor I Chinnah. (2020). Gender Dysphoria: A Review Investigating the Relationship Between Genetic Influences and Brain Development. National Library of Medicine.
(9) Shuvo Ghosh, et al. Usual Patterns. (2020) Development of Gender Identity. Medscap.
(10) David Semple, Roger Smyth.(2019) Oxford Handbook of Psychiatry. Oxford University Press is a department of the University of Oxford. FOURTH EDITION.
(11) Garc□a-Vega E, Camero A, Fern□ndez M, Villaverde A.(2018). Suicidal ideation and suicide attempts in persons with gender dysphoria.
(12) Rachel L. Kaplan, et al. Suicide risk factors among trans feminine individuals in Lebanon, International Journal of Transgenderism, 17:1, 23-30.
(13) Cecilia Dhejne، et al.(2011). Long-Term Follow-Up of Transsexual Persons Undergoing Sex Reassignment Surgery: Cohort Study in Sweden. Plos-one journal.
(14) ANN P. HAAS, et al. (2011) Suicide and Suicide Risk in Lesbian, Gay, Bisexual, and Transgender Populations: Review and Recommendations.
(15) P Fitzgibbons R.(2015). Transsexual attractions and sexual reassignment surgery: Risks and potential risks.

نووسینی: ئیبراهیم سەید
وەرگێڕانی: ڕێدار ئەحمەد

# هاوڕەگەزبازی

## ڕەفتارێکی بەدەستهاتووە یان بەهۆی جینەکانەوەیە کە کۆنترۆڵ ناکرێن



ماوه ماوه باس له دەستكەوتی زانستی لەبواری دۆزینەوەی جینی هاوڕەگەزبازی (Gay Gene) دەكرێت كە بانگەشەی ئەوە دەكات هاوڕەگەزبازی لای مرۆڤ كارێكی سروشتی و (فیتری)یە، ئەمجۆرە توێژینەوە یان هەواڵانە بەیەكێك لەو پایە سەرەكییانە دادەنرێت كە گوتاری بێباوەڕانی لەسەر دامەزراوە و پەرە بەو بیرۆكەیە دەدات هاوڕەگەزبازی ناتەواوی یاخود نەخۆشییەكی ئۆرگانی یان تێكچوونی دەروونی نییە، بەڵكو بژاردەیەكی زۆر ڕەوایە، چونكە سروشتێكی بۆماوەیی هەیە و لە ترشەڵۆكی ناوەكی مرۆڤ (Human DNA)دا هەیە و لەگەڵ مرۆڤ لەدایك دەبێت و ناتوانێت لەكۆڵی بكرێتەوە و ناشتوانرێت بەهۆیەوە سزای بدرێت وەك ئەوەی ئایینە ئاسمانییەكان داوای دەكەن، لەم چوارچێوەیەدا و بۆ نموونە ڕیتشارد دوكنزی مولحید بۆچوونی وایە: «بەرەوپێشچوونەكان بەتەواوی لە ڕێگەی چەند تیۆرێكەوە هاوڕەگەزبازی ڕوون دەكاتەوە»، شەریف جابری مولحیدی عەرەبیش پێی وایە هاوڕەگەزبازی ڕەفتارێكی سروشتییە كە پێویست بە ترسان یان خۆڕزگاركردن لێی ناكات، بەڵكو دەبێت پشتگیری بكرێت و سازانی لەگەڵ بكرێت.

لەگەڵ زیادبوونی بەسیاسیكردنی پرسی هاوڕەگەزبازی، بەتایبەتی لە ساڵی ٢٠١٥دا كە دادگای باڵای ئەمریكا بڕیاریدا كە ڕێگە بە هاوسەرگیری هاوڕەگەزەكان دەدرێت لە سەرتاسەری ئەمریكادا، لەكاتێكدا پێشتر ئەو بابەتە تەنیا لە ٣٦ ویلایەت لە كۆی ٥٠ ویلایەتدا ڕێگەپێدراو بوو، بەم بڕیارە ئەمەریكا چووە نێو لیستی ئەو وڵاتانەوە كە ڕێگە بە هاوسەرگیری هاوڕەگەزەكان دەدەن، وەك دانیمارك، هۆڵەندا، بەلجیكا، باشووری ئەفریقا، بەڕازیل و ئەوانی دیكە. باشە ڕاستی ئەو بانگەشە زانستییانەی سەبارەت بە هاوڕەگەزبازی دەكرێت چییە؟! ئایا هاوڕەگەزبازی ڕەفتارێكی سروشتییە كە لە ئەنجامی میراتێكی بۆماوەییەوە دێتە ئاراوە كە لە ماوەی هەزاران ساڵدا پەرەی سەندووە، یان ڕەفتارێكی وەرگیراو و ناتەواوییەكی دەروونییە كە پەیوەستە بە چەند هۆكارێكی كۆمەڵایەتی و ژینگەییەوە؟!

## چۆن لێكدانەوە بۆ هاوڕەگەزبازی بكەین؟

ئەو گوتارەی بانگەشە بۆ هاوڕەگەزبازی دەكات لەسەر بنەمای بڵاوكردنەوەی بیرۆكەی «سروشتیبوون»ی لادانی سێكسی دامەزراوە و بۆ ئەمەش پشتی بە سێ ئاراستە بەستووە: یەكەمیان بریتییە لە بەراوردكردنی ڕەفتاری مرۆڤ لەگەڵ ڕەفتاری گیانلەبەران، چونكە تێبینی ئەوە كراوە زۆرێك لە گیانلەبەران هاوڕەگەزبازیان تێدایە. ئاراستەی دووەمیش بریتییە لە بانگەشەی بوونی كۆدی جینی (Genetic code)ی

دیاریکراو کە بەرپرسە لە هاوڕەگەزبازی -ڕەفتاری سێکسی بەشێوەیەکی گشتی- لە ترشی ناوەکی مرۆڤدا. ئاڕاستەی سێیەم خۆی لەوەدا دەبینێتەوە گۆڕانکارییە ژینگەییەکان و فاکتەرە کۆمەڵایەتییان هیچ پەیوەندییان بە دیاریکردنی ئاڕاستە و ناسنامەی سێکسییەوە نییە.

دیارە ڕاستبوونی ئەم ئاڕاستانە ڕووبەڕووی گومانێکی زۆر دەبێتەوە، ئەمەش لەلایەن دوو برا کە نووسەری زانستین، بەناوەکانی نیل وایت هێد و بریار وایت هێدەوە لە کتێبەکەیاندا (جینەکانم وایان لێکردم بیکەم!) پشتڕاستی دەکەنەوە، ئەو دوو نوسەرە لە پێشەکی کتێبەکەیاندا دەڵێن: «ڕۆژئاوا لە ماوەی بیست یان سی ساڵی ڕابردوودا مەیدانی هەڵمەتێکی زانیاری ناڕاست و فریودان بوو، کە تێیدا دامەزراوە گشتییەکانی، لە یاسادانەرانەوە تا دادوەر و لە کەنیسەکانەوە تا پسپۆڕییە مێشکییە تەندروستییەکان، بەشێوەیەکی بەرفراوان باوەڕیان وایە هاوڕەگەزبازی بەشێوەیەکی ئۆرگانیکی بۆماوەییە هەربۆیە ناتوانرێت بگۆڕدرێت». مارک دایس شرۆڤەکاری ڕاگەیاندن هاوڕایە لەگەڵ ئەم بۆچوونە و دەڵێت:»میدیا لیبراڵەکان بەمەبەستی باوەڕهێنان بە ئەمریکییەکان کە ڕێژەی هاوڕەگەزبازی بەرزبووەتەوە لەڕێگەی پڕوپاگەندەی هاوڕەگەزبازییەوە پرۆسەی مێشک شۆردنی ئەنجامداوە».

## ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لای ئاژەڵەکان

زۆرێک لە زانایان بۆچوونیان وایە بەڵگەهێنانەوە بە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لای ئاژەڵ بۆ بەڕاست نیشاندانی زگماکبوونی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لای مرۆڤ بەڵگە هێنانەوەیەکی هەڵەیە لەدوو ڕووەوە، یەکەمیان: بریتییە لەوەی غەریزەکان و ڕەفتارە ئاژەڵییەکان ڕاست نییە بەهاوشێوەکانی لای مرۆڤ پێوانە بکرێت، بۆ نموونە، هەندێک پشیلە –نێر و مێیان- هەڵدەستن بە کوشتنی پشیلە بچووکەکان تەنانەت ئەگەر ئەو پشیلە بچووکانە بێچووی خۆشیان بێت، ئەم ڕەفتارە هۆکارێکی غەریزەیی لای پشیلە هەیە بەهۆی هەندێک گۆڕانکاری سایکۆلۆژیی و ئۆرگانییەوەیە. لە ڕەفتارێکی ئاوەهادا، ئایا دەکرێت بێهوودە برا مرۆڤەکەی بکوژێت بە بیانووی ئەوەی ئەمە ڕەفتارێکی سروشتییە لای ئاژەڵەکان، هەر جۆرە بوونەوەرێکی زیندوو (Species) پێکهاتەی بونیاتی و وەزیفی جیاواز لەتەواوی جۆرە بوونەوەرەکانی تر هەیە.

لایەنی دووەمی ڕەتکردنەوەی پێوانەکردنی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی ئاژەڵەکان لەسەر ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی مرۆڤەکان ئەوەیە کە زۆربەی ئەو ئاژەڵانەی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی دەکەن بەهۆی پاڵنەری شەهوەت و ئارەزووی سێکسی بۆ هاوڕەگەزەکەیان

ئەنجامی نادەن، بەڵکو هۆکاری جۆراوجۆری هەیە کە زۆرجار پەیوەندییان بە بوونی مەیلی سێکسی ڕەسەنەوە بەرامبەر بە هەمان ڕەگەزی خۆیان نییە، لە هۆکارەکانی هاوڕەگەزبازی لە جیهانی ئاژەڵەکاندا: ڕاگەیاندنی زاڵبوونی نێرینە نێرینە بەسەر نێرەکانی تردا و، دەرخستنی باڵادەستی ئەو نێرینەیە بەسەر زەوییەکی دیاریکراودا و، چەسپاندنی نێرینەیەتی ئەو نێرینەیە لەبەردەم ئەو مێینانەی بۆ بەهێزێک دەگەڕێن، هەندێکجاریش: تێکچوونی هەستی بۆنکردن -کە بەرپرسە لە وەرگرتنی نامە سێکسیەکان لای هەندێک لە ئاژەڵەکان- لای نێرینە لە دیاریکردنی کامە مێینەیە و کامە نێرینەیە. ئەم پاساوانەش جیاوازە لەو پڕوپاگەندانەی کە پشتیوانی هاوڕەگەزبازی دەکەن.

توێژینەوەیەک ئەوەی سەلماندووە ڕەفتاری سێکسی بەدەست دەهێنرێت -لانی کەم بەشێوەیەکی بەشەکی- لەکاتی پێگەیشتندا و بەشێوەیەکی بەهێز لە منداڵییەوە دەکەوێتە ژێر کاریگەری پەروەردە و ڕەفتارێکی زگماگی چەسپاوی ڕیشەدار نییە لای مەیموونەکان کە لەکاتی لەدایکبوونیانەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێک لە توێژەران ئەو پرسیارە دەکەن: ئایا غەریزە سروشتییەکان بەتەنها دیاریکەری ڕەفتاری سێکسین لای ئاژەڵەکان یاخود هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانیش ڕۆڵیان هەیە لە دیاریکردنی مەیلی سێکسیدا؟!

لە یەکێک لە تاقیکردنەوە سەرەکییەکان کۆمەڵێک زانا هاتن کۆمەڵێک مەیموونی نێریان لە دایکیان جیاکردەوە و بەبێ بوونی دایکەکە بەخێویان کردن، کاتێک ئەو بەچکە مەیموونە نێرانە گەورە بوون مەیموونی مێیەنەی قبوڵکراوی سێکسیان هێنا بۆیان، مەیموونە نێرینەکان سەریان لێ شێوا و بەردەوام لە سەرسوڕماندا دەسوڕانەوە، تەنانەت هەندێک لە مەیموونە نێرەکان هەوڵیان دەدا لەگەڵ مەیموونە مێینەکاندا تێکەڵاو ببن، بەڵام شکستیان هێنا. بەم شێوەیە ئەم توێژینەوەیە دەریخست کە ڕەفتاری سێکسی لانیکەم لە بەشێکدا لەکاتی پەروەردەکردندا بەدەست دێت و لە کۆرپەییەوە کاریگەری بەهێزی پەروەردەی لەسەرە، نەک شتێکی زگماکی و جێگیر بێت لای مەیموونەکان لەکاتی لەدایکبوونیانەوە.

## میدیا و ڕاستزانی جینی هاوڕەگەزبازی

زۆرجار ڕۆژنامە و ماڵپەڕەکان هەندێک مانشێتی ئاوەها بڵاودەکەنەوە: دۆزینەوەی (جینی هاوڕەگەزبازی) یان (توێژینەوەیەک دەیسەلمێنێت کە جین ئاڕاستەی سێکسی دەکات). بەڵام پێدەچێت زۆربەی ئەم مانشێتانە لەڕووی ڕادەی بڕواپێکراویی و ڕاستبوونیانەوە جێگەی پرسیار بن. بۆ نموونە لە یەکێک لە ڕووداوە سەرنجڕاکێشەکاندا، زانای بەناوبانگی بۆماوەی ئەمریکی و لایەنگری هاوڕەگەزبازی «دین هامر» هەستا بە

ئەنجامدانی توێژینەوەیەک کە تێیدا بانگەشەی ئەوە دەکات پەیوەندی هەیە لەنێوان زانستی جینەکان و هاورەگەزبازیدا، ڕۆژنامە ئەمریکییەکان زۆر بەخێرایی هەواڵەکەیان لەژێر ئەم مانشێتە ڕاشکاوەدا بڵاوکردەوە: (توێژەرێک جینی هاورەگەزبازی دەدۆزێتەوە)، سەرەڕای سەرنجڕاکێشی ئەم ناونیشانە و مانا ئاشکراکەی لای خوێنەری ئاسایی، کەچی دین هامر خۆی پاش بڵاوبوونەوەی هەواڵەکە ئەو کارەی ڕەتکردەوە و ڕایگەیاند: «جینی بەرپرسی لە ئاڕاستەی سێکسیمان نەدۆزیوەتەوە، بەڵکو باوەڕمان وایە لەئەسڵدا ئەو جینە هەر بوونی نییە»، خودی هامر – کە لایەنگری سەرسەختی هاورەگەزبازییە– پێی وایە هەر هەوڵێک بۆ سەلماندنی بوونی یەک جین کە هاورەگەزبازی بەڕێوەدەبات، هەوڵێکی بێهودەیە.

لەڕووداوێکی هاوشێوەدا ساڵی ٢٠١٥، تیمێک لە توێژەرانی زانکۆی کالیفۆرنیا هەستان بەڕاگەیاندنی بوونی هەندێک نیشانەی سەرو جینی (*) کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لای پیاوان کاریگەریان هەیە لەسەر هاورەگەزبازی. گۆڤاری سروشت (Nature)ی بەناوبانگ هەستا بە گەرمی پێشوازی لەو هەواڵە کرد، بەدوای ئەودا چەندین پێگەی زانستی ئەلیکترۆنی هەواڵەکەیان بڵاوکردەوە. بەڵام هەندێک لە لێکۆڵەرەوان هەستان بە پێداچوونەوەی توێژینەوەکە و هەندێک هەڵەیان بەرچاو کەوت کە بەڕاستزانی تەواوی لێکۆڵینەوەکە دەخاتە ژێر پرسیار، نووسەری زانستی بەریتانی ئێد یۆنگ بەشێک لەو هەڵانەی دەرخستووە و ڕوونی کردەوە کە تیمی توێژینەوەکە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە تاقیکردنەوەیان دوورخستوەتەوە و هەندێکی تریان هەڵبژاردووە بۆ هاوڕابوون لەگەڵ ئەو لۆگۆریتمانەی توێژینەوەکە کە پێشتر لەلایەن تیمی توێژینەوەکەوە دانرابوون، ئەمە جگەلەوەی توێژینەوەکە تەنها پشتی بە ٤٧ دوانە (جمک) بەستووە بۆ توێژینەوە، ئەمەش ژمارەیەکی زۆر کەمە و بەس نییە بۆ گشتاندنی توێژینەوەکە یان تەنانەت بۆ دووبارە تاقیکردنەوەی، چونکە گەرەنتی هێزی ئاماریی (Statistical Power) پێویست ناکات، پاشان بە نارەزایەتییەوە وتی: «بەپێی ئەو ستراتیژەی کە لەلایەن ئەم تیمی توێژینەوەیەوە پەرەی پێدراوە، چانسی بەدەستهێنانی ئەنجامی ئەرێنی بریتییە لە ڕێکەوتی هەرەمەکیی».

لە چوارچێوەی هەمان توێژینەوەدا، جۆن گریلی زانای جینات ڕەخنەی لە توێژینەوەکە گرتووە و گەیشتووەتە ئەوەی سەرۆکی تیمی توێژەرەوان خۆیان کە دانیان بەوەدا ناوە توێژینەوەکەیان لەڕووی زانستی و ئامارییەوە ناتەواوە، پاشان گریلی دەڵێت: «کێشەی توێژینەوەکانی سەروو جینات تەنها پەیوەست نییە بەم توێژینەوە هەژارەوە، بەڵکو کێشەیەکی سیستەمییە و، ناتوانرێت هۆکارە کیمیاوییەکان بەشێوەیەکی میکانیکی بە ڕەفتارێکی دیاریکراو ببەسترێتەوە، چونکە پەیوەندییەکە مانای هۆکاربوون ناگەیەنێت.»

## توێژینەوە جینییەکانی ڕەفتاری سێکسی

دوور لەو توێژینەوانەی کە لە ڕاگەیاندنەکاندا زۆر بانگەشەی بۆ دەکرا، تیمێک لە توێژەرانی زانکۆی نۆرس ویستەرن لە ساڵی ٢٠١٤ توێژینەوەیەکی زانستییان ئەنجامدا کە دی ئێن ئەی ٤٠٠ پیاوی هاوڕەگەزبازیان پشکنی. توێژەران نەیانتوانی یەک جین بدۆزنەوە کە بەرپرس بێت لە ئاڕاستەی سێکسییان، رایانگەیاند کە «جینەکان یان ئەوەتا بەس نین، یاخود پێویست نین بۆئەوەی هیچ کام لە پیاوەکان وا لێ بکەن هاوڕەگەزبازی ئەنجام بدەن». پرۆفیسۆری جیناتی ئەمریکی ئالان ساندەرز لەسەر ئەم توێژینەوەیە دەڵێت: «جینەکان تەواوی چیرۆکەکە نین، شتەکە بەوشێوەیە نییە».

بەڵام ئایا توێژینەوە پەیوەندارەکان بە هاوڕەگەزبازی هاوشێوەی توێژینەوەکانی پەیوەست بەنەخۆشییە ئۆرگانییەکانە؟! وادیارە ئەمە وا نییە، گەڕان بەدوای جینی هاوڕەگەزبازیدا کێشەیەکی گەورەی تێدایە، ئەو کێشە گەورەیە بریتییە لەوەی توێژینەوە جینی-ڕەفتارەکان (Behavioral Genetics) بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە ڕەفتاری مرۆڤ دیاری ناکات، وەک ئەوەی جینێکی تایبەت نەخۆشییەکی دیاریکراو دیاری دەکات. دۆگلاس ئابۆت، مامۆستای توێژینەوەی خێزان لە زانکۆی نێبراسکا، ئەم کێشەیە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: زۆر کەس پێیان وایە جینەکان دەبنە هۆی ڕەفتاری دەروونی ئاڵۆز، بەڵام ئەمە وانییە، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەو ڕەفتارانە لە ئەنجامی کاریگەریی بۆماوەیی (جینی) کارلێککردوو لەگەڵ هۆکارە ژینگەییەکان و ئیرادەی ئازادی مرۆڤ دروست دەبێت.. کاتێک سەردێڕی ڕۆژنامەکان دەخوێنینەوە: (جینی X دەبێتە هۆی ڕەفتار Y)، ئەمە زیادەڕەوییەکە کە کەسانی سادە باوەڕیان پێی هەیە، چونکە جینەکان ڕاستەوخۆ نابنە هۆی ڕەفتار، بەڵکو جینەکان کۆدی ئەو پرۆتینانە دروست دەکەن کە لەڕێگەی زنجیرەیەکی درێژی پرۆسەی بایۆکیمیاییەوە هەیانە، لەکۆتایی کارەکەدا هەندێک کاریگەری لەسەر ڕەفتار دروست دەکات». پاشان دۆگلاس دەڵێت: «بازدان لە جینێکی پێناسەکراوەوە بۆ ڕەفتارێکی دیاریکراو کارێکی زۆر تێکەڵ و ئاڵۆزە».

بۆیە پێدەچێت پرۆسەی بەستنەوەی جین بە ڕەفتارەوە زۆر قورس بێت، بەوپێیەی هاوشێوەی گەڕان بەدوای جینێکدا نییە کە بەرپرس بێت لە نەخۆشییە فیزیۆلۆژییەکان کە تایبەتمەندی ئۆرگانیکی دیاریکراویان هەبێت کە بتوانرێت بەڕوونی لەناو جەستەی زیندەوەران چاودێری بکرێت، بەڵکو گومان و دوودڵییەکی زۆر لەخۆ دەگرێت، وەک پرۆفیسۆری بایۆلۆجی «ئیڤان باڵبان» هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونی «دۆگلاس ئابۆت» و جەختی لەسەر دەکاتەوە: «تەواو ئەستەمە ئەو جینانە دەستنیشان بکرێت کە بەرپرسیارن

لە تێکچوونەکانی ڕەفتار، بۆ نموونە هۆگربوونی کحول ناتوانرێت بەشێوەیەکی بێ دوو دڵی دیاری بکرێت، هەروەها ڕەفتارێک کە بەهۆی چەندین هۆکاری ژینگەییەوە دروست دەبێت نەک تەنها یەک جین».

جینەکان لەژێر وردبینی ڕێژەی هاوڕەگەزبازیدا دامەزراوەی (یەک لە دە) (One in Ten) لەپاڵ دەیان دامەزراوە و پلاتفۆرمی دیکەدا، هەڵدەستن بە گشتاندنی ئەو بیرۆکەیە کە ١٠٪ی دانیشتووان بە سروشتی خۆیان هاوڕەگەزبازن. بەڵام ئایا ئەم ڕێژەیە ڕاستەقینەیە؟ تا ساڵی ٢٠١٠ زیاتر لە سی ڕاپرسی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا ئەنجامدرابوو بۆ دیاریکردنی ڕێژەی هاوڕەگەزبازان، هیچ یەکێک لەو توێژینەوانە لە ١٠٪ نزیک نەبووەوە، بەڵکو هەموو ڕێژەکان لە نێوان ٢-٣٪دا بوون.

**زۆرێك لە زانایان بۆچوونیان وایە بەڵگەهێنانەوە بە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لای ئاژەڵ بۆ بەڕاست نیشاندانی زگماکبوونی ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی لای مرۆڤ بەڵگە هێنانەوەیەکی هەڵەیە**

لە توێژینەوەیەکدا کە لەلایەن پرۆفیسۆری کۆمەڵناسی ئەمیباتلەرەوە بڵاوکراوەتەوە، تێیدا پێداچوونەوەی هەموو ئەو ڕاپرسییانەی کردووە لە ساڵی ١٩٨٨ەوە باسیان لە ڕێژەی ئەو کەسانە کردووە کە لە ئەمریکادا هاوبەشی هاوڕەگەزبازیان هەبووە، توێژەرەکە بۆی دەرکەوتووە کە ڕێژەکان لە ساڵی ١٩٩١ی زایینی بەدواوە دوو هێندە زیاد دەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە میدیا و هۆکارە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان ڕۆڵێکی سەرەکییان هەیە لە دیاریکردنی ئاڕاستەی سێکسیدا، ئەگەر هاوڕەگەزبازی تەنها بەهۆی جینەوە بووایە، ئەوا ڕێژەکان بە بەردەوامی وەک خۆیان بەنەگۆڕی دەمانەوە.

یەکێک لە ڕاستییە سەرنجڕاکێشەکان ئەوەیە کە ڕێژەی هاوڕەگەزبازی بەشێوەیەکی بەرچاو بەرز دەبێتەوە و، هەندێکجاریش ڕێژەی پێوانەیی لە نێو کەنیسەکانی ڕۆژئاوادا تۆمار دەکات، قەشەی ئەسقەفی ئەمریکی «مالکۆم بۆید» دەڵێت: «ئەو لە مەدرەسەی

کڵێساکاندا زیاتر ڕووبەڕوی هاوڕەگەزبازی بووەتەوە لەوەی لە ژیانیدا لە هۆلیوود ڕووبەڕوویان بووەتەوە».

لە ساڵی ٢٠٠٠ ڕۆژنامەی تایمزی بەریتانی ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە ئەوەی تێدا خرابووە ڕوو کە مردن بەهۆی ئایدز (AIDS) لەنێو ڕۆحانییە مەسیحییەکانی ئەمریکادا ١٠ هێندە زیاترە لە مردن بە هەمان نەخۆشی لە دانیشتووان بەگشتی. هەندێک ڕاپۆرت هەیە کە باس لە بەرزبوونەوەی گەورەی هاوڕەگەزبازی لە کۆلێژەکانی ئیلاهیاتی ئەمریکیدا دەکات، هەندێکجار دەگاتە ٣٠٪ی کۆمەڵگەی زانکۆکانی ئەوێ. پێویست ناکات ئاماژە بەوە بکەین کە ئەم ڕێژانە ئەوە دەگەیەنێت کە داپڵۆشێنەری فاکتەرە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە جین و سروشتی مرۆڤەوە نییە.

## هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی هاوڕەگەزبازی

چی دەبوو ئەگەر تەنها جینەکان بەرپرس بوونایە لە ڕەفتاری هاوڕەگەزبازی؟ بە گریمانەکردنی ئەمە، ئەوا جینەکان بە تەنها، سەرەڕای ئەوەی، بەدەر لە فاکتەرە ژینگەیی و کۆمەڵایەتییەکان کار ناکەن، چونکە سروشتی کاری جینەکان وەهایە بەشێوەیەکی بەردەوام لەگەڵ ژینگەی کۆمەڵایەتیدا تێکەڵ دەبێت تا ئەو کاتەی کاریگەرییەکانیان بەشێوەیەکی دیاریکراو دێتەدی.

دەیڤید شێنک، نووسەری زانستی ئەمریکی ئەم بابەتە ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: «وێڕای ئەوەی جینەکان وەک هێلکاری تەواوکەرن، جینەکان وەک دوگمە و کۆنترۆڵی دەنگ لە ستۆدیۆکانی تۆمارکردندا وایە، ئێمە ڕاستەوخۆ لە جینەکانمانەوە سیفەتەکان وەرناگرین، بەڵکو ئێمە لە ڕێگەی پرۆسەی داینامیکی جینەکانەوە سیفەتەکان پەرەپێدەدەین بۆئەوەی جین و ژینگەی کۆمەڵایەتی کارلێک بکەن پێکەوە». پاشان قسەکانی بەوە کۆتایی پێدەهێنێت و دەڵێت: «لە جیهانی کارلێکی نێوان جینەکان و ژینگەدا، هێشتا جیاوازییە جینییەکان بەشێوەیەکی مەرکەزی گرنگن، بەڵام بە تەنیا: جینەکان ئەوە دیاری ناکەن کە ئێمە کێین».

بە پرسیارکردن سەبارەت بەڕادەی زیندوویێتی جینەکان بۆ ئاڕاستەی سێکسی – ئەگەر هەبێت – ئەوا هەردوو برا (وایت هێد) دەڵێن کە ڕاکێشانی هاوڕەگەزبازی: «دەتوانرێت لەڕووی جینییەوە ١٠٪ کاریگەری لەسەر بێت، بەڵام ئەم کاریگەرییە ناڕاستەوخۆ و لاوازە. بۆ نموونە: ئەو جینانەی وا دەکەن پیاو بەرز بێت مەرج نییە بتوانن یاریزانێکی باسکە بەرهەم بهێنن».

سەبارەت بەو هۆکارە کۆمەڵایەتیانەی کە کاریگەرییان لەسەر مەیلی هاوڕەگەزبازی

هەیە، زۆر و جۆراوجۆرن، توێژینەوەیەک دەریدەخات کە نەبوونی باوک یان دایک وا دەکات ڕێژەی هاوڕەگەزبازی لە ٢٠٪ زیاتر بێت. لە توێژینەوەیەکی دیکەدا ٨٤٪ی هاوڕەگەزبازەکان دانیان بەوەدا ناوە کە باوکیان بێباک بووە و کاتێ منداڵ بوون هیچ گرنگی پێنەداون، لەکاتێکدا ئەو ڕێژەیە ١٠٪ بووە لای جیاڕەگەزەکان (واتە ئەوانەی سێکس لەگەڵ ڕەگەزەکەی تردا دەکەن).

سەبارەت بە هاوڕێیەتی لە منداڵیدا، توێژینەوەکان دەریانخستووە کە زۆرجار هاوڕەگەزبازەکان هاوڕێی هاوڕەگەزیان کەم بووە و لەلایەن گرووپە گەورەکانی هاوڕەگەزیانەوە ڕەتدەکرانەوە. لە ئەنجامی تێکچوونی خێزان یان بەهۆی ئەوەی ژینگە کۆمەڵایەتییان پێیان ڕازی نەبووە، حاڵەتێکی دیاری نەکردنی ڕەگەزیی (Gender Non-Conformity) لەلای هەندێک لە منداڵاندا دەردەکەوێت، ئەمەش بە ڕێژەی ١٥٪ بەشدارە لە مەیلیان بۆ هاوڕەگەزبازیی، بەتایبەت ئەگەر ئەم تێکچوونە دەستدرێژی سێکسی بۆ سەر منداڵان لەگەڵدا بێت ئەو کاتەی تەمەنیان بچووک بووە.

---

(*) هۆکارە سەرو -جینییەکان (Epigenetic Markers) بریتییە لەو گۆڕانکارییە کیمیاییانەی کە کاریگەری نییە لەسەر پێکهاتەی ترشی ناوەکی.

سەرچاوە: الجزيرة.

**د.هێمن خورشید، پسپۆڕی تەندروستی دەروونی**

# هۆمۆ زیان بە نزیکترین کەسی خۆی دەگەیەنێ



**سازدانی: ئازاد جەلال**

**د. هێمن خورشید . پسپۆڕی تەندروستی دەروونی لەبارەی لادانی سێکسییەوە ئاماژە بە چەمکی زاراوەکە دەدا و بۆچوونی وایە هۆکاری ئەوەی کە گەنجان تووشی ئەم حاڵەتە دەبن، ئەوەیە گەنج مەیلی سێکسی زۆرە و لە خاڵەتی هەڵچووندایە«، زیاتر دەڵێ: چارەسەرکردنی لادانی سێکسی ئاسان نییە، بەتایبەت ئەوانەی ماوەیەکی زۆر بێت تووش بووبن...**

**پرسیار: هۆمۆ چییە؟**

وەڵام: وشەی (هۆمۆ) دوو واتای هەس، یەک گریکی و یەک لاتینی، لاتینییەکە بەواتای (مرۆڤ) یان (پیاو) دێت، گریکییەکە لە (هۆمۆس)ەوە داتاشراوە و مانای (دەروون) دەدات، ئەوەی جەنابت مەبەستتە (هۆمۆسێکچوالیتیی)ە (Homosexuality)، ئەم وشەیە تێکەڵەیەکە لەگریکی و لاتینی، یەکەم وشەی واتە (هۆمۆ) لەمانا گریکییەکەیەوە نزیکترە، هۆمۆسێکچواڵیتی هەموو جۆرەکانی هاوڕەگەزبازی (نێر- نێر) و (مێ - مێ) دەگرێتەوە، وەلێ ئێستا وایلێهاتووە لەگەڵ بیستنیدا، بیری گوێگر بۆ لای پەیوەندیی زایەندیی (نێر - نێر) دەڕوات، لەزمانی ئینگلیزیدا وشەی گەی (Gay)یش بۆ ئەم جۆرە پەیوەندییە بەکاردەهێنرێت، لەزمانی عەرەبیدا هەردوو وشەی (لواطە) و (سدومی) بەم مانایە بەکاردەهێنرێن، هۆکاری ناونانیشی بەم دوو ناوە، یەکەمیان: دەگەڕێتەوە بۆ هۆزی (لوط) پەیامبەر کە ئەم کارەیان لەنێو خۆیاندا ئەنجامدەدا، دووەمیشیان: بۆ شاری (سدوم) کە شوێنی هۆزی (لوط) بووە. لەکوردییدا وشەی (نێربازی) لەزمانی نووسیندا بۆ ئەم پەیوەندییە بەکاردێت و لەزمانی بازاڕییشدا چەندین وشەی بۆ دانراوە، لەوانە (دوودەکی) و...هتد. لە ڕووی واتاوە، بریتییە لە مەیلی ڕەگەزی نێر بۆ ئەنجامدانی کرداری زایەندیی لەگەڵ هەمان ڕەگەزی خۆیدا.

بەرانبەرەکەیشی وشەی (لیزبیانیزم)ە (Lesbianism)، کە بۆ پەیوەندیی هاوڕەگەزبازیی نێوان (مێ - مێ) بەکاردەهێنرێت و بنەماکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوورگەی (Lesbos)ی یۆنانی، کە کاتی خۆی ژنە شاعیرێک بەناوی (سافۆ) تێیدا ژیاوە و شیعری بۆ هەمان ڕەگەزی خۆی واتە ئافرەت هۆنیوەتەوە، هەر بەوهۆیەوە (سافیزم)یشی (Saphism) پێدەوترێت.

**پ: دەتوانین بڵێین: توشبوون بەلادانی سێکسی (هۆمۆسێکچواڵیتی) خووە؟ واتە زۆرێکیان لەسەر ئەو کارە ڕاهاتوون؟**

وەڵام: سەرەتا با ئەوەت پێ بڵێم، لادانی سێکسی هاو واتا نییە لەگەڵ وشەی هۆمۆسێکچواڵیتیدا، لادانی سێکسی بریتییە لەکۆی ئەو مەیلە سێکسییانەی کە لەدیدی کۆمەڵگە و زۆربەی مرۆڤەکانەوە نائاسایین، بەکورتی هەر پەیوەندییەکی سێکسی لەدەرەوەی پەیوەندیی (نێر- مێ) لەژێر ئەو زاراوەیەدا جیادەکرێتەوە. هەندێک لە توێژەران وای بۆ دەچن کە هۆمۆسێکچواڵیتی مەرج نییە تەنها خوو بێت، لەم ساڵانەی دواییدا توێژینەوە گەلێکی زۆر ئەنجامدراون بۆ گەیشتن بەئەنجامێک دەربارەی ئەوەی داخۆ ئەم مەیلە هیچ بنەمایەکی بایۆلۆژی، یان کیمیایی (هۆرمۆنی) هەبێت؟ تا ئێستا ئەنجامێکی ئەوتۆ دەستنەکەوتووە، بەڵام توێژینەوەکان هێشتا بەردەوامن، لەئەنجامی ئەو توێژینەوانەوە



**له توێژینەوەیەکی تازەدا کە لە بریتانیا ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە کەسانی هۆمۆسێکچواڵ بە بەراورد بە خەڵکی ئاسایی، ٥٠٪ زیاتر تووشی خەمۆکی دەبن و پەنا وەبەر مادەی هۆشبەر دەبەن، هەر لەو توێژینەوەیەدا هاتووە: ڕێژەی خۆکوژی لەنێو هۆمۆسێکچواڵەکاندا لە ٢٠٠٪ بەرزترە**

زانایان شتێکی سەیریان دۆزییەوە، ئەویش بوونی پەیوەندیی هاوڕەگەزبازییە لەنێوان زۆرێک لە ئاژەڵان و پەلەوەراندا، چەشنی: (شێر، فیل، دۆلفین، زەڕافە، نەورەس...هتد).

**پ: هۆکارەکانی لادانی سێکسی چین؟**

وەڵام: وەک (دۆگلاس تۆم) دەڵێت: «هۆی هەرە زۆری ئەو گرفتارییە سێکسییانەی گەورە و گچکە تووشی دەبن، بوونی ئەزموونی خراپی سێکسییە لەژیانیاندا». هەڵبەت لادانی سێکسی لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی دی پێناسەکەی دەگۆڕێت، هەندێ لەو لادانانە هیچ زیانێکیان بۆ دەوروبەری کەسی تووشبوو نییە، وەک چێژبینین لە جلوبەرگی ڕەگەزی بەرانبەر (فێتیشیزم)، یان خووە نهێنی (Masturbation)، بەڵام هەر بە لادان دادەنرێت. هۆکاری زۆر لە پشت لادانی سێکسییەوە هەن، لەوانە:

یەکەم: تێکچوونی دەروونی لەئەنجامی بوونی کەموکورتی لە هەندێ دەستگای لەشدا، وەک خودە کۆئەندامی دەمار، کۆئەندامی زاوزێ، کەموکورتی لە ڕژێنەکاندا، باڵغبوونی پێشوەخت، یان درەنگ وەخت، کەمایەسی لەبوونی ئاکارە زایەندییە لاوەکییەکاندا، هەروەها ئەو گرفتانەی لێیانەوە دەکەوێتەوە، وەک وەڕەزبوون و دڵەڕاوکێ و..هتد. هەروەها کەمی یان نەبوونی پەروەردەیەکی سێکسی دروست، دواکەوتنی هاوسەرگیری، منداڵنەبوون دوای هاوسەرگیری، جیابوونەوە...هتد.

دووەم: تێکچوونی بۆماوەیی، وەک زاڵبوونی ڕەگەزێک بەسەر ئەویتردا.

سێیەم: هۆکاری ئەندامی، وەک نەخۆشی درێژخایەن، ناتەواویی ئەقڵی، کەموکورتیی جەستەیی و ..هتد.

چوارەم: هۆکاری دەروونی، وەک: ترسان لە سێکس، بێ ئومێدبوون لە سێکس کردن،

هەستنەکردن بەچێژی سێکسی، بوونی بەربەست لەبەردەم پەیوەندیی سێکسیدا، بوونی ئەزموونی سێکسیی خراپ و نەریتی نادروست لە ژیانی تاکدا... کە وا لە مرۆڤ دەکەن سێکس وەک سەرچاوەیەک ببینێت بۆ ئەو چێژەی لێی ونبووە.

پێنجەم: هۆکاری ژینگەیی و ژیاریی و ڕۆشنبیریی و دۆخی ئابووری کەسەکە و ئەو ژینگە خێزانییەی تێیدا پەروەردە بووە و بوون و نەبوونی ورووژێنەری سێکسی لە دەوروبەریدا.

**پ: بۆچی گەنجان تووشی لادانی سێکسی دەبن؟**

وەڵام: لەبەر چەند هۆیەک:

یەکەم: گەنج یان با بڵێین مێرد منداڵ ـ کە لای خۆمان بەهەڵە پێی دەوترێت هەرزەکار ـ وریاییەکی تەواوی بەدەوروبەر نییە و پاڵنەری دەروونی، نەک ئەقڵی لێی دەخوڕێت.

دووەم: مەیلی سێکسی لە گەنجدا زۆرە و لە هەڵچوونێکی بەردەوامدایە و بچووکترین ورووژێنەر ڕەنگە بەلاڕێیدا ببات.

سێیەم: زۆرجار تازەلاوان بەیەکەوە و وەک گرووپ دەسووڕێنەوە و دەچنە دەرەوە و گەشت دەکەن و هەستی خۆیان بۆ یەکتر دەردەبڕن و ئەزموونی خۆیان بۆ یەک دەگێڕنەوە، ئەمەیش هەندێ جار سەری لە لادانی سێکسییەوە دەردەچێت.

چوارەم: لە کۆمەڵگە داخراوەکاندا، لەبەر هۆکاری نەریتی و کولتووری، هەردوو ڕەگەزی نێر و مێ بەئاسانی بەیەکتر ناگەن، ئەمەیش وا دەکات بنیادەم و بەتایبەت گەنج، بۆ دامرکاندنەوەی ئارەزووی زایەندیی، بیر لەڕێگەی تر بکاتەوە.

**پ: زۆر گەنج کە تووشی لادانی سێکسی بوون، چارەسەریش وەردەگرن، بەڵام وەک خۆیان دەڵێن: بێسوودە. دەتوانین پێمان بڵێیت بۆ؟**

وەڵام: چارەسەرکردنی لادانی سێکسی ئاسان نییە، بەتایبەت ئەوانەی ماوەیەکی زۆر بێت تووش بووبن، تۆ بڕوانە، کەسێکی ئاسایی کە کەمێک کێشی زیادە و دەیەوێت ڕێژیم بکات و ئێواران نان نەخوات، زۆرجار ناتوانێت، هەندێ جار مانگێک لەسەر ڕێژیمەکەی بەردەوام دەبێت، کەچی لەپڕ خۆی پێ ناگیرێت و دەیشکێنێت. لەوە بەرەو سەر، جگەرەکێشێک کە زۆر لە گیانی خۆی بێزار بووە و دەیەوێت واز لە جگەرەکێشان بێنێت، جاری وا هەیە دەستی خۆی داخ دەکات و خۆی لە ژوورێکدا زیندانی دەکات و ...هتد، کەچی دیسان هەر توانای جڵەوکردنی حەزەکانی نییە و ناتوانێت دەستبەرداری کێشانی جگەرە بێت، لەوەیش بڕۆینە سەرەوە، کەسێک کە خووی بەخواردنەوەی ئەلکهوولەوە گرتووە، وا ڕێکدەکەوێت خزم و کەسوکار و ماڵ و منداڵ و تەنانەت خۆیشی لە دەستی بێزار دەبن، بۆیە بڕیار دەدات دەستبەرداری خواردنەوە بێت، هەڵدەستێت دەچێتە لای




پزیشکێک و خۆی ڕادەستی دەکات، پزیشکەکە لە سەنتەری تایبەتی دەستبەردار بوونی خواردنەوەدا دەیخەوێنێت و  دەرمانی بەگوێرەی خشتەیەکی ڕێکوپێک بۆ دادەنێت و دەیخاتە ژێر چاودێرییەوە، دوو سێ هەفتە چارەسەر وەردەگرێت و تەواو باش دەبێت، کەچی پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵەوە، زۆر نابات دەگەڕێتەوە سەر بەزمەکەی جارانی، لەوەیش بەرەو سەرەوە بێین، خووگرتن بە بەکارهێنانی دەرمان، یان ماددەی هۆشبەرەوە، ئەمەیان قوورەکەی خەستترە و تەرککردنیشی سەختترە.

بە بڕوای من دەستبەرداربوونی لادانی سێکسی لە هەموو ئەوانەی وتم قورسترە، بۆیە بە ڕۆژێک و دوو ڕۆژ دەرمان خواردن، یان گوێگرتن لە پزیشکێکی دەروونی، یاخود دەروونناسێک کارەکە تەواو نابێت، گەرەکە کەسی تووشبوو بەر لەهەر شتێک ئیرادەیەکی پۆلاییینی هەبێت، پاشان بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بدات و وەک چۆن سەربازێکی ڕاستەقینە خۆی بۆ جەنگێکی سەختی دووژمنێکی ترسناک ئامادە دەکات، ئاوها خۆی ئامادە بکات، پاشان خۆی ڕادەستی کەسانێکی بەتوانا بکات، لە دەروون پزیشک و چارەسازی دەروونی و ڕاوێژکاری کۆمەڵایەتی، تا لەو ڕێیەوە چارەسەری درێژخایەنی دەروونی، وەک چارەسەری بە کۆمەڵ و (CBT)ی بۆ ئەنجامبدرێت، پاڵنەری ئایینییشمان لەبیر نەچێت، کۆمەڵگەی ئێمە کۆمەڵگەیەکی ئایینییە و دین کاریگەریی زۆری لەسەر ناخی تاکەکانی هەیە، بۆیە پێویستە سوود لە توانای مامۆستایانی ئایینیی شارەزا و بانگخوازانی بەئەزموونیش وەربگیرێت.

**پ: زۆرێک لە گەنجان کە تەنانەت ئاستی خوێندەوارییشیان بەرزە، دەڵێن ئێمە تاوانبار نین، بەڵکو قوربانین، لە گۆشەنیگای دەروونییەوە ئەو کەسانە چۆن تەماشا دەکرێن؟**

وەڵام: بێگومان بەشێک لەو کەسانەی گرفتاری لادانی سێکسی دەبن تاوانبار نین، بەڵکو قوربانیی ئەو ژینگە و باروودۆخەن کە تێیدا پەروەردە بوون، ئێمە لە گۆشەنیگای دەروونییەوە بەزەییمان بەو جۆرە کەسانەدا دێتەوە و هەوڵدەدەین یارمەتییان بدەین تا لەو دەردە ڕزگاریان بێت، بەمەرجێک خۆیان بە دەردی بزانن و بیانەوێت چارەسەر بکرێن. لە توێژینەوەیەکی تازەدا کە لە بریتانیا ئەنجامدراوە، دەرکەوتووە کەسانی هۆمۆسێکچواڵ بە بەراورد بە خەڵکی ئاسایی، ٥٠٪ زیاتر تووشی خەمۆکی دەبن‌و پەنا وەبەر مادەی هۆشبەر دەبەن، هەر لەو توێژینەوەیەدا هاتووە: ڕێژەی خۆکوژی لەنێو هۆمۆسێکچواڵەکاندا لە ٢٠٠٪ بەرزترە، هەروەها هاتووە: تەمەنی کەسی هۆمۆسێکچواڵ بە بەراورد بە کەسێکی ئاسایی (٢٤) ساڵ کەمترە، سەرباری ئەو هەموو نەخۆشییە جەستەییانەی لە ئەنجامی ئەو کردارەوە پەیدا دەبن، کە دیارترینیان نەخۆشی ئایدز و شێرپەنجەی کۆمە. لە پای چی کەسێک ئەم هەموو ئازارە بچێژێت و ڕەوتی ژیانی لێ

تێکبچێت و کۆمەڵگەیش بەچاوێکی نزمەوە لێی بڕوانێت و خۆیشی بەردەوام ڕقی لەخۆی بێتەوە و تەمەنی کورتببێتەوە و تووشی چەندین نەخۆشی ترسناک ببێت؟ بەدڵنیاییەوە پێویستە کۆمەڵگە دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکات و هەوڵی ڕزگارکردنیان بدات.

**پ: کەس هەیە لە هەرزەکارانی هۆمۆسێکچواڵ سەردانی بەڕێزتانی کردبێت؟ دەتوانیت ڕێژەیەکمان بدەیتێ؟**

وەڵام: لەبەرئەوەی من کلینیکی تایبەتم نییە و هێشتا لە سەرەتای خوێندنی پسپۆڕییەکەمدام، بۆیە کەس لەوان نەهاتوونەتە لام، وەلێ ئەو پسپۆڕانەی کلینیکی خۆیان هەیە، بێگومان خەڵکی لەو جۆرە کەسانە سەردانیان دەکەن و هەندێکیان چارەسەر وەردەگرن. ئەستەمە بتوانین ڕێژە دیاری بکەین، لە ڕۆژئاوایشدا ناتوانرێت ڕێژەی هۆمۆسێکچواڵ دیاری بکرێت، چونکە زۆرێکیان نایانەوێت دەرکەون. چ بگات بە کۆمەڵگەیەکی داخراوی وەک هی خۆمان کە زۆر شتی بەنهێنی تێدا دەگوزەرێت، ئێمە تا ئێستا ڕێژەیەکی وردی دانیشتووانی خۆمانمان نییە و نازانین وڵاتەکەمان چەند کەسی تێدا دەژێت، بەنیازن بزانین ڕێژەی هۆمۆسێکچواڵ چەندە؟ ئەو کارە پێویستی بەماندووبوون و شەونخوونیە، ئاتاجی بوونی سەنتەری تایبەت و ناوەندی توێژینەوە و توێژەر و....هتد، وا بزانم وڵاتی ئێمە هێشتا زۆری ماوە بۆ ئەوە.

**پ: هۆرمۆن لەم نیوەندەدا ڕۆڵی چییە؟ بۆچی پشکنینی هۆرمۆن بۆ ئەو گەنجانە دەکرێت؟**

وەڵام: لە ساڵانی پێشوودا توێژەران توێژینەوە گەلێکیان ئەنجامداوە، بۆ گەیشتن بەوەی ئایا ڕاستە کەسی تووشبوو بەلادانی سێکسی هەر لە بنەماوە لە خەڵکی ئاسایی جودایە و کەموکورتییەکی ئۆرگانی، یان هۆرمۆنی هەیە؟ لە سەرەتاوە گەیشتن بەوەی مێشکی بنیادەمی لادەر کەمێک جیاوازیی تێدایە، بەتایبەت لە هایپۆسەلەمەسدا (Hypothalamus)، وەلێ تا ئێستایش ئەو بابەتە یەکلایی نەبووەتەوە، هەرچی هۆرمۆنیشە ئەوا هیچ توێژینەوەیەک یەکلایی نەکردووەتەوە ڕۆڵێکی ئەوتۆی هەبێت، دەرکەوتووە هۆرمۆنی باڵغبوون (Pubertal hormone) هیچ ڕۆڵێکی لە هۆمۆسێکچواڵێتیدا نییە، دەوترێت هۆرمۆنی کۆرپەلە (Fetal hormone) لەوانەیە ڕۆڵێکی هەبێت، وەلێ ئەوەیش هێشتا نەسەلمێنراوە. لە هەندێ توێژینەوەی کۆندا دەرکەوتبوو، ئەو کەسەی هۆمۆسێکچواڵ هۆرمۆنی نێرینەی کەمترە لە نێرینەیەکی تر، بۆیە زیاتر وەک مێینەیەک ڕەفتار دەکات و مەیلەکانی لە هی مێینەوە نزیکترن. بۆیە وا نازنم پشکنینی هۆرمۆن لەو ڕووەوە ڕۆڵێکی ئەوتۆی هەبێت.

**پ: ئەو کەسانەی (هۆمۆ)ن زیان بەهەرزەکارانی تر دەگەیەنن؟**

وەڵام: بێگومان زیانیان بۆ دەوروبەریان دەبێت، بەتایبەت بۆ ئەوانەی لێیانەوە نزیکن، ئەگەر هاوتەمەن بن، ئەوا لەوانەیە هاوڕێکانیان تووش بکەن، لە ڕێگەی باسکردن و گێڕانەوەی ڕووداوەکانی ژیانی خۆیانەوە، بەتایبەت کەسانی (لێکراو) زۆر مەترسیدارن، چونکە بەدوای یەکێکدا دەگەڕێن ئارامیان بکاتەوە، بۆیە لە نزیکترین کەسیانەوە دەستپێدەکەن، خۆیشتان دەزانن، تازەلاو لە هەڕەتی کەفوکوڵی سێکسیدایە و لەوانەیە خۆی نەگرێت و لەبەردەم ئارەزوویدا چۆک دابدات. هەروەها کەسانی بەساڵاچوو کە (بکەرن)، بەدوای منداڵ و لووسکەدا دەگەڕێن و دوور نییە زەفەر بەتازەلاوێک کە شاگردییان دەکات لە شوێنێکدا ببەن و تووشی بکەن. لە توێژینەوەکاندا دەرکەوتووە توندوتیژیی ئاژەڵی لە کەسانی هۆمۆسێکچواڵدا دوو ئەوەندەی کەسانی ئاساییە، هەروەها دەرکەوتووە ٢٩٪ی ئەو منداڵانەی باوکانیان هۆمۆیە ڕووبەڕووی دەستدرێژیی سێکسی دەبنەوە لەلایەن باوکەکانیانەوە، بە بەراورد بە تەنها ٠,٦ی ئەو منداڵانەی باوکانیان هۆمۆ نییە و تووشی دەستدرێژیی سێکسی بوون لەلایەن ئەوانەوە.

**پ: زۆر لەو کەسانە دەڵێن ئێمە لە منداڵیدا دەستدرێژیی سێکسیمان کراوەتە سەر، ئایا ئەوە پەیوەندیی بە دۆخی ئێستایانەوە هەیە؟**

وەڵام: وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا ئەو ژینگە و بارودۆخەی کەسەکەی تێدا پەروەردە بووە ڕۆڵی هەیە، وەلێ توێژینەوەکان دەریانخستووە، پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ نییە لە نێوان دەستدرێژیکرانەسەری کاتی منداڵی و هۆمۆسێکچواڵیتیدا، واتە دەشێت کەسێک بەمنداڵی ڕووبەڕووی دەستدرێژییش بووبێتەوە، کەچی کەسێکی ئاسایی لێ دەرچێت، پێچەوانەکەیشی ڕاستە.

**پ: چارەسەر بە دەرمان هیچ کاریگەرییەکی هەیە؟**

وەڵام: لەپێشەوە وتمان زۆرێک لە کەسانی هۆمۆسێکچواڵ تووشی دڵتەنگی و خەمۆکی و دڵەڕاوکێ دەبن، بۆیە پێویستە لەکاتی چارەسەرکردندا ئەو لایەنەمان لەبیرنەچێت، دەرمانی دژە خەمۆکی (Antidepressant)و دەرمانی هێورکەرەوە (Anxiolytic)یان بدرێتێ. هەندێک توێژینەوە باس لەوە دەکەن پێویستە دەرمانێکیان بدرێتێ کە هەستی سێکسییان کەمبکاتەوە، وەلێ بڕوا ناکەم ئەمەی دواییان کاریگەرییەکی ئەوتۆی هەبێت.



د. دیاری أحمد قصاب

# لادانی سێکسی یان هەڵبژاردنی سێکسی

**پاراستنی نەفس و ئەقڵ و نەسل، لە دیارترین مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامە. خوای گەورە دەفەرموێت:** (ثُمَّ جَعَلۡنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ) (الجاثية: ١٨) **(پاشان تۆمان خستە سەر شەریعەتێک لەم ئایینەدا، شوێنی بکەوە و، شوێن ئارەزووی ئەو نەزانانە مەکەوە).**

خوای گەورە ئەنجامدانی فاحیشەی حەرام کردووە، دیار بێت یان پەنهان، وەک دەفەرموێت: (قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ.. (الأعراف: ٣٣) (بڵێ پەروەردگارم ئەو کردەوانەی حەرام کردووە؛ کاری خراپ بە ئاشکرا و بە نهێنی..). تەنانەت خوای گەورە ئەمری کردووە کە مرۆڤ دووربکەروێتەوە لە هەر ڕێگەیەکیش مرۆڤ نزیک بکاتەوە لێیان، بە دەربڕینی (ولا تقربوا): (وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ) (الأنعام: ١٥١).

لەبارەی بەتاڵکردنەوەی پێویستی سێکسیش، خوای گەورە دیاری کردووە، کە دەبێت تەنها لەگەڵ هاوسەری خۆی بێت، ئەوەش کە لادەدات لێی بە لەسنوور دەرچوو ناوی بردووە: ( وَٱلَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَـٰفِظُونَ ۞ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ ۞ فَمَنِ ٱبْتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْعَادُونَ ۞) (المؤمنون: ٥-٧)، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ کەنیزەکیش بێت، کە بە یاسای خۆی و لە کاتی خۆیدا حەڵاڵ بووە، ئەوەش هەر پەیوەندی نێوان نێر و مێیە. کەواتە پەیوەندی نێوان دوو توخمی هاوشێوە، لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، شیاو نییە. گشت شەریعەتە ئاسمانییەکانیش - ئەوانەی کە بەردەست دەکەون – کۆدەنگن لەسەر مەحرومکردنی پەیوەندی سێکسی لە نێوان هاوڕەگەزبازاندا، یان نێوان مرۆڤ و ئاژەڵدا.. تەنها یەک جۆری پەیوەندیان ڕێپێداوە، ئەویش لە نێوان دوو توخمی جیاوازدایە، دیارە ئەویش بە ڕێگا دروستەکانی خۆی..

خوای گەورەش تەنها پاکەکان وەردەگرێت. زانستیش، بە هەردوو جۆری مرۆیی و ئەزموونییەوە، گەر بە ئازادیی بدوێن، هەمان ڕایان دەبێت! بەڵام هەندێک جار لەبەر بوونی فشار، یان بەرژەوەندی چەند گرووپێک، یان شوێنکەوتنی بێسنووری ئارەزووەکان، مرۆڤەکان لەو هێڵە ئاشکرا و ڕوونەی فیترەت لادەدەن، بەڵام، بە درێژایی مێژوو، بیرمەندان و دانایان و چاکسازان دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردۆتەوە و خەمی مرۆڤایەتیان خواردووە لەوەی بکەوێتە زەلکاوی ئارەزوو و نەفامییەوە. گەڕانەوەش بۆ فیترەتە جوانەکەی مرۆڤ، بێگومان، مایەی خۆشگوزەرانیی و کامەرانیی مرۆڤەکانە (فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا) (الروم: ٣٠).

لادانی سێکسی چەندین جۆرە، بەڵام ئەوانەی لە توێژینەوە زانستییەکاندا زۆر باسیان لێوە دەکرێن، گرنگترینیان بریتین لە: پەیوەندی نێوان دوو نێر (نێربازی: هاوڕەگەزبازی) (اللواطة) (Homosexual)، پەیوەندی نێوان دوو مێ (لیسبیان) (السحاق) (Lesbian)، سێکس کردن لەگەڵ هەردوو توخمدا (بایسێکچواڵ) (bisexual) و ڕەگەز گۆڕراو (transgender)، کە بە کورتکراویی پێی دەوترێت (LGBT) . لەم دوواییەشدا پیتی تری بۆ زیاد کراوە، کە ئاماژەیە بۆ جۆری مومارەسەی سێکسی جیاواز، وەک (+LGBTIQ). (I=intersex): واتە ئەوانەی کە کۆئەندامی زاوزێیان تێکەڵە (نێرەموک).. (Q=Queer) بەکاردێت بۆ ئەوانەی نایانەوێت تەعبیر لە جۆری هەڵبژاردنی سێکسیان بکەنەوە، یان

بەتەواوەتی بڕیاریان نەداوە. ئەو (+)ەش، واتە بەردەوام جۆری هەڵبژاردنی سێکسی لە زیادبووندایە، وەک: (asexual) واتە لەوانەیە مەیلی سۆزداری هەبێت بەرامبەر یەکێک، بەڵام سێکسیان لەگەڵ ئەنجام نادات، (Pansexual) واتە لەگەڵ هەموو جۆرەکان سێکس دەکات!! نازانین تا کوێ مرۆڤایەتی خەریکی ئەم پۆلێنکردنانە دەبێت!؟

فەیلەسوفان و پزیشکان لە مێژەوە ویستوویانە لە سرووشتی مومارەسە سێکسییە نائاساییەکان تێبگەن و تیۆرەکانی بۆ دابنێن. هەندێک پێیان وابووە کە ئارەزووە سێکسییەکان هەروابوون لە مێژەوە و نەگۆڕاون.. هەندێک وتوویانە تەنها چوارچێوەکەی گۆڕاوە، جاران سەرکوت کراون، بەڵام دووایی توانیویانە ئەو حەزانە دەرببڕن.. لە ناوەڕاستی سەدەی پێشووشدا هەندێک پێیانوابوو کە ئەوانە سرووشتین و مومارەسەیەکی دروستن، بەڵام عورف و بەهاکان گۆڕاون لە کۆمەڵگە جیاکان، لە کاتە جیاکاندا.. هەتا لای هەندێک وابووە کە هەندێک لەو مومارەسە سێکسییانە بەهۆی پێشکەوتنی بۆچوونە یاسایی و پزیشکییەکانەوە بەدیهێنراون.. هەندێک، بەتایبەتی لەم سەردەمەدا پێیانوایە هاوڕەگەزبازی سرووشتییە و ئەوانە هەر لە منداڵییەوە بەوجۆرە بوون و جۆرێکە لە جیاوازیی لە نێوان مرۆڤەکاندا، وەک چۆن یەکێک دەستی چەپی بەکاردەهێنێت و یەکێک ڕاست[1].

«ڕێبەری ناسینەوە و ئامارکردنی تێکچوونە دەروونییەکان» کە «کۆمەڵەی پزیشکانی دەروونی ئەمریکی» (APA) دەریدەکەن، کە تیایدا نەخۆشییە دەروونییەکان دیاری دەکرێن و ئامار دەکرێن، پاشان پۆلێن دەکرێن. یەکەم چاپی (DSM–I)، لە ساڵی (١٩٥٢) بڵاوکرایەوە[2]. تا چاپی دووەمیش (DSM–II)، لە ساڵی (١٩٧٣)دا، «هاوڕەگەزبازی» بە تێکچوونی دەروونی دانراوە[3]، بەڵام لە چاپی سێیەمیدا (DSM–III)، لە ساڵی (١٩٨٠) – لەبەر هۆکاری سیاسیی و ئابووری، دوای بەرهەڵستییەکی بەهێز لەلایەن چالاکوانی هاوڕەگەزبازی ناو کۆمەڵەکە – بڕیاریاندا کە «هاوڕەگەزبازی» بە حاڵەتێکی ئاسایی دابنرێت، کە مرۆڤ سەرپشکە لە هەڵبژاردنی ئەو جۆرە مومارەسەیە، ئەمەش بە مانای ئەوە دێت کە هاوڕەگەزبازان نابێت بە نەخۆش سەیر بکەین، یان داوایان لێ بکرێت کە

---

**1. Kinsey AC, Pomeroy WR, Martin CE. Sexual behavior in the human male. American Journal of Public Health. 2003 Jun;93(6):894-8.**

**Kinsey AC, Pomeroy WB, Martin CE, Gebhard PH. Sexual behavior in the human female. Indiana University Press; 1998 May 22.**

هەروەها: Kinsey AC, Pomeroy WB, Martin CE, Gebhard PH. Sexual behavior in the human female. Indiana University Press; 1998 May 22.

**2. De Block A, Adriaens PR. Pathologizing sexual deviance: A history. Journal of sex research. 2013 Apr 1;50(3-4):276-98.**

**3. Krafft-Ebing, R. Psychopathia Sexualis; Wedeck. H., Trans.; Putnam: New York, NY, USA, 1965.**







**به درێژایی مێژوو، بیرمەندان و دانایان و چاکسازان دەنگی نارەزاییان بەرزکردۆتەوە و خەمی مرۆڤایەتیان خواردووە لەوەی بکەوێتە زەلکاوی ئارەزوو و نەفامییەوە.**

چارەسەری دەروونی وەربگرن[١].

ئەوەی کە لە کتێبەکانی تەندرووستی دەروونیدا ماون لە لادانە جینسیەکاندا وەک نەخۆشی، بریتین لە ڕەگەزگۆڕراو (transgender)، منالبازی (Pedophilia)، ماشۆچیزم (Masochism) و سادیزم (Sadism)، بەڵام نێربازی، لێسبیان و بایسێکچوال وەک نەخۆشی نەماون، بەڵکو ئەو جۆرە مرۆڤانە سەربەستن لە هەڵبژاردنی ئەو مومارەسە سێکسییەی کە دەیانەوێت!! ئەمە جگە لە ئەسێکچوال و پانسێکچوال..هتد. هەروەها ئەو گرفتە سێکسیانەی تریش کە پەیوەندی بە تێکچوونی لایەنی لاشەییەوە هەیە باسکراون.

منداڵبازی (الغلمانية) (Pedophilia): بریتییە لە حەزی سێکس کردن لەگەڵ منداڵدا، لە هەمان توخم یان توخمی بەرامبەر. ژمارەیان بە تەواوەتی نەزانراون، دەگاتە نزیکی (٣- ٥٪) لە نێرینەکاندا، لە مێینەکاندا کەمتریش زانراوە[٢]. تا ئێستا بە پشێوی دەروونی دادەنرێت، بەڵام هەوڵ دەدرێت لە پسێۆرییە دەروونییەکان دەربهێنرێت!

ئاژەڵبازیی (البهيمية) (Bestiality): بریتییە لە سێکس کردن لەگەڵ ئاژەڵاندا. لە تێژینەوەیەکدا ساڵی ١٩٧٤ کراوە، باس لەوە دەکات کە (٣- ٨٪)ی دانیشتوانی ئەمریکا تووشی سێکس ئەنجامدان بوون لەگەڵ ئاژەڵدا[٣].

هەوڵ دراوە هۆکاری هاوڕەگەزبازی بگەڕێننەوە بۆ بوونی کرۆمۆسۆمی تایبەت لە هاوڕەگەزبازەکاندا، وەک ساڵی ٢٠٠٤ لە ڕۆژنامەی ئیندپێندێنتی بەریتانیدا بڵاوکرایەوە[٤]،

1. Drescher J. Out of DSM: Depathologizing homosexuality. Behavioral sciences. 2015 Dec 4;5(4):565-75.
2. Diagnostic and Statistical Manual of Mental Disorders, 5th edition DSM-5th, American Psychiatric Association, 2013, p698.
3. Hunt M. Sexual behavior in the 1970s.
4.https://www.independent.co.uk/news/science/largest-ever-study-into-the-gay-gene-erodes-the-

کە گوایە ئەو هاوڕەگەزبازانە هیچ دەستیان نییە لە تووشبوونیان بەو (نەخۆشییە) جەستەییە کە بەهۆی هۆکاری بۆماوەییەوە تووشی هاتوون و هیچ بژاردەیەکی خۆیانی تێدا نییە تا بە تاوانبار دابنرێن! وەک نیل وایتهید و بریار وایتهید، لە بابەتی (جینەکانم وای لێ کردم ئەوە بکەم) دەڵێن: «بەڕاستی وڵاتانی ڕۆژئاوا بابەتێک بوو بۆ هەڵمەتی گومڕاکردن و هەڵخەڵەتاندن لەم بیست سی ساڵەی دواییدا، وای لە دامەزراوە گشتییەکان، یاسا دانەران، دادوەران، کەنیسەکان و تەنانەت پسپۆڕییە تەندروستییەکانیش کرد، بەشێوەیەکی فراوان باوەڕیان بەوە هێنا کە هاوڕەگەزبازی بۆماوەییە و ناتوانرێ بگۆڕدرێ»[1].

هەر بۆ زانینیش، تەنها لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بەپێی کۆمپانیای گالوپ (Gallup)ی ئەمریکی، ڕێژەی ئەوانەی لادانی جینسیان هەیە گەشتوونەتە (٧.١٪)، لەکاتێکدا ڕێژەکەیان (٤.٥٪) بوو لە ساڵی ٢٠١٧دا، لە ٢٠١٢دا (٣.٥٪) بوو[2].

لادانی سێکسی گرفت و دەرەنجامی کۆمەڵایەتی و دەروونی زۆری هەیە، بەڵام، وەک پزیشکێکی نەشتەرگار، ئاماژە بە دەرەنجامەکانی لادانی سێکسی لە لایەنی جەستەییەوە دەکەم..

نێربازیک بەو لادانە دەوترێت کە نێر واز لە مەیلە سرووشتییەکی خۆی دەهێنێت بۆ توخمی بەرامبەر، لە جیاتی ئەوە مەیل و ئارەزووی بەرەو هەمان توخمە.. کە دیارە لە ئیسلامدا ڕێ پێنەدراوە، هاوکات چونە لای ئافرەتیش لە ڕێگەی کۆمەوە، بە هەمان شێوە لە ئیسلامدا قەدەغەکراوە؛ پێغەمبەر (دروودی خوای لێبێت) دەفەرموێت: «من أتى امرأة في دبرها لم ينظر الله تعالى إليه يوم القيامة»، «ملعون من أتى المرأة في دبرها» (أبو داود)، «لا ينظر الله الى رجل جامع امرأته في دبرها» (أحمد وابن ماجة). با ئافرەت حەڵاڵی مێردەکەشی بێت، بەڵام پیاو تەنها بۆی هەیە لە شوێنی خۆیەوە بچێتە لای خێزانی، کە ئەویش زێیە، کە جگە لەوەی مایەی خۆشی بینینە، شوێنی زاوزێشە، بۆیە خوای گەورە بە (حرث) ناوی هێناوە، واتە (کێڵگە)، کە شوێنی تۆو چاندنە: ﴿نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ (البقرة: ٢٢٣).

لەڕووی زانستییەوە، کۆم ئەندامێکی گرنگی لاشەی مرۆڤە، توێکارییەک و فسیۆلۆجیەکی گەلێک ئاڵۆزی هەیە.. کاری بنەڕەتی کۆم بریتییە لە ڕێکخستنی کرداری خۆبەتاڵکردنەوە و هێشتنەوە و درێژەپێدانی کۆنترۆڵکردن بەسەر خۆدا (خۆڕاگرتن)[3].

---

**notion-that-sexual-orientation-is-a-choice-9875855.html**

1. van den Aardweg GJ. Gay inspiration in the interim report of the bishops' synod.

بڕوانە: (بێتاوانیی جینەکان لە هاوڕەگەزبازیی- هاوڕەگەزبازی، ملکەچیی جینەکانە یان ڕەفتارێکی دەستکەوتووە؟) گۆڤاری هەیڤ، ژمارە (٠٥).

2. **https://news.gallup.com/poll/389792/lgbt-identification-ticks-up.aspx.**

3. **Sabiston Textbook of Surgery, 19th edition, International Edition- 2012, p1382.**

بوونی هەستیاریی زۆری دەرچەی کۆم بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ کۆنترۆڵی خۆی لەدەست نەدات و، جیاواز بێت لە ئاژەڵان، کە ئەمەش نیعمەتێکی گەورەیە[1].

لەڕووی زانستی توێکارزانی (تشریح) و فسیۆلۆجی (کارئەندامزانی) و نەشتەرگەرییەوە، نابێت کۆم بەکاربهێنرێت لە کاری سێکسیدا، با ئەگەر لە نێوان نێر و مێشدا بێت، چ جای ئەوەی کە لە نێوان دوو نێرینەدا بێت!! چونکە ڕووپۆشی ناوەوەی زۆر ناسک و هەستیارە.. هەربۆیە هاوڕەگەزبازی زیانی تەندروستی زۆری هەیە، هەندێک لەو زیانانە بریتین لە:

١- هۆکاری یەکەمی گواستنەوەی نەخۆشی ئایدزە (AIDS) یان (HIV): لە توێژینەوەیەکدا کە ٣٤٩٢ هاوڕەگەزباز بەشداربوون تیایدا، تەمەنیان لە نێوان ١٥ بۆ ٢٢ساڵ بوو، لە چەند شارێکی ئەمریکادا، دەرکەوت کە (٧٪)یان تووشی ئایدز بوون..[2].

لەبەرئەوەی زیادبوونی ڕێژەی ئایدز لەنێو هاوڕەگەزبازاندا، کە بە (سێکسی نێوان نێر و نێر) (MSM) ئاماژەی پێ دەکرێت، بۆتە کێشەیەکی ڕاستەقینە بۆ سێکتەری تەندرووستی لە جیهاندا، سەدان توێژینەوەی لەسەر کراوە، لە زۆر لە وڵاتانی جیهاندا، بۆ نموونە لە چین، لە کۆتوێژینەوەیەکدا (Meta-analysis) کە ٣٥٥ توێژینەوەی لەخۆگرتووە، کە تەنها لە ماوەی چەند ساڵێکدا، تەنها لە چینیش ئەنجام دراون، بە زمانەکانی ئینگلیزی و چینی بڵاوکراونەتەوە، کە (٥٧١٣٢٨) هاوڕەگەزبازی لەخۆگرتووە، لە ٣٠ پارێزگادا، ڕێژەی تووشبووان بە ئایدز لە نێوانیاندا، لە ساڵی ٢٠٠١دا (٥.٤٪) بووە، بەرەو زیادبوون ڕۆیشتووە، ساڵی ٢٠١٨ بووە بە (٦،١٪).. زیاتر لە تەمەنی (٥٠) ساڵ بەرەوژووردا بینراون، بە ڕێژەی (١٩.٣٪)، واتە هەتاکوو ماوەی زۆرتر ئەو کارە بکەن، ڕێژەی تووشبوون زیاد دەکات...[3].

لە ڕاپۆرتێکی (لیژنەی نیشتمانی خۆپاراستن و کەمکردنەوەی ئایدز) (National AIDS Prevention and Alleviation Committee)، ساڵی ٢٠١٧ هاتووە کە (٥٠٪)ی حاڵەتە نوێکانی ئایدز، لە تەمەنی نێوان (١٥- ٢٤) ساڵن، کە (٤٠٪)یان (MSM)ن. هەربۆیە لە توێژینەوەیەکی تریشدا لە تایلاند، ساڵی ٢٠١٨، کە لەنێو (٣٦) ناوەندی مەشقکردنی سەربازیدا ئەنجام دراوە، (٤٦٢٩) بەشداربوون تێیدا، بینراوە تەنها (١٪)یان تووشی ئایدز بووە، بەڵام ئەوانەی کە سێکس لەگەڵ نێرێکی تردا دەکەن، کە (١٠٪) بوون، ڕێژەی تووشبووان بە ئایدز

1. Williams, N. S., P. Durdey, and D. Johnston. “The outcome following sphincter-saving resection and abdomino-perineal resection for low rectal cancer.” British journal of surgery 72.8 (1985): 595-598.

2. Valleroy, Linda A., et al. “HIV prevalence and associated risks in young men who have sex with men.” Jama 284.2 (2000): 198-204.

3. Dong MJ, Peng B, Liu ZF, Ye QN, Liu H, Lu XL, Zhang B, Chen JJ. The prevalence of HIV among MSM in China: a large-scale systematic analysis. BMC Infectious Diseases. 2019 Dec;19(1):1-20.

گەیشتبووە (٤٪)، لە کاتێکدا تەنها (٣٩.٩٪)یان کۆندۆمیان بەکارهێناوە![١].

لە چیلییش، لە توێژینەویەکدا کە (٣٧٥) هاوڕەگەزباز بەشداربوون تیایدا، لە ساڵی ٢٠٢٠دا، ڕێژەی تووشبووانی ئایدز نزیکی (١٧٪) بووە.[٢].

تەنانەت ئەگەر سێکس لە ڕێگەی کۆمەوە لە نێوان پیاو و ژنیشدا ڕوودات، هۆکارێکی سەرەکی گواستنەوەی ئایدزە[٣]، کاتێک سەیرکراوە کە ئایدز لە نێوان ژن و پیاویشدا دەگوێزرێتەوە، زیاتر هۆکەی ئەوە بووە کە لە ڕێگەی کۆمەوە سێکس دەکەن[٤].

هەروەها لە کۆتوێژینەوەیەک (Meta-analysis) کە ٦٢٦٤٣ توێژینەوەی لەخۆگرتووە، دەرکەوتووە کە سێکس لە ڕێگەی کۆمەوە هۆکاری سەرەکی گواستنەوەی ڤایرۆسی (HIV)یە. هەروەها ئاماژەش بەوە دەکەن کە: «ڕاپۆرتە نوێکان دەریدەخەن کە سێکس لە ڕێگەی کۆمەوە لەنێوان هیترۆسێکچوەڵەکانیش زیادی کردووە، لێرەوە لە ڕۆڵی سێکس لە ڕێگەی کۆمەوە تێدەگەین، بۆ گواستنەوەی  ئایدز (HIV) چۆنە»[٥]..

٢- هۆکارێکی سەرەکییە بۆ گواستنەوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر، جۆری (B) و (C): دۆزراوەتەوە گواستنەوەی ڤایرۆسی هەوکردنی جگەر لە جۆری (B) (HBV) (٦.٨) جار زیاترە لە ئایدز (HIV) بەهۆی هاوڕەگەزبازییەوە[٦].. لە توێژینەوەیەکیشدا لە ئەمریکا ساڵی ٢٠٠٦، دەرکەوتووە زۆرترین هۆی توشبوون بە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی لە جۆری (B) (HBV) بەهۆی سێکسەوە بووە؛ ٣٩٪ سێکسی نێوان ژن و پیاو و، ٢٤٪ بەهۆی سێکسی نێوان نێر و نێر (MSM)..[٧].

هەروەها چەندین گرووپی توشبوو بە هەوکردنی جگەری ڤایرۆسی جۆری (C)

1. Sakboonyarat B, Mungthin M, Nelson KE, Rangsin R. Rising prevalence of HIV infection and associated risk factors among young Thai Men in 2018. Scientific Reports. 2021 Apr 8;11(1):1-0.

2. Stuardo Ávila V, Fuentes Alburquenque M, Muñoz R, Bustamante Lobos L, Faba A, Belmar Prieto J, Casabona J. Prevalence and risk factors for HIV infection in a population of homosexual, bisexual, and other men who have sex with men in the metropolitan region of Chile: a re-emerging health problem. AIDS and Behavior. 2020 Mar;24(3):827-38.

3. Mukandavire Z, Chiyaka C, Magombedze G, Musuka G, Malunguza NJ. Assessing the effects of homosexuals and bisexuals on the intrinsic dynamics of HIV/AIDS in heterosexual settings. Mathematical and computer modelling. 2009 May 1;49(9-10):1869-82.

4. Halperin, Daniel T. "Heterosexual anal intercourse: prevalence, cultural factors, and HIV infection and other health risks, Part I." AIDS patient care and STDs 13.12 (1999): 717-730.

5. Baggaley, Rebecca F., Richard G. White, and Marie-Claude Boily. "HIV transmission risk through anal intercourse: systematic review, meta-analysis and implications for HIV prevention." International journal of epidemiology 39.4 (2010): 1048-1063.

6. Kingsley, Lawrence A., et al. "Sexual transmission efficiency of hepatitis B virus and human immunodeficiency virus among homosexual men." Jama 264.2 (1990): 230-234.

7. Mast, Eric E., et al. "A comprehensive immunization strategy to eliminate transmission of hepatitis B virus infection in the United States." MMWR 54.16 (2005): 1-32.



(HCV) تۆمارکراوە لە ئەورووپادا، کە هەڵگری ڤایرۆسی ئایدزن (HIV)، لەنێو ئەوانەی کە نێر لەگەڵ نێر سێکس دەکەن (MSM)، یان ئافرەت لەگەڵ چەند پیاوێکدا (Multi partner). چونکە ئەو جۆرە سێکسە دەبێتە هۆی برینداركردنی ڕووپۆشی کۆم[١]..

تەنانەت لە توێژینەوەیەکدا، ساڵی ٢٠٠٣، لەسەر ئەوانەی کە بەشداربووان پیاو لەگەڵ ژن سێکس دەکەن (Heterosexual)، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ڤایرۆسی (HCV) بەکەمی دەگوێزرێتەوە، یان هەر ناگوێزرێتەوە لە پەیوەندی سێکسیی نێوان ژن و پیاودا[٢]..

٣- هۆکاری یەکەمە لە توشبوون بە نەخۆشی شێرپەنجەی کۆم: توێژەران دەڵێن:» ڕێژەی توشبوون بە شێرپەنجەی کۆم لە زیادبووندایە لەم سی ساڵەی دواییدا. هۆکارەکانی تووشبوون چاک زانراونن، بریتین لە هەوکردن بە ڤایرۆسی (HPV) و (HIV) کە هەردووکیان پەیوەندن بە زیادبوونی ژمارەی هاوسەرەکان (دۆستەکان) (partners) (ئافرەتێک یان پیاوێک لەگەڵ چەند کەسێکدا سێکس بکات) و زیادبوونی سێکسکردن لە ڕێی کۆمەوە..«[٣].

لە توێژینەوەیەکی تردا (فریش و هاوەڵانی، 1997) دوای توێژینەوە لەسەر ٤١٧ توشبوو بە شێرپەنجەی کۆم، بۆیان دەرکەوت لە هۆکارە سەرەکییەکانی توشبوون بەم جۆرە شێرپەنجەیە: لەو ئافرەتانەدایە کە لە ١٠ دۆست (پارتنەر) و زیاتریان هەیە، یان سیفلس و نەخۆشییە سێکسییەکانیان هەیە، یان ئایدز. هەروەها ئەوانەی پێش تەمەنی ٣٠ ساڵی لە ڕێی کۆمەوە سێکس دەکەن[٤].

---

1. Götz, Hannelore M., et al. "A cluster of acute hepatitis C virus infection among men who have sex with men–results from contact tracing and public health implications." Aids 19.9 (2005): 969-974.

2. Marincovich, B., et al. "Absence of hepatitis C virus transmission in a prospective cohort of heterosexual serodiscordant couples." Sexually transmitted infections 79.2 (2003): 160-162.

3. Nelson, Valerie M., and Al B. Benson. "Epidemiology of Anal Canal Cancer." Surgical oncology clinics of North America 26.1 (2017): 9-15.

هەروەها:

Chiao, Elizabeth Y., et al. "A population-based analysis of temporal trends in the incidence of squamous anal canal cancer in relation to the HIV epidemic." JAIDS Journal of Acquired Immune Deficiency Syndromes 40.4 (2005): 451-455.

هەروەها:

Colón-López V, Shiels MS, Machin M, Ortiz AP, Strickler H, Castle PE, Pfeiffer RM, Engels EA. Anal cancer risk among people with HIV infection in the United States. Journal of Clinical Oncology. 2018 Jan 1;36(1):68.

40 Frisch M, Glimelius B, van den Brule AJC, et al. Sexually transmitted infection as a cause of anal cancer. N Engl J Med 1997;337:1350-8.

هەروەها:

Ryan, David P., Carolyn C. Compton, and Robert J. Mayer. "Carcinoma of the anal canal." New England Journal of Medicine 342.11 (2000): 792-800.



سەبارەت بە (لیسبیان) (السحاق) (Lesbian) مێ سێکس لەگەڵ مێدا (WSW): لە توێژینەوەیەکدا لە سیدنی کراوە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٩١ – ١٩٩٨)، کە تیایدا لێکۆڵینەوە لە ١٤٠٨ ئافرەتی لیسبیان کراوە، لەگەڵ گرووپی کۆنترۆڵدا کە ژمارەیان ١٤٢٣ ئافرەت بووە، دەرکەوتووە کە ڕێژەی تووشبوون بە نەخۆشی هەوکردنی بەکتریایی زێ و هەوکردنی جگەری ڤایرۆسیی جۆری (C) و ئایدز زۆر زیاترە لە لیسبانەکاندا[١].

بینراوە کە ئافرەتە لیسبیانەکان بەشێوەیەکی گشتی پارتنەری زۆرتریان هەیە و پێش تەمەنی ١٨ساڵی ڕێژەی جیماع تیایاندا زۆرترە، ئەمانە هەردووکیان ئەگەری تووشبوون بە ڤایرۆسی (HPV) زیاد دەکات تیایاندا، هەروەها شێرپەنجەی ملی منداڵدان[٢].

ماوەتەوە بڵێین: یاسا و ئامۆژگارییەکانی ئیسلام لەگەڵ فیترەت و بەرژەوەندی مرۆڤدا دەگونجێت. لادانی سێکسی لە مێژە بوونی هەیە، بەڵام لەم سەردەمانەی دواییدا بە ڕێژەیەکی بەرچاو بڵاوبۆتەوە، بە شێوەیەک نابێت بە لادان ناو ببرێن، بەڵکو زۆر بە توندی ڕەتدەکرێنەوە و لەوانەیە تووشی لێپرسینەوەی یاسایی ببن، هەتاکوو گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە لە هەندێک وڵات زەواجی هاوڕەگەزبازەکان بە یاسا کراوە. لەوەش خراپتر مافی مندڵ هەڵگرتنەوەیان بۆ ئاسان کراوە.

زانایان و توێژەران لەو وڵاتانەی کە ئەو لادانە سێکسیانەیان تیا بڵاوە، بەتایبەتی ئەوروپا و ئەمریکا، چارەسەریان بۆ ئەو کێشانەی کە بەهۆی ئەو جۆرە مومارەسانەوە دەردەکەوێت، خۆی دەبینێتەوە لە چارەسەری نەخۆشییەکان، بە دەروونیی و جەستەییەوە، هەروەها هۆکارەکانی ڕێگر یان کەمکەرەوەی ماکەکان، وەک بەکارهێنانی کۆندۆم، ڕەچاوکردنی پاکوخاوێنیی، بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی تەندرووستی و پەنابردن بۆ کەسانی ڕاوێژکاریی دەروونیی. لەکاتێکدا لە شەریعەتی ئیسلامدا لە سەرەتاوە بنەبڕی ئەو مومارەسانە دەکات، بەڵکو ڕێگاکانیشی لێ دەگرێت.

---

1. Fethers K, Marks C, Mindel A, Estcourt CS. Sexually transmitted infections and risk behaviours in women who have sex with women. Sexually Transmitted Infections. 2000 Oct 1;76(5):345-9.

2. Waterman L, Voss J. HPV, cervical cancer risks, and barriers to care for lesbian women. The Nurse Practitioner. 2015 Jan 16;40(1):46-53.

هەروەها:

Matthews AK, Brandenburg DL, Johnson TP, Hughes TL. Correlates of underutilization of gynecological cancer screening among lesbian and heterosexual women. Preventive Medicine. 2004 Jan 1;38(1):105-13.







د. هەتاو حەمەساڵح حسێن

# پرۆسەی بەهێزکردنی ژنان
# Women Empowerment
## لەنێو ئەجێندای نەتەوەیەکگرتووەکاندا
## جیاوازی لێکدانەوەکان

**لە چەند دەیەی ڕابردوودا چەندین زاراوە هاتوونەتە ناو فەرهەنگی زمانەوە بەشێوەیەکی نێودەوڵەتی کاریان لەسەر دەکرێت. زۆرجار واتا و لێکدانەوەی ئەم زاراوانە لای خەڵکی ڕوون نین، هەریەک بەجۆرێک لێکدانەوەی بۆ دەکات و کاری لەسەر دەکات. تەنانەت لەسەر وەرگێرانی زارەوەکان مشتومڕی زۆر هەیە، لە زۆرینەی زمانەکاندا جگەلە زمانی ئینگلیزی کە زمانی سەرەکی داهێنانی زاراوەکانن، لەوانی تردا بە ناتەواوی وەرگێڕدراون، نمونە ئەو زاراوانە، وەک (Gender, Women Empowerment).**

ئەمە سەبارەت بە زمانەوانی، جا ئەگەر بێینەسەر لێکدانەوە و واتای زاراوەکان ئەوا کێشەکە گەورەتر دەبێت و هەریەکە لەو زاراوانە ململانێ و گرفتی گەورەی لەسەر ئاستی تاک و کۆمەڵگە و تەنانەت لای دەوڵەتانیش دروستکردووە. زۆرێک لە وڵاتان و دەسەڵاتداران کەوتونەتە ژێر فشارێکی نێودەوڵتییەوە و زۆرجار نازانن چۆن مامەڵە لەگەڵ بەند و زاراوە و ڕێکەوتننامەکانی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بکەن، دەتوانم بڵێم بەرپرسانی وڵاتان و دەسەڵاتداران ئێستا لە نێوان دوو بەرداشی زۆر سەختدان لەلایەک ناچاردەکرێن بۆ مۆرکردن و جێبەجێکردنی هەریەکە لەو بەند و ڕێکەوتنامانە، لەلایەکی تریش دەکەونە بەر لێشاوی ناڕەزایی و لۆمەی هاوڵاتییانی خۆیان. خەڵک و بەتایبەت ڕۆشنبیران و ڕەخنەگران و چالاکەوانانی سۆشیاڵ میدیا هەریەک بەجۆرێک ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر بەم زاراوە و دەستەواژانە دەردەبڕن، تازەترین نمونە (یاسای بەرەنگاربونەوەی توندوتیژی دژ بە ئافرەت و خێزان)ە، کە یەکێکە لە بڕگەکانی پرۆژەی tnemrewopmE nemoW و، لەم دواییەدا بویە جێی ناڕەزایی خەڵک و بەشێوەیەکی توند ڕایگشتی لە دژی وەستایەوە.

لەم وتارەدا تیشک دەخەینە سەر یەکێک لە زاراوە نوییە نێودەوڵەتییەکان کە بریتییە لەtnemrewopmE nemoW و پاشان سەربوردێک بەسەر باکگراوند و سەرچاوە و ئەجێندای نەتەوە یەکگرتووەکان تایبەت بە ئەم چەمکە دەکەین.

بەهێزکردنی ژنان (tnemrewopmE nemoW) یەکێکە لە زاراوە نوێیە ئاڵۆزەکانی ئەم سەردەمە کە بەشیوەیەکی چڕوپڕ کاری لەسەر دەکرێت. ئەم چەمکە لە بیری (جێندەر(١))ەوە دەرکەوتووە و لەنێو زاراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان گرنگییەکی زۆری پێدراوە.

دروشم یان چەمکی بەهێزکردنی ژنان لە مەکۆکانی ژنان لەسەر ئاستی جیهانی کاری لەسەر دەکرێت. بەهێزکردنی ژنان لە ئێستادا لەنێو کۆنفرانسە ناوخۆیی و نێودەوڵەتییەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنیدا بۆتە چەمکێکی باو یەکێکە لەو بابەتە سەرەکییانەی

---

١. جێندەر زاراوەیەکی ئالۆزە وبە وردی پێناسە نەکراوە. جێندەر وشەیەکی ئینگلیزییە کە بە لە بنەڕەتدا لاتینییە و گوزارشت لە جۆری کۆمەڵایەتی دەکات، بەگشتی باسەکانی لە چواردەوری ڕۆڵی ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا دەکات نەک لایەنی بایۆلۆژی و تایبەتمەندییەکانی ژن و پیاو. ئینسایکلۆپیدیای بەریتانیا پێناسەی ناسنامەی جەندەریی بەم شێوەیە دەکات: بریتییە لە هەستی مرۆڤ بۆ خۆی لەوەی نێر یان مێیە. هەروەها دەڵێت: "ناسنامەی جەندەری بە لەدایکبوون جێگیر نییە بەوەی نێر بێت یان مێ بەڵکو لە ژێر کاریگەری فاکتەرە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکاندا دیاریدەکرێت".

کە لەلایەن دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانەوە بە جددی کاری بۆ دەکرێت.

tnemrewopmE nemoW لە زمانەوانیدا واتە بەهێزکردنی ژنان. ئەم زاراوەیە بۆ عەرەبی وەرگێڕدراوە بە (تمکین المراة) و بۆ کوردیش کراوە بە (تواناسازی ژنان)، دیارە ئەمەش هەر لە عەرەبییەکەوە هاتووە، بەڵام لە ئینگلیزیدا پڕاوپڕ مەبەست لە (tnemrewopmE nemoW) هێزدان بەژن یان بەهێزکردنی ژنانە. لە زمانی عەرەبیدا لە بەرامبەر وشەی تمکین gnilbanE هەیە.

## پێوەرەکانی بەهێزکردنی ژنان

بەپێی پێوەرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان پرۆژەی بەهێزکردنی ژنان ساڵانە لەسەر ئاستی جیهاندا پێوانە دەکرێت لەوانە: ڕادەی سەربەخۆیی ئابووریی ژنان، ڕادەی بەشداری ژنان لە بوارەکانی کۆمەڵایەتیدا، ڕادەی بوونی ئافرەت لە پۆستە کارگێڕیی و فەرمییە باڵاکاندا، چاودێریکردن و بەدواداچوونی پشکی ژنان لە کورسییەکانی پەرلەمان، هەروەها حساب بۆ کردنی لە بواری یاساداناندا.

بەگشتی پێوانەکردنی بەهێزکردنی ژنان لەم خاڵانەی خوارەوە زیاتر ڕوون دەبێتەوە:

١. بەشداری ژنان لە لیژنە گشتی و تایبەتەکاندا.
٢. بەشداری ژنان لە پۆستەکانی سەرکردایەتیدا.
٣. بەشداری ژنان لە ناوەندی بڕیاردان.
٤. دابینکردنی دەرفەتی ڕاهێنان بۆ ژنان.
٥. گۆڕینی تێڕوانینی ژنان سەبارەت بە کارکردن لە دەرەوەی ماڵ.
٦. متمانەی ژنان بە توانای بەشداریکردنیان لەگەڵ پیاوان لە کارە گشتییەکاندا.
٧. گۆڕینی تێڕوانینی پیاوان بۆ توانای ژنان لە وەرگرتنی پۆستی گشتی.
٨. زیادکردنی ڕێژەی سەدی مێینە لە پۆستە کارگێڕیی و پیشەییەکاندا.
٩. دیاریکردنی ڕێژەی ژنان لە پەرلەمان.
١٠. دیاریکردنی ڕێژەی ژنان لە وەزارەت و پۆستە باڵاکان و پۆستەکانی بڕیاردان.
١١. ڕێژەی ژنان لە خاوەنداریێتی کاردا.
١٢. ڕێژەی ژنان لە ژمارەی دەرچووانی ناوەندەکانی خوێندنی باڵادا.
١٣. ڕێژەی ئەو ژنانەی کە خاوەنی هەژماری بانکین.
١٤. بوونی سەربەخۆیی ئابووری ژنان لە پیاوان.
١٥. ڕێژەی بەشداری ژنان لە بازاڕی کاردا. (رأفت صلاح الدين، ٢٠١٦)

لەبەر تیشکی ئەم خاڵانەی سەرەوە ئەگەر بەشێوەیەکی ئەرێنی لێکدانەوەی چەمکی بەهێزکردنی

ژنان یان بەتواناکردنی ژنان بکەین ئەوا دەتوانین لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کورتی بکەینەوە:

- بەهێزکردنی خود: بریتییە لە زیادکردنی بەهرەمەندی و توانای ژنان بۆ باشترکردنی ژیانیان و بەهێزکردنی لایەنی سایکۆلۆژی ژنان.
- بەهێزکردنی کۆمەڵایەتی: بریتییە لە زیادکردنی ڕێژەی بەشداریکردنی ژنان لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاستی ناوخۆیی و جیهانیدا. بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاری بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە هەڵاواردنێک دژی ژنان.
- بەهێزکردنی ئابووری: ئەمەش بریتییە لە زیادکردنی قەبارەی بەشداریکردنی ژنان لە بازاڕی کاردا، هەروەها پشتیوانیکردنی ژنان لە متمانەپیدان و بەرزکردنەوەی ئاستی توانا و پشتبەستن بەخۆیان، تاوەکو بتوانن بەشداری لە ژیانی ئابووریدا بکەن.
- بەهێزکردنی سیاسی: پشتگیریکردن لە بەشداری سیاسی ژنان بە زیادکردنی نوێنەرایەتییان لە پۆستەباڵاکان و ناوەندەکانی بڕیاردان، زیادکردنی ئەندامێتییان لە پارتە سیاسییەکان، سەندیکاکان، کۆمەڵە پیشەییەکان، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، زیادکردنی نوێنەرایەتییان لە دامەزراوە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکاندا.

لەچوارچێوەی بەهێزکردنی سیاسی ژناندا، کۆنفرانسی پەکین لە ساڵی ٥٩٩١ داوای تەرخانکردنی کورسی پەرلەمانی بۆ ژنان لە پەرلەمانەکاندا کرد (کە پێی دەوترێت پرۆژەی پشک)، ئەم پرۆژەیە داوای پێویستی بەرزکردنەوەی نوێنەرایەتی ژنان بۆ لە ٠٣٪ تا ساڵی ٥٠٠٢، و ژمارەیەک وڵات بڕیاری پێشکەوتووی عەرەبییان لەم ڕووەوە داوە.

بەهێزکردنی یاسایی: هەمواركردنەوەی یاساکان بەجۆرێک کە ڕۆڵی ژنان بپارێزێت و مافەکانیان تیایدا زامنکراو بێت.

**لێرەدا دەکرێ بپرسین، ئایا چەمکی بەهێزکردنی ژنان tnemrewopmE nemoW چەمکێکی کێشەئامێزە؟**

وەک باسمان کرد دەستەواژەی بەهێزکردنی ژنان لە هزری جەندەرییەوە لەدایکبووە. tnemrewopmE nemoW بەشێوەیەکی سەرەکی لە ساڵی ٥٨٩١ی دروستبووە، پاشان لە ساڵانی نەوەدەکاندا لە کۆنفرانسی قاهیرەی دانیشتووان و گەشەپێدان لە ساڵی ٤٩٩١ دا باسی لێوەکراوە، دوای ساڵێک (٥٩٩١) لە چوارەمین کۆنفرانسی جیهانی ژناندا لە پەکین بە چڕوپڕی ستراتیژی دۆسیەکە خراوەتەڕوو و تاوتوێی لابردنی هەموو ئەو ئاستەنگانە کراوە کە ڕێگرن لە بەردەم بەهێزکردنی ژناندا. دواتریش لە کۆنفرانسەکانی پەکین +٥ و کۆنفرانسی پەکین +٠١دا بە ئاشکرا کاری جددی لەسەرکرا. لە کۆنفرانسەکانی تایبەت بە ژنان جەخت لەسەر بەهێزکردنی ژنان، بەتایبەت لە ڕووی ئابووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسیی دەکەنەوە.

بەڵام وەک لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا، جیاوازی لە نێوان ڕۆشنبیران و توێژەراندا هەیە سەبارەت بە چەمکی tnemrewopmE و تەنانەت لە وەرگێڕانیدا، ئەوانەی بە شێوازێکی ڕەخنەئامێز دەڕواننە ناو بابەتەکەوە بەچەندین شێوە ناڕەزایی خۆیان بەرامبەر بە هەریەکە لەم چەمکە نوێیانەی نەتەوە یەکگرتووەکان دەردەبڕن و لەم ڕووەوە چەندین پرسیار دەوروژێنن..

لەراستیدا بەپێی وەرگێڕدرانی وشەکان تێڕوانین بۆ وشەی (nemoW tnemrewopmE) دەگۆڕێت. وەک وتمان بەهێزکردن واتە tnemrewopmE، بەڵام تواناسازی یان تەمکین واتای وشەی gnilbanEی ئینگلیزی دەدات. بەڵام لەڕووی واتاوە تواناسازی بەتەواوی پێچەوانەی وشەی بەهێزکردنە، «تواناسازیی» باس لە بەدیهێنانی خودی ژن دەکات، کە وشەیەکی ئەرێنییە، هەمیشە چاوەڕوانی کاروکاردانەوەی ئەرێنیشی لێ دەکرێت. بەڵام «بەهێزکردن»ی ژنان بەلای زۆرێکەوە مانا و مەدلولێکی نەرێنی هەیە. چونکە بە واتای دەسەڵات و بەهێزکردنی ژنان دێت بەتایبەت لە بەرامبەر پیاواندا، یان ڕاستتر بڵێین دروستکردنی کێبڕکێ و ململانێ لە نێوان ژن و پیاو. چونکە بەسەربوردێکی خێرا بە مێژووی نوێی بزوتنەوە فێمێنیزتییەکان ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە ئەوان بەردەوام لە هەوڵدا بوون بۆ وەرگرتنی مافی ئافرەت و ڕەتکردنەوەی هەموو دەسەڵاتێکی نێرینە.

ڕەگ و ڕیشەی ئەم لێکدانەوە و تێڕوانینە بۆ پیاو لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردووەوە لە بزووتنەوەی فێمینیزمی ڕادیکاڵییەوە دەستیپێکرد، فێمینیستە ڕادیکاڵییەکان زۆرجار شۆڕشیان لە دژی زمان و کولتوور و مێژوو و دابونەریت و تەنانەت ئاینیش کردووە. هەریەکە لەمانە بە بەرپرسیار زانیوە لە بەرامبەر چەوساندنەوەی ژناندا، کەواتە لەم هاوکێشەیەدا کاروکاردانەوە هەبووە و زۆرجاریش هەڵوێستی توند لە فێمینیستە ڕادیکاڵییەکان بینراوە (htimS, ٢٠٢٠) . بەڵام ئەوەی جێی تێڕامانە کە شارەزایانی بواری زمانەوانی نکۆڵی لەوە ناکەن کە مانای پڕاوپڕی nemoW tnemrewopmE بەهێزکردنی ژنانە، کەواتە بۆچی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەم وشەیەی هێناوەتە ناو ئەجێندای کارەکانییەوە؟ چونکە ئاشکرایە دانانی وشەیەک بۆ پرۆژەیەکی هێندە گەورە لە بێئاگایی و هەڕەمەکییەوە نابێت، دەکرێت بڵێین مەبەستی گشتی داڕێژەرانی ئەم پرۆژەیە هەر بەمەبەستی بەهێزکردنی ژنانە.

ئەمە وتەیەکی جێگری سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتووەکان(١) بەبیردەهێنێتەوە کە لە وتارێکدا لە کۆنفرانسی سەرهەڵدانی ژنان و کچان و هەوڵدان بەرەو بەشداریکردنی تەواو و یەکسان لە کۆمەڵگادا لە نیویۆرک لە ١١ی ئەیلول ٢٠١٤ ئاماژەی پێداو وتی «ئەم

1. https://press.un.org/en/2014/dsgsm802.doc.htm



**بزووتنەوە فێمینیزمییەکان خێزان و منداڵبوون به هۆکارێکی سەرەکی هەژاری ژنان دەزانن.**

سەدەیە سەدەی ژنە». ئەم دەستەواژەیە خۆی لە بەهێزکردنی هەریەکە لە کایەکانی ئابووریی و سیاسیی و یاسایی و کۆمەڵایەتیدا دەبینێتەوە، تیایدا داوا لە ژنان دەکرێت هەموو دەسەڵات و تواناکانی خۆیان بەکاربهێنن بۆ هێنانی کولتوورێکی کۆمەڵایەتی کە تارادەیەکی زۆر دەسەڵاتی پیاو تیایدا سنورداره، ئەو ڕەهاییەی پێشتر بە پیاو دراوە لێی وەردەگیرێتەوە، بەمانایەکی تر واتە کۆتایی هێنان بە هەژموونی پیاو ( ytupeD lareneG yraterceS, ٤١٠٢ ).

گەر بەشێوەیەکی ڕەخنەیی خوێندنەوە بۆ هەنگاوەکانی بەهێزکردنی ژنان بکەین، بۆ نمونە لە بەهێزکردنی ئابووریدا، بزووتنەوە فێمینیزمییەکان خێزان و منداڵبوون بە هۆکارێکی سەرەکی هەژاری ژنان دەزانن. دەڵێن بەهێزکردن ئابووری ژنان پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە مەسەلەی خێزان و شوکردن و منداڵخستنەوە هەیە. فێمینیستە ڕادیکاڵییەکان پێیانوایە ژنان لە دەرەوەی بەڕێوەبەرایەتیی خێزاندا زیاتر لە پیاوان ئازاد و سەربەخۆن، هەربۆیە بۆبەدیهێنانی ئامانجی سەربەخۆیی ئابووریی و کارکردن و بۆ بەدەستهێنانی پارە و دەستڕاگەیشتن بە سەرمایە، پێویستە ئافرەت نەچێتە ناو چوارچێوەی خێزانەوە. هەروەها دەڵێن بەهێزکردنی ژنان لەڕووی ئابورییەوە واتای سەربەخۆیی تەواوی ژنە لەڕووی ئابوورییەوە.

لە حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا زاراوەی «هەژاری ژنان» لەناو بزووتنەوەی فێمینیزمیدا دروستبووە و لەلایەن (دیانا پیرس)ەوە داڕێژراوە. ژنانەبوونی هەژاریی واتە زۆریی ڕێژە و ئاستی هەژاری لە نێو ژناندا هەتاکوو لە پیاوان، ئەمەش بەهۆی سەرقاڵبوونی ژنانە بە ئەنجامدانی کاری ماڵەوە و بەخێوکردنی منداڵ، بەتایبەت لەو وڵاتانەی کە هیچ موچەیەکی دەوڵەت بۆ دایکان و منداڵان دابین نەکراوە. لە بەرامبەردا پیاوان لە کارەکانیاندا مووچە وەردەگرن، ئەمەش ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی چڕبوونەوەی پارە لە دەستی پیاوان، ڕێژەی هەژاری ژنان زیاد دەکات.





لە کۆتاییدا دەڵێین، لە نێوان ئەم دوو خوێندنەوەی یار و نەیارەی بەهێزکردنی ژناندا، هەندێک بە هۆکارێکی دادەنێن بۆ کەمکردنەوەی هەژاریی و پەرەسەندن و گەشەی ئابووری لەلایەک و پێشکەوتنی سیاسیی و بەهێزکردنی پێگەیی کۆمەڵایەتی لەلایەکی تر، ئەوان دەڵێن بەهێزکردنی ژنان واتا ڕەخساندنی دەرفەتی بەشداریکردنی تەواو لە ژیانی ئابووریدا لە هەموو کەرتەکاندا تا گەیشتن بە ئامانجەکانی بەرنامەی گەشەپێدانی بەردەوام (tnempoleveD elbaniatsuS)، کە جەختدەکاتەوە لەسەر بردنە سەرەوەی ئاستی یەکسانی جێندەریی و بەهێزکردنی ژنان، ئەمەش وەک دیفاکتۆیەک بۆ کەمکردنەوەی هەژاریی و گەیشتن بە سەرجەم ئامانجەکانی گەشە لە هەزارەی سێهەمدا.

هەندیکی تر دەڵێن(١) بەهێزکردنی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی ژنان دەبێت بەردەوام بێت هەتاکوو ئەو کاتەی ڕزگاریان دەبێت لەژێر دەسەڵاتی  پیاو. واتە خەباتی ژنان لە دژی هەژموونی پیاو و پیاوسالاریی، ئەم داوایە فراوانتر دەبێت تا دەگاتە ناو خێزان و ئەمانەش چەندین بابەتی هەستیاری ناو خێزان دەگرێتەوە، لەوانە: سەرپەرشتی (قیوامە)ی پیاو، مافی مێرد لە تەڵاقدان، فرەژنی تاوەکو دەگاتە بابەتی سەرجێگەیی و پێکەوەبوونی ژن و مێرد، ئەرکەکانی منداڵبوون وەک دووگیانی، دایکایەتی و شیرپێدان و چاودێریکردن...هتد. لە ڕوانگەی فێمینیزمی ڕادیکاڵەوە، هەریەکە لەمانە بەربەستێکە لەبەردەم بەهێزکردنی ژنان و جۆرێکە لە پراکتیزەکردنی توندوتیژی دژی ژنان. ئەوان پێیان وایە سەربەخۆبوون لەڕووی ئابووریی و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە تا ڕادەیەکی تەواو ژنان ئازاد دەکات لەژێر دەسەڵاتی پیاو. یەکێک لەو داواکارییانەی کە پرۆژەی بەهێزکردنی ژنان  کاری لەسەر دەکات بریتییە لە؛ پێدانی مافی کۆنترۆڵکردنی ژیانی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سێکسی، سەربەخۆبوون لە بڕیاردانی منداڵبوون و لەباربردن بەتایبەتی لە تەمەنی هەرزەکاریدا، خۆپاراستن لە نەخۆشییە سێکسییەکان و ڕەخساندنی هەموو دەرفەتێک بۆ وەرگرتنی زانیاری سێکسی و خزمەتگوزاری تەندروستی زاوزێ و سێکسی. ئەمەش بەجۆرێکە ڕەهایی سێکسی، دروستکردنی ململنێی کۆمەڵایەتی وزیانگەیاندن بەخێزان و منداڵی لێ دەخوێنرێتەوە.

کەواتە، هەروەک لەسەرەتاوە باسمان کرد گرفتی هەریەکە لەم زاراوانە ناڕوونیانە و نەزانینی ڕەهەندەکانیانە، هەروەها بارودۆخی سەرهەڵدانی تەنانەت لای هەندێ لە ڕێکخراوە و چالاکوانەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کاردەکەن ڕوون نییە، و ئەوەی کە گرفتەکە قووڵتر دەکاتەوە،  بەکارهێنان و کارکردنە بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەم زاراوانە بەبێ دیراسەکردنی کاریگەرییەکانی لەسەر خێزان و کۆمەڵگە.

---

١. فێمینیستە ڕادیکاڵییەکان.

## سەرچاوەکان


Allen, A. (2005). Feminist perspectives on power.

Mandal, K. C. (2013, May). Concept and Types of Women Empowerment. In International Forum of Teaching & Studies (Vol. 9, No. 2).

Nair, J. D. (2021). HUMAN RIGHTS, GENDER, WOMEN EMPOWERMENT: CONCERNS AND CHALLENGES. Journal of Human Sciences, 1(1), 112.

Smith, C. (2020). Radical feminism and the objectification of women. In Objectification (pp. 38-55). Routledge.

Women, U. N. (2015). Monitoring gender equality and the empowerment of women and girls in the 2030 agenda for sustainable development: opportunities and challenges. UN Women.

م. احمد ثامر خيون صبير السعدون, & د. غزوان عدي عطشان. (٢٠٢٢). معوقات تمكين المرأة العراقية لممارسة الدور القيادي بالمؤسسات المجتمعية. لارک, ٤(٧٤), ٤٢٨-٤١٥.

سلمان مرضي السعودي. (٢٠٢٢). تمكين المرأة بين التقاليد الراكدة والأفكار الوافدة. مجلة الشرق الأوسط للدراسات القانونية والفقهية, ٢(٣), ١٠٩-٩٣.

hcuoD, .H & hallataM, .A (٢٠٢٢). المرأة وإشكالية التمكين الاقتصادي: مراجعة في المفاهيم والاتجاهات المستقبلية. lanoitanretnI lanruoJ fo lageL dna lacitiloP snoitamrofsnarT, ١(١٠), ٤١-٢٩.

demahoM, .H .R (١٢٠٢). واقع التمكين السياسي للمرأة العراقية وسبل النهوض بها التحديات-والآفاق المستقبلية. badA-lA lanruoJ, ١(١٣٩), ١٨٣-٤٢٤.

رأفت صلاح الدين، ٦١٠٢ المرأة بين الجندر والتمكين، https://socio.yoo7.com/t4037-topic ، Accessed 6/10/2022

Deputy Secretary-General, 23 SEPTEMBER 2014 https://press.un.org/en/2014/dsgsm802.doc.htm. Accessed 5/10/2022



دانا دارا حسەین

# لادانە غەریزەییەکان

## دیدی یاسایی و هونەری بەرەنگار بوونەوەی

ئەگەرچی تاوتوێی وەها پرسێك لەلاپەڕەکانی میدیاوە قورس و بەئازارە، بەڵام وەك حاڵەت و لەهەمانکاتدا وەك یەکێك لە نەخۆشییەکان کە تیشك خستنەسەری جێی خۆیەتی و بایەخی هەنووکەیی هەیە. لادانە غەریزییەکان زۆرن و لەگەڵ فرەیی ئیشتیهای مرۆڤەکاندا ئەویش هەمەچەشنە، بەشێوەیەك ئەم غەریزە زایەندییە خواکردە کە ئامانج لێی چێژی سروشتی مرۆڤ و خستنەوەی وەچە و بەردەوامی ژیانە دەگۆڕێت بۆ تێرکردنی لاشە بەشێوەیەکی کاتی و تێکدانی فرچکی لە مێژینەی مرۆڤ جا هەر ئایین و یاسا و نۆرمێکی کۆمەڵایەتی هەبێت.

ئێمە لەم نووسینەدا وەستان دەکەین لەسەر لوتکەی ئەو لادانە غەریزییەی کە سەرقاڵییەکی میدیایی و ئاماری لە جیهاندا دروستکردووە کە ناسراوە بە (هاوڕەگەزبازی) کە دروستە ناوی (بەدڕەوشتی ڕەگەزی) بۆ دابنرێت.

لە پێناسەیەکی سادەدا ئەم لادانە وەها پێناسە دەکرێت کە: هەبوونی مەیلی سێکسی لەگەڵ هەمان ڕەگەزدا، بەواتای نێر لەگەڵ نێر یان مێ لەگەڵ مێ ...). واتا لە کۆی ئەو لادانانەی وەک تاوانی ڕەوشتی ئەژمار دەکرێن لە (زیناکردن، پاشبازی، منداڵبازی، ئیغتصاب، لەشفرۆشی و لەشکڕی، تاوانی ئابڕوبەری شەرەفی لەکەدارکەر) تاوانی(بەدڕەوشتی ڕەگەزی) لوتکەی ناشیرینترنیانە، کە لە هەندێک کاتدا وەک ناونانێکی زانستی بۆ ئەم نەخۆشییە قێزەونە ناسراوە بە (ناجێگیری شوناسی ڕەگەزی – اضطراب الهوية الجنسية). ئەم لادانە لەلایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانییەوە(OHW) هەتاکوو ماوەیەکیش پێش ئێستا بەنەخۆشییەکی مەترسیدار ئەژمار دەکرا و ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە کەسی بکەر یان قوربانی دەبێت لەو چوارچێوەیەدا سەیر بکرێت.

هەستیاری بابەتی بەدڕەوشتی ڕەگەزی زۆرە، ئەویش بەحوکمی ژینگە کۆمەڵایەتییەکەی، هەروەها لەڕووی شەرعیی و یاسایی و کاریگەرییەکانییەوە، ئەم تاوانە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا وەک یەکێک لە تاوانە گەورەکان (كبائر الذنوب) ناسراوە و سزای دونیایی و دواڕۆژی لەسەرە، تەنانەت یەکێک لە کردەوەی نەتەوەیەکی پێشووی مێژوویی کە هەبوون و ناسراون بە (قەومی لوط)، ئەم لادانە بووە قورئان بۆی تۆمارکردووین بەشێوەیەک سەرەنجامی گەلەکە تیاچوون و نەفرەت لێ کردن بووە.

یاسای دانراویش کە لەچوارچێوەی یاسا سزاییەکاندا بەکاریگەری حوکمی دەقە شەرعییەکانی ئایینی ئیسلام ئەویش لە چەندین یاسای بەرکاردا لە عێراق و هەرێم ئەم تاوانەی دەقنوس کردووە و سزاشی بۆ داناوە. وەک لە یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ٩٦٩١ی هەموارکراو لە ماددەکانی ٣٩٣ هەتا ٤٠٢ وەک تاوان ناسێنراوە و سزای توندیشی بۆ بکەرەکانی داناوە.

هەروەها لە یاسای بەرەنگاربوونەوەی لەشفرۆشی( قانون مكافحة البغاء) ژمارە ٨ی ساڵی ٨٨٩١ باس کراوە، هەروەها لە یاسای باری کەسی ژمارە ٨٨١ی ساڵی ٨٥٩١ی هەموارکراو وەک یەکێک لە هۆکارەکانی جیاکردنەوەی هاوسەران(التفريق القضائى) دانراوە، چونکە ئەم تاوانە تاوانێکی ناپاکی هاوسەرێتی(الخيانة الزوجية)و قەبوڵکراو نیە.

لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە، ئەم تاوانە وەک لادانێکی قێزەونی مەترسیدار کە زۆرجار بەشێوەی پشتی پەردە و نهێنی ئەنجام دەدرێت کە هەبوونی لە چەندین جێگەی جیهان و ناوخۆشدا ڕاستی ئەو نەخۆشییە دەسەلمێنن، ئەگەرچی وەک ئەرکێکی شەرعی و



**ژمارەیەك ئاماری نافەرمی ڤیدیۆیی سکاڵا و ڕێکخراو و وێنەی بڵاوکراوە پێمان دەڵێن نەخێر کوردستان سەلامەت نیە، بەڵکو بارگاوی بووە بەم جۆرە لادانە و پرسێکی هەستپێکراوە کە ناکرێت نادیدە بگیرێت.**

یاسایی بەگونجاوی دەزانم ئەرکی (ستر)کردن بەکاربهێنرێت لە زۆر جاردا و باشتر و مامەڵەیەکی گونجاوترە. بەڵام بەژێر لێوەوەکردنی بەتایبەت بۆ یاسادانەر و کەسە پسپۆڕەکان گونجاو نیە، چونکە ئەوان دەتوانن لە مەترسییەکان تێبگەن و میکانیزمی بەرەنگاربوونەوەشی بۆ دابنێن. کەواتە کۆمەڵگە و خێزان و هەموو یەکەکانی تر ئەم لادانە ڕەتدەکەنەوە، تەنانەت ئەوانەش وەک حەز سەیری دەکەن، بەڵام هەرگیز بۆ خۆیان و ماڵ و خێزان و نزیکیان بەرەوای نابینن.

هەندێک سەرچاوە باس لە ئامارێک دەکەن لەڕووی هەبوونی و زۆری پیادەکردنییەوە کە لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی جیهانەوە ڕیزبەندییەکە بەم شێوەیەیە: بەریتانیا، تایوان، فلیپین، هند، ئەمریکا فەرەنسا، کەنەدا، ئیتاڵیا، چین...، هەروەها لە وڵاتە عەرەبیەکان بەپێی ئامارێکی سایتی(العربیة) بەم شێوەیە (بەداخەوە): جەزائیر، مەغریب، سودان، ئەردەن، تونس، لبنان، فەڵەستین.

ئەوە لەکاتێکدا لە هەموو وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکان ئەم لادانە ڕەوشتییە مەترسیدارە بەتاوان دانراوە و سزاشی هەیە، کەچی وەک حاڵەت و هەندێک جار وەک دیاردە بوونی هەیە، لە وڵاتانی ڕۆژئاواش هەندێکیان بەتاوان و نەخۆشی نازانن، بەڵکو وەک حەزێکی ئاسایی وێنای دەکەن، یاخود وەک تیکچونێک لەنێو هۆرمۆن و مێژووی کەسایەتی کەسەکە تەماشای دەکەن.

ئەوەی جێگەی پرسیاری جددیە ئەوەیە کە ئایا کوردستان لەم لادانە سەلامەت بووە؟ لەڕاستیدا ژمارەیەک ئاماژە لەڕووی مێژوویی و نووسینە بەردەستەکان لە کۆندا، و لە بوونی ژمارەیەک ئاماری نافەرمی ڤیدیۆیی سکاڵا و ڕێکخراو و وێنەی بڵاوکراوە پێمان دەڵێن نەخێر کوردستان سەلامەت نیە، بەڵکو بارگاوی بووە بەم جۆرە لادانە و پرسێکی

هەستپێکراوە کە ناکرێت نادیدە بگیرێت.

ئەویش وەک دیاردە هاوپێچەکان پاش بڵاوبوونەوەی ژمارەیەک گرتەی ڤیدیۆیی و هەبوونی پەیج و دیمانەی سەتەلایتی بانگەوازکارانی و تاوانی هاوپێچەکانی تری وەک (ڕەگەزگۆڕین) و دەربڕینی شانازیی و ئاشکراکردنی بۆ ڕای گشتی و ئەو کاردانەوانەی لەسەریان بوون وەک کوشتن لەلایەن خێزانەکانیانەوە یاخود دەرکردن و ونکردنی شوناس و ناسنامەیان هاتووە.

-ئەوەی لەڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دیاردەیەدا گرنگە وەک هونەری ڕاستەقینەی بەرەنگاربوونەوەی لەم هەنگاوە کرداریانە:

١. دەسەڵات ئەو ڕاستییە بە چاکی دەرک بکات کە بەهۆی خۆشگوزەرانی و جۆرێک لە دەوڵەمەندییەوە ژمارەیەک دیاردەی گەندەڵی ماڵیی و ڕەوشتی دروست دەبن کە مەترسین و ئاماژەکانی حوکمی کەسەکان و دەزگاکان و قوربانییەکانیان و بوونیان لە میدیا و سۆشیال میدیا، ئینکاری نەکراوە.

٢. کۆمەڵناس و دەروونناس و پزیشکی دڵسۆز هەستن بە کۆکردنەوەی ژمارە و داتاکانیان و شوێنی جوگرافی بڵاوبوونەوە و هۆکاری گەشە و ژینگەی زیادبوونیان.

٣. ڕێکخراو و کەسایەتی و پسپۆڕی دەروونی و پزیشکی و ئاییني لەسەر دیاردەی لادانەکە خوێندنەوەی قوڵ و تێڕامانی بۆ بکەن، بەشێوەیەک هەموو لایەنەکانی بخوێننەوە نەک تەنها بە نەفرەت کردنی کۆتایی پێ بهێنن.

٤. لەچوارچێوەی لادانە ڕەوشتییە ئابڕووبەرەکاندا بۆ قۆناغەکانی ئامادەیی و هەرزەکاران لە ناوەندەکانی خوێندن و میدیاکاندا وەک تاوان بناسرێت و حوکمە شەرعییەکانیشی لە حوکمەکانی یاسای سزاداندا ڕوون بکرێتەوە.

٥. دروستکردنی پارێزییەک(مناعە) لە خێزان و میدیا و سۆشیال میدیاکانەوە نەک تەنها کورتکردنەوە لە قەدەغەکردن (منع)دا.

٦. ژمارەیەک سەرچاوەی نووسین لە کتێب و توێژینەوە و وتار لەسەر ئەم دیاردەیە بڵاو بکرێتەوە و لەلایەن ناوەند و کەسی خەمخۆرەوە شیکار بکرێت.

٧. هەموو ئەو وێنە و نمایشە وروژێنەر و ئاماژەدانانە کە جۆرێک لە هاندانی تێدایە یاخود ئاسایی کردنەوەن بۆ ئەم تاوانە قەدەغە بکرێت لەنێو کتێب، یاری منداڵان، ئاماژە ئەلکترۆنییەکان، سایت و تۆڕی کۆمەڵایەتی.

٨. قوربانییەکان وەک نەخۆش مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت و هەریەکەیان بەپێی پلەی مەترسیدارییەکەی سزای یاسایی وەربگرن، پاشان ئەوانەیان بوونەتە قوربانی چارەسەری پزیشکیی و شەرعیی و ڕاهێنانەوە وەربگرن و نەهێڵن ئەم کەس و خێزانە تیا بچن.



وەرگێڕانی: بنار جەبار

# چەند ڕەگەزێک؟ قسەی بێمانا

**بۆچی تەنها دوو ڕەگەز هەیە، گەرچی مەودایەکی فراوانی کلتووریی و هۆرمۆنی لەناو ڕەگەزەکاندا هەیە؟ گفتوگۆیەک لەگەڵ کریستیانا نوسلێن ڤولهارد، خاوەنی خەڵاتی نۆبڵ، لەسەر ئایدۆلۆجیای ترانسجێندەریزم و هاودەستە ساویلکەکانی ئەو ئایدۆلۆجیایە، هەروەها لەسەر ئەوەی بۆچی باوەڕی وایە یاسای دیاریکردنی ڕەگەزی خود «شێتانەیە.»**

- پرۆفیسۆر نوسلێن ڤولهارد، وەکو ئاگاداریت سڤین لیمان، نوێنەری کویرەکان لە حکومەتی فیدراڵیدا، دەڵێت: ئەوانەی دەڵێن تەنها دوو ڕەگەز هەیە قسەیەکی نازانستی دەکەن. چەندین ڕەگەز هەن.

پرۆفیسۆر نوسلێن: ئەوە قسەیەکی نازانستییە! ڕەنگە بەڕێز لیمان لە وانەی زیندەوەرزانیی نەچووبێتە ژوورەوە.

- مادام وایە با بۆی قەرەبوو بکەینەوە.

پرۆفیسۆر لیمان: باشە، هەموو شیردەرەکان دوو ڕەگەزیان هەیە، مرۆڤەکانیش سەر بە شیردەرەکانن. ڕەگەزێکیان هێلکە بەرهەم دەهێنێت و دوو کرۆمۆسۆمی ئێکسی (X) هەیە. ئەم ڕەگەزە پێی دەگوترێت مێ. ڕەگەزێکی تریش هەیە سپێرم بەرهەم دەهێنێت، هەروەها کرۆمۆسۆمێکی وای (Y) و یەکێکی ئێکسی (X) هەیە. ئەمەیان پێی دەگوترێت نێر. کاتێک هێلکەیەک و سپێرمێک یەک دەگرن، ژیانێکی نوێ دروست دەبێت.

- خەڵکی حەزیان بەوەیە نموونەکانی جیهانی ئاژەڵان بکەن بە بەڵگەی هەبوونی زیاد لە دوو ڕەگەز، بۆ نموونە، چی لەسەر هێلکەشەیتانۆکە دەڵێیت؟

- پرۆفیسۆر لیمان: ئەوان دووڕەگەزن. خانەی هێلکە و سپێرمیشیان هەیە. دەتوانن خۆیان بپیتێنن. بەڵام زۆرینەی کات لەگەڵ هێلکەشەیتانۆکەیەکی تردا جووت دەبن. هۆکاری ئەمە ئەوەیە کاتێک خۆیان دەپیتێنن، بێچووەکەیان بە تەواوەتی لە خۆیان دەچێت. بەڵام کاتێک دوو دانەی جیاواز بۆماوە ماددەیان تێکەڵ دەکەن، جۆراوجۆریی زیاتر دروست دەبێت، بێچووەکەیش تەندروستتر دەبێت. ئەمە هۆکاری سەرکەوتنی ئەم بنەمایەیە لە سروشتدا. بەڵام، ئەوەی کە زیندەوەری دووڕەگەز هەن ئەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە ئەمانە دوو خانەی بەرهەمهێنەرن، واتا هێلکە و سپێرم، کەوایە دوو ڕەگەزن نەک زیاتر.

- بەڵام دادگای فیدراڵی لە ساڵی ٢٠١٧دا ڕایگەیاند پێویستە جیا لە «نێر» و «مێ،» لەژێر ناونیشانی «جیاواز»دا جێگا بۆ ڕەگەزی سێیەمیش بکرێتەوە، بۆ ئەو کەسانەی نێوانەڕەگەزن.

- پرۆفیسۆر لیمان: نێوانەڕەگەزی زادەی لادانی زۆر دەگمەنە، بۆ نموونە لە سێتێک کرۆمۆسۆمدا، بەڵام کەسانی نێوانەڕەگەزیش سیفەتی هەردوو ڕەگەزەکەیان تیادایە، ئەوان ڕەگەزی سێیەم نین.

- بەڵام فراوانییەکی زۆر لەناو خودی ڕەگەزەکاندا هەیە.

پرۆفیسۆر لیمان: بێگومان. پیاوی وا هەیە لایەنی ژنێتی تیایدا زاڵە، ژنیش هەیە لایەنی پیاوەتیی بەهێزە، ئەمەیش هۆکاری زۆرە و تەنها پەیوەندیی بە فاکتەرە کلتوورییەکانەوە

نییە، بەڵکو ئاستی هۆرمۆنە جیاوازەکانیش ڕۆڵییان تیایدا هەیە. فراوانییەکی زۆر هەیە، بۆیە بابەتەکە سەرنجڕاکێشە.

ـ بەڵام زاراوە دروستە سیاسییەکە لە ئێستادا ئەوە نییە ئەگەر پیاوێک «وەکو ژن هەستی کرد،» پێویستە کۆمەڵگە و یاسادانەران دەرفەتی بدەنێ لە ڕەگەزی دڵخوازیدا بژی. بەڵکو ئەمەیە: ئەو کەسە پیاو نییە، مادام دەڵێت ژنە، ژنە.

ـ پرۆفیسۆر لیمان: ئەمە قسەی بێمانایە! بیرکردنەوەی ئارەزوومەندانەیە. کەسانێک هەن دەیانەوێت ڕەگەزی خۆیان بگۆڕن، بەڵام ناتوانن. هەر بە دوو ئێکسی (XX) یان بە ئێکس و وای (YX) دەمێننەوە. پرسە چارەنووسازەکە ئەوەیە هەبوون و نەبوونی کرۆمۆسۆمی وای (Y) لە ماوەی دووگیانیدا، هەروەها بێگومان لە هەرزەکارییشدا، کاریگەریی هەیە. بۆیە سیفەتی ڕەگەزیی کچان و کوڕان جیاوازە. ئەم جیاوازییە لەناو نابرێت. وەکو چ ڕەگەزێک لەدایک بوویت، وەکو ئەوە دەمریت. بێگومان لە ڕێگای وەرگرتنی هۆرمۆنەوە هەندێک گۆڕانکاری دەکرێت، بۆ نموونە، ئەگەر کچێک هۆرمۆنی تێستۆستیرۆن وەربگرێت، دەنگی گڕتر دەبێت و ڕیشیشی زیاد دەکات. بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی ئەم کچە ببێت بە خاوەنی گون، هەروەها سپێرمیشی بۆ دروست ناکات. ئەو کەسانەیشی کە لەگەڵ لەدایکبوونیاندا نێرن، ئەگەر هۆرمۆنیشیان بدەیتێ هەر هێلکە بەرهەم ناهێنن و دووگیان نابن. لێرەدا کێشەکە لەگەڵ نەشتەرگەریی و دەستێوەردانە چاکنەکراوەکاندا دروست دەبێت. بەڵام هۆرمۆنەکانیش بێ زیان نین، چونکە شتێک دەخەیتە ناو جەستەوە کە نابێت لەوێدا بێت. هۆرمۆنەکان لەسەر ئاستی جەستەیی و دەروونی، کاریگەریی زۆریان هەیە. بە بۆچوونی من، وەرگرتنی هۆرمۆن بەشێوەیەکی بەردەوام کارێکی مەترسیدارە. لەسەر ئاستی دوورمەودا، جەستە بەرگەی ناگرێت. هەموو ئەو هۆرمۆنانەی وەریاندەگریت، کاریگەریی لاوەکییان هەیە. وەرگرتنی هۆرمۆن هەر لە بنەڕەتەوە مەترسیدارە.

ـ لە داهاتوودا، کەسانی لاوی سەرووی ٤١ ساڵ دەتوانن ڕەگەزی خۆیان دیاری بکەن.

ـ ئەمە شێتییە! زۆرینەی کچان لە تەمەنی ٤١ ساڵیدا ناشادن. خۆم باش ئەوە دەزانم. منیش لە ٤١ ساڵیدا دڵخۆش نەبووم و حەزم دەکرد کوڕ بم. ئەوکات بۆم نەبوو پانتۆڵ لەبەر بکەم، یان قژم ببڕم. زۆرجار قسەم بە خۆم دەگوت و دەمگوت: خۆزگە پیاو بوومایە! ئەگەر حەزت بە کارێک بێت کە زۆرینەی پیاون، بێگومان ڕەنگە حەز بکەیت تۆش پیاو بیت. بەڵام کارە ڕاستەکە ئەوەیە ڕێگایەک بدۆزیتەوە بۆ پشتڕاستکردنەوە و سەلماندنی خۆت. دەبێت کچەکانمان فێری ئەمە بکرێن.

ـ پێتوایە ئەوە ڕاستە کە یاسادەرکەر ڕێگا بە خەڵک دەدات ئەم بەناوگۆڕانە ڕەگەزییە

ئەنجام بدەن؟
- پرۆفیسۆر لیمان: یاسادەرکەر ناتوانێت بڕیاری ڕەگەزگۆڕین بدات. تەنها دەتوانێت بڵێت، لەم چرکەیەوە، ئیدی ئەم ژنە دەتوانێت بڵێت پیاوە و بە پێچەوانەشەوە. بنەڕەتە بایلۆجییەکە بە هیچ جۆرێک ناگۆڕێت. جا ئەگەر ئێستا پیاوێک بڵێت ژنە، پاشان بچێت بۆ یانەیەکی وەرزشی و لەگەڵ ژناندا یاری بکات، کێشەیەکی گەورەمان تووش دەبێت. چونکە بەهۆی هۆرمۆنە نێرەکانییەوە، لە ژنان بەهێزترە و لەوان خێراتر ڕادەکات. وەکو خواردنی ماددەی وزەبەخش وایە. ئەگەر هەر لە بنەڕەتەوە پیاوێک بۆی نەبێت بڵێت ژنە، شتێکی وا ڕوونادات.
- دادگای دەستووریی فیدراڵی چەند بڕیارێکی لەسەر نێوانەڕەگەزی داوە، کە پەیوەندییان بە چەمکی ڕەگەز و جێندەرەوە هەیە. یاساکەی ٧١٠٢ دەڵێت: «لە زانستە پزیشکی و کۆمەڵایەتی و دەروونییەکاندا، کۆڕایی لەسەر ئەوە هەیە ڕەگەز تەنها بەپێی سیفەتە کرۆمۆسۆمییە بۆماوەییەکان دیاری ناکرێت، بەڵکو فاکتەرە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانیش ڕۆڵیان هەیە.» تۆی زیندەوەرزان و براوەی خەلاتی نۆبڵ چیت لەسەر ئەمە هەیە؟
- پرۆفیسۆر لیمان: ئەمە قسەی بێمانایە. هەستکردنی مرۆڤ بەپێی بارودۆخە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان دەگۆڕێت، بەڵام ڕەگەزی ناگۆڕێت. لەو شوێنەی زانست ئەنجام دەدرێت، هیچ گومانێک لەسەر ئەم قسەیەم نییە.
- ئاخر دارشتنەکە هی دامەزراوەی پزیشکیی ئەڵمانییایە.
- پرۆفیسۆر لیمان: وا دیارە ئەمانیش شتێکیان لێ تێک چووە: جیاوازیی نێوان ڕەگەز و جێندەر. بێگومان لە جێندەردا، واتا ڕەگەزی کۆمەڵایەتی، جۆراوجۆری هەیە، بەڵام لە ڕەگەزی بایلۆجیدا تەنها نێر و مێ هەیە. نوقتە سەری دێر. بێگومان دەگونجێت کچێت حەز بکات بە ناوی کوڕەوە باس بکرێت. لە چیرۆکی «پێنج هاوڕێکەدا» جۆرج ئاوایە.
- کاتێک ماری لویس ڤۆلبرێختی خوێندکاری دکتۆرا لە زانکۆی هەمبۆڵدت، لە مەراسیمی شەوانی زانستەکاندا، ویستی وانەیەک لەسەر دووڕەگەزخوازی بدات، خۆپیشاندان کرا، لە ئەنجامدا زانکۆکە وانەکەی لابرد.
- ئێستا ئیدی وانەی زیندەوەرزانیش لادەبەن؟ واتا چیتر نازانین کێین، خەبەرمان لەوە نییە ڕەگەزی مرۆڤ چۆن دیاری دەکرێت؟ لەبەرئەوەی گوایە خراپە، چیتر فێری نەبین؟ بیرمە لە کۆتایی هەشتاکاندا کەمپینیان دژی ئەو توێژەرە دەکرد کە جینی وایی (Y) دیاریکەری ڕەگەزی دۆزیبوویەوە. بەڕواڵەت، ئەو بە ئەنجامدانی کارێکی قێزەون دژی مرۆڤایەتی تۆمەتبار دەکرا، چونکە جینێکی دۆزیبوویەوە کە هانی بەرهەمهێنانی

تێستۆستیرۆنی دەدا. ئەوە شێتانە بوو، من تۆقیبووم! بەڵام لێرەوە ڕوونە خەڵکی هیچ لەسەر زیندەوەرزانی نازانێ، کەمی خوێندەواری و پەروەردە لەم بوارەدا زۆر خراپە.

ـ خودی خۆت ئەزموونی ئەم دژایەتییەی ڕاستی و زانستت کردووە؟

ـ پرۆفیسۆر لیمان: بێگومان. توێژینەوەکردن لەسەر کۆرپەلە بەسە بۆئەوەی وەکو خراپەکارێک دەربکەویت، چونکە هەموان وا هەست دەکەن تۆ خەریکی دەستکاریکردنی کۆرپەلەکانی. هەموو ئەوەی پێویست بوو ئەوە بوو بڵێم توێژینەوە لەسەر کۆرپەلە دەکەم – تەنانەت گەر کۆرپەلەکە هی مێشیش بووبێت – هەتاکو هێرشم بکرێتە سەر! بەداخەوە، دژایەتیکردنی زانستی لە ئەڵمانیا ئاشکرا و زارەکییە. ڕەنگە لە دوای کۆرۆناوە کەمێک باشتر بووبێت. زۆرێک لە خەڵکی بۆیان دەرکەوت دەبێت گوێ لە زانست بگرن. ئاشکراشە گوتنی ئەوەی ڤایرۆسەکە بوونی نییە، تەنها لەبەرئەوەی حەز ناکەیت بوونی هەبێت، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت و لە ئەنجامیشدا خۆت زەرەر دەکەیت.

ـ ئێستا گەیشتووینەتە خاڵێکی نوێ، چیتر بابەتەکە ئەوە نییە چ زانستێک ڕێگاپێدراوە، بەڵکو بریتییە لە «زاڵبوونی بیرکردنەوەی خەیاڵی بەسەر مەعریفەی زانستیدا.»

ـ لە بنەڕەتدا، ناکرێت وانەیەک قەدەغە بکەیت، تەنها بە بیانووی ئەوەی دەکرێت کێشەیەکی هەبێت. بەڵام ئەو خوێندکاری دکتۆرایەی باست کرد ویستوویەتی شتێک ڕوون بکاتەوە کە لە هەموو مەنهەجێکدا هەیە. ئەو ئاوێتەبوونی خۆبەگەورەزانینی ئەخلاقی و نەفامییەی لێرەدا هەیە کوشندەیە.

ـ نکوڵیکردن لە حەقیقەتە بایلۆجییەکان تا ئاستێکی باوەڕپێنەکراو دەڕوات. بەم دواییانە، چالاکوانە ترانسەکان داوایان کردووە زیێ مێ وای پێ نەگوترێت، چونکە ئەوان دەڵێن زێ مێ مەرج نییە ئەندامێکی جەستەی مێ بێت.

ـ پرۆفیسۆر لیمان: بێگومان زێ ئەندامێکی زاوزێی جەستەی مرۆڤی مێیە! پێویست دەکات ئەم کەسانە بە جددی وەربگرین؟

ـ ئەوە ڕوونە.

ـ پرۆفیسۆر لیمان: ئەوەی کە نابێت ئازاری ترانسەکان بدرێت ڕوونە. مامەڵەکردنی خراپ خراپە، بەڵام بۆیان نییە بیرۆکەکانیان وەکو حەقیقەت بەسەر هەموو خەڵکدا بسەپێنن.



د.دانیال سەعدی حامد
پزیشکی پسپۆڕی تەندرووستی دەروونی و دکتۆرای نەخۆشییە دەروونییەکان

# نەخۆشی دەروونی یان بژاردەی سێکسی



ئایا لادانە سێکسییەکان نەخۆشین یان نا؟ کە وتت لادانی سێکسی، لادان واتە نەخۆشی، ئەوە بابەتێکە تێکەڵاو ئەبێت لەگەڵ بابەتگەلێکی تردا کە زیاتر ئەو هەستە دەگرێتەوە کە خەڵکێک بەشێوەیەکی بایۆلۆجی و فسیۆلۆجی کە لەدایک ئەبێت، بە ڕەگەزێک لەدایک ئەبێت، بەڵام هەستەکەی کە لە ناخی خۆیدا بۆی دروست دەبێت لە سەردەمی منداڵیدا یان هەندێ جار لە سەردەمی باڵغ بووندا بۆی دروست دەبێت، ئەویش ئەو هەستەیە کە حەزەکات کە ڕەگەزی بەرامبەری هەیە، کە حاڵەتی گەی و حاڵەتی دیسبەین دەگرێتەوە، هەندێ حاڵەتیشمان هەیە کە کەسەکە حەزەکات لە هەمانکاتدا هەردوو ڕەگەزەکەی هەبێت، ئەمە بابەتێکە بابەتی تریش کە بریتییە لە لادانە سێکسییەکان ئەویش ئەوەیە کەسەکە حەزی سێکسی بۆ ئەو شتەیە کە نابێ حەزی سێکسیت بۆی هەبێ، یان هەستی جنسیت بۆی ئەجوڵێ، کە نابێت هەستی جنسیت بۆ ئەو شتە بجوڵێت، ئەمەش بابەتێکە کە نەخۆشییە، هەروەها لە لادانە سێکسییەکاندا (سێکشن دیزۆڵدەر) ئاماژەی پێکراوە.

بابەتێکی تریش هەیە کە سێیەم بابەتە کە باشتر وایە باس بکرێت، ئەویش ئەوەیە کە کەسانێک هەن لەڕووی سێکسییەوە کێشەیان هەیە، ئەویش ئەتوانین بڵێین ٣٠٪ی ئافرەت و ٣١٪ی پیاو ئەم حاڵەتەیان هەیە، ئەمانە لەکاتی ئەنجامدانی سێکسدا کێشەیان بۆ دروست دەبێت، بابەتەکەش بەمشێوەیە کە ڕوونی دەکەینەوە.

بۆ ئەنجامدانی سێکس ئێمە پێویستمان بە سایکڵێک هەیە، پێویستمان بە بازنەیەک هەیە بۆ ئەنجامدانی سێکس، ئەو خەڵکانە ئەم بازنەیان تەواو نیە، ئەویش ئەوەیە یان لە ئەسڵدا وروژاندنیان نیە، کە ئەڵێین وروژاندنیان نیە، واتە لەناو مێشکیاندا حەزی جنسییان نیە، نە بۆ جنسی بەرامبەر، نە بۆ هیچ جۆرە جنسێک، بۆ ئەنجامدانی سێکس ئەم حەزەیان نیە. جۆرێکی تریان ئەوەیە کە حەزەکەی لە مێشکیدا هەیە، بەڵام وروژاندنی نیە، ناوروژێت بۆ ئەنجامدانی سێکسەکە. جۆرێکی تریشیان ئەوەیە کە حەزەکەی هەیە، وروژاندنیشی هەیە، بەڵام هەرگیز ناگاتە ڕەحەت بوون. جۆرێکی دیکەیشیان ئەوانەن کە لەکاتی ئەنجامدانی سێکسدا ئازاریان هەیە، هەمان سێکشن دیسپۆڵشن بەشێوەیەکی گشتی، ئەمە تەفاسیلێکی زۆر دوورودرێژی هەیە، لە بواری دەروونیدا باس دەکرێت.

یەکێک لە بابەتەکان کە زۆر قسەی لەبارەوە کراوە، ئەوە هەر لە کۆنەوە هەتاکوو دەروون پزیشکی تازە و دەروونزانی تازە، یەکێک لەوانە کە قسەی لەسەر کرد فرۆید بوو، چەند سۆسیۆلۆجستێکی دوور وەکو جۆن سۆلۆمۆن کرۆس و ئەوانە

قسەیان لەسەر ئەکرد، بابەتی هۆمۆسۆشوالیەتی بوو، هەستی سێکسیت هەبێت بۆ هەمان جنسی خۆت، کە هەر لە کۆنەوە، لە بیردۆزی گەشەکردنی ئینسانەوە فرۆید باسی لەوە کرد کە عوقدەیەک هەیە لە ئینسانندا لە چوار پێنجساڵیدا دروست ئەبێت، ئەویش ئەوەیە کە کوڕ حەزی لە دایکی خۆیەتی و کچ حەزی لە باوکی خۆیەتی، ئەم هەستە زوو جواب درایەوە، دیپ و ئەلکتراکۆمپلێکس قسەی لەسەر کرا، کە ئەویش لە یۆنانییەکانەوە وەریگرتبوو، کە یەکێک لە یۆنانییەکان حەزی لە دایکی خۆی ئەبێت و باوکی خۆی ئەکوژێ بۆئەوەی بگات بە دایکی خۆی، کچێکیش هەستی بۆ باوکی خۆی ئەبێت و دایکی خۆی لەناو ئەبات، بە هەرحاڵ ئەمە قسەی زۆر لەسەر کرا، وابزانم باسی ئێمە نییە قسەی لەسەر بکەین.

لادانە سیکسییەکان، یان ئینحرافاتە سێکسییەکان یان پارافیل، پارافیلێکی زۆر، ئەمە هەمووی یەک ناوە بۆ لادانی سێکسی، ئەویش ئەوەیە کە کەسێک هەبێت هەستی سێکسی بجولێت یان خەیاڵاتی سێکسی بکات یان ڕەحەت ببێ بەشتێکەوە کە خۆی لە ئەسڵدا هی سێکس نیە، لەم حاڵەتانە نزیکەی دە جۆرمان هەیە، وەکو پیدۆفیلیا، ئەو کەسانەی بەس تەنها زەوقیان لە منداڵ و مێردمنداڵ هەیە، حەزئەکەن سێکس لەگەڵ منداڵدا ئەنجام بدەن، خەیاڵاتی منداڵیان هەیە، یان بەس بە منداڵ ڕەحەت ئەبن، یان بە مێردمنداڵ، ئەمە تێکەڵیش ئەبێ بە بابەتی یاسایی و بابەتی تاوانکاری. فیکیشیزممان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەندێ کەس هەیە بەس تەنها بە شتانێکی نازیندوو هەستیان دەجولێ، وەکو ئەوەی هەندێ کەس بە پێڵاوی ئافرەتانە، یان بە جلوبەرگی ئافرەتانە، یان بە ماکسی ئافرەتانە زەوقی ئەجولێت، بە شتی نازیندوو، ئەمانە گیانلەبەر نین، هەندێ کەس هەیە پێڵاوی ئافرەتانە ئەیوروژێنێ، خەیاڵ بە پێڵاوی ئافرەتانەوە لێ ئەدا، ئەگەر بیەوێ ڕەحەت بێت ئەبێ پێڵاو ببینێ، بەوشێوەیە بە عەکسیشەوە بۆ ئافرەتیش هەندێ جار وایە. جۆرێکی ترمان هەیە، کە فۆیریزی پێ دەوترێت، ئەویش ئەوەیە کە کەسێکە حەزدەکات چاودێری کەسی بەرامبەر بە ڕووتی بکات، واتە حەز دەکات بیبینێت، لە درزی دەرگایەکەوە یان لە پەنجەرەیەکەوە سەیری دەکات، ئەمیش حاڵەتێکە، بەس تەنها حەز دەکات سەیری بکات، نەک سێکسی لەگەڵ بکات، یان قسەی لەگەڵ بکات، یان دەستی لێ بدا یان شتێک، بەس تەنها سەیری ئەکات.

جۆرێکی ترمان هەیە لە لادانە سێکسییەکان، ئەویش ئەوەیە کە کەسێک حەز دەکات دەست بهێنێت بە ئەندامی سێکسی یەکێکی تردا یان بیگوشێ، بەڵام بەبێ







**لادانە سیکسییەکان، یان ئینحرافاتە سێکسییەکان یان پارافیل، پارافیلێکی زۆر، ئەمە هەمووی یەك ناوە بۆ لادانی سێکسی، ئەویش ئەوەیە: کەسێك هەبێت هەستی سێکسی بجوڵێت یان خەیاڵاتی سێکسی بکات بەشتێکەوە کە خۆی لە ئەسڵدا هی سێکس نیە.**

ڕەزامەندی خۆی، واتە ئەڕواتە بازاڕ بۆ ئەوەی دەست بهێنێ بە سمتی کەسێکدا، یان دەستبهێنێ بە زەکەری پیاوێکدا بەبێ ڕەزامەندی خۆی، بەبێ حەزی خۆی، بەبێ ویستی خۆی، ئەو ئەو شتەی پێخۆشە، ئەمەش لادانێکی سێکسییە. لادانێکی سێکسی ترمان هەیە، ئەویش ئەوەیە ئەندامی جنسی خۆی دەرئەهێنێت بۆ کەسێک کە ناشی ناسێت، نەشیبینیوە، لەسەر شەقامێکدا یان شوێنێکی چۆڵ یاخود لە شوێنێکی قەرەباڵغدا، حەزدەکات نیشانی بدات، کەسەکە بەمە مورتاح دەبێت، ئەمە ئێکسی دشینیزمی پێدەوترێت.

جۆرێکی تر سێکشاڵ مەسەکسیزمی یا ماسۆشیزمی پێ دەوترێ، ئەویش ئەوەیە کە هەندێ کەس هەیە حەزدەکات لەکاتی ئەنجامدانی سێکسدا لێی بدرێت، ئیهانە بکرێت، جنێوی پێ بدرێت، ئا بەو لێدان و جنێو پێدان و تف لێکردن و ئەوانە ئەو ڕەحەت ئەبێت و دڵی پێی خۆشە، ئەمیش هەر لادانە.

جۆرێکی ترمان هەیە پێی دەوترێت سێکشاڵ سادیزم، ئەویش ئەوەیە بە عەکسەوە حەزدەکات لەکاتی ئەنجامدانی سێکسدا ئەوکەسەی کە سێکسی لەگەڵدا دەکات لێبدات، واتە فاعیلەکە لە ئەو بدات، ئەمە سادیزمی پێ ئەوترێت، ئەم بەوە ڕەحەت ئەبێت کە لە بەرامبەرەکەی بدات، تف لە بەرامبەرەکەی بکات، بە پێچەوانەی ماسۆشیزیم، ماسۆشیزم حەزدەکات تفی لێ بکریت و جنێوی پێ بدرێت و لێی بدرێ، بەڵام سایدیزم بەپێچەوانەوە حەزدەکات ئەم لە ئەو بدات، ئەمەش جۆرێکی بەناوبانگە لە کتێبەکاندا زۆر باس کراوە.

جۆرێکی ترمان پێی دەوترێت کانزفۆتیک فۆشۆسیزم، ئەویش ئەوەیە کاتێک زەوقی ئەجوڵێت یان فەنتازیای بۆ دروست ئەبێت یان ڕەحەت ئەبێت کە جلی بەرامبەر لەبەر بکات، پیاوە حەزدەکات کە لەو کاتەدا جلی ژنانە لەبەر بکات، ژنە حەزدەکات جلی پیاوانە لەبەر بکات، ئەمەش بابەتێکی ترە.

چەن جۆرێکی تری لادانی سێکسیمان هەیە، ئەویش ئەوانەن کە هەندێ جار حەزدەکەن لەگەڵ کەسی مردوو یان حەیواناتدا سێکس بکەن، ئەمانەش چەند جۆرێکی دەگمەنن، واتە حەزدەکات لەکاتی ئەنجامدانی سێکسەکەدا بەوشیوەیە بێت، یان تەنها بەس بەوە ئەوروژێت کە بە تەلەفۆن لەگەڵ کەسێکدا سێکس ئەنجام بدات.

جۆرێک لە لادانە سێکسیەکانمان هەیە، ئەویش ئەوانەن کە حەزدەکەن، یا بەوە ئەوروژێن و ڕەحەت ئەبن کە کەسی بەرامبەر ببینن کە لەکاتی ئەنجامدانی سێکسدا میز بکات، یان میزیان پیا بکات، میز بکات بە دەم و چاویاندا، ئەمانە هەموویان لادانی سێکسین.

ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی لادانە سێکسییەکان بوو، ئەوانە کێشەی سێکس بوو، ئەویتریشیان کێشەی تیگەیشتنی، یان ئەو هەستە بوو کە لە مێشکدا هەیە بۆ سێکسی خۆت، کە ئەویش ناومان نا، ئەوەی کە کوڕن لە مێشکی خۆیاندا، بەڵام خۆی ئەندامی کچانەی بۆ دروست کراوە، بەپێچەوانەوە، ئەو حاڵەتە هەیە.

کەواتە، ئێمە لە سێ ڕەهەندەوە سەیری سێکس و لایەنی دەروونی دەکەین، ڕەهەندی یەکەم گرفت لە ئەنجامدانی سێکسدا، ئەویش وتمان ئەکرێت بە چوار بەشەوە، نەبوونی حەز، بەشی دووەم حەزەکە هەیە، بەڵام وروژاندنەکە نیە، یەکێکی تریان ئەوەیە وروژاندن هەیە ڕەحەت بوون نیە، ڕەهەندێکیشیان ئەوەیە کە ئازاری هەیە لەکاتی ئەنجامدانیدا. ئەمە لایەنێکیان، لایەنی دووەمیان ئەو لادانانە بوون کە باسمان کردن بە فیدیڵ زم و شیزیم و سادیزم و مەسۆشیزم و ئەو لایەنانەی تر، ئەمە لادانە و نەخۆشییە، سیکشۆڵ دیزۆردەری پێ ئەوترێ، نەخۆشییەکانی سێکسی پێ دەوترێ، ئەویش ئەوەیە کاتێک کە شتیک قابیلی ئەوە نەبێ کە تۆ سێکسی لەگەڵدا بکەیت، سێکسی لەگەڵدا ئەکەی، یان زەوقت پێی ئەجوڵێ، یان ڕەحەت ئەبی پێی، بەکورتی، باسی هەر دە جۆرەکەیمان کرد. ئەمەش لایەنی دووەم، لایەنی سێیەمیشیان ئەو ڕەهەندەیە کە کەسەکە هەستی ئەو جۆرە سێکسەی کە هەیە نیەتی، ئەو هەستەی نییە، واتە لە لای ئەگۆڕێت، بە جۆرێک

فسیۆلۆجی و بایۆلۆجیەکەی جۆرێکە، بەڵام ئەو ئۆرێنتشنەی کە لە مێشکی خۆیدا هەیە، دایناوە بۆ ئایندەی خۆی، جۆرێکی ترە، واتە بە کچ دروست بووە، بەڵام کوڕە، تەزبیحی پێیە، بنێشت ئەخوات و جلی کوڕانە لەبەرەکات و قژی کورت ئەکاتەوە، ئیتر بەوشێوەیە، ئیتر دەربڕینی ئەمە جاری وا هەیە دایک و باوکی منداڵەکە هەست پێ ئەکەن، جاری وا هەیە هەستی پێ ناکەن، بەپێچەوانەکەشی هەیە، هەیە هەستەکەی لە هەردوولا هەم کوڕیش و هەم کچیش ئەو هەستەشمان هەیە، واتە دەتوانین کورتی بکەینەوە لەم سێ شتەدا.

سەرجەم ئەم حاڵەتانە لادانن و لە ڕووی زانستییەوە بە نەخۆشین ئەژمار دەکرێن، ئەمە لە ناوەندە زانستییەکانی دنیادا هەروەها بووە، هەتا ساڵی ١٩٩٣ لە مەنهەجی زانستگەکانی ئەمەریکاش DSM٥ هەروەکو لادان دەخوێنرا، بەڵام لەو ساڵە بەدواوە، هاوڕەگەزبازییەکەیان لەناو مەنهەجی خۆیان لابرد و ئیدی وەک حاڵەتی ئاسایی مامەڵەی لەگەڵ دەکەن، دەشیانەوێت ئەمە بگوازرێتەوە بۆ سەرتاسەری جیهان.

دیارە ئەمەش هەڵەیە، چونکە سروشتی کۆمەڵگەکان جیاوازن، لە کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتیدا هاوڕەگەزبازی نامۆ و ناباوە، بۆیە ئەوانەی دەیکەن بە لادەر سەیر دەکرێن، ئەگەر هاوڕەگەزبازی لە ئەمەریکا و ڕۆژئاواش بە ئاسایی دابنرێت، لە کۆمەڵگەکانی دیکەدا، هەرگیز ئاسایی نیە.



نووسینی: عادل صدیق

# هەڵویستی پارتی دیموکراتی تورکیا
# بەرامبەر بە ئایین
## (١٩٥٠-١٩٦٠)

**پێشەکی:**

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی تورکیای هاوچەرخ لەسەر داروپەردووی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دامەزرا، کەمال ئەتاتورك لە ڕێگەی کۆمەڵێك ڕیفۆرمەوە دەیویست وڵاتەکەی مۆدێرنیزە بکات، لەو ڕووەوە ڕیفۆرمە ئاینییەکانی بە یەکێك لە سیما هەرە دیارەکانی سەردەمەکەی دادەنرێت، ڕیفۆرمێك کە زۆرگران لەسەر شانی هاوڵاتیانی تورکیا کەوت. ئەتاتورك لەپێناو دابڕینی تورکیا لە مێژووەکەیی و دواتریش جیهانی ئیسلامی هەوڵێکی زۆریدا بۆئەوەی ئایین بەتەواوی لە ژیانی کۆمەڵایەتی هاوڵاتیانی تورکیا داببڕنێت، ئەوەش لەڕێگەی پرۆسەی بەعەلمانیکردنی وڵاتەکەیەوە. ناوبراو بۆ سەرخستنی کارەکەی کۆمەڵێك ڕێ و شوێنی توندوتیژی گرتەبەر و بەدواشیدا چەردەیەك بڕیار و یاسای توندی لە حکومەت و پەڕلەمان بۆ دەرچواند.

لەڕاستیدا ئەو بڕیار و یاسایانە هەروا بە ئاسانی بۆ کۆمەڵگەی تورکی و پێکهاتەکانی ئەو وڵاتە قووت نەدەچوون، بۆیە سەربازی فشارە زۆر و توندەکانی حکومەت، ئایین وەک بەشێک لە کایە گرنگەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵک هەر مایەوە و ڕۆڵی خۆی بینی، ئەگەرچی بۆماوەیەک ڕۆڵەکەی لاوازبوو، بەڵام دوای مردنی ئەتاتورک و زیاتریش بەهۆی گۆڕانکارییەکانی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی و دواتر، ئینینۆ و حکومەتەکەیان ناچار بە هەندێک گۆڕانکاری لە شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ ئایین و بەشێک لە ڕێ و ڕەسمە ئاینییەکانی کۆمەڵگەدا کرد، ئەم پرسە دوای هاتنی پارتی دیموکرات بۆ سەر حوکم هەنگاوی گەورە و گرنگتری بڕی، ئاسانکاریی و کرانەوەکانی ئەو پارتە بەڕووی ئاییندا گۆڕانکاری بەسەر زۆر بواردا هێنا. ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین بەکورتی تیشک بخەینە سەر ڕەوشی ئایینی لە تورکیا لە ماوەی دە ساڵی دەسەڵاتدارێتی پارتی دیموکرات و چۆنیەتی مامەڵەی ئەو پارتە لەگەڵ ئەم بابەتە هەستیارەدا.

## بەشی یەکەم/ ڕەوشی ئایینی لە تورکیا بەر لە هاتنی پارتی دیموکرات

### باسی یەکەم/ کەمال ئەتاتورک و ڕیفۆرمە ئاینییەکانی

دوای دامەزراندنی دەوڵەت و لە گەرمەی ئەو شەڕە دەرەکیی و ناوەکییانەدا، مستەفا کەمال ساڵی ١٩٢٤ گۆڕانێکی گەورەی لە بونیادی دەوڵەتدا هێنایە کایەوە کە ئەویش گۆڕینی ئیمپراتۆری ئایینی و فرەنەتەوەیی عوسمانی بوو بە دەوڵەتێکی تاک نەتەوەیی و کۆماریی و عەلمانی(١).

ئەتاتورک لەڕێگەی پرۆسەیەکەوە کە دەستیدابوویە دەیویست تورکیا مۆدێرنیزە بکات، زۆربەی زۆری ئەوانەشی کە خواستی مۆدێرنیزەکردنی تورکیایان هەبوو، لە ڕیزی پارتی گەلی کۆماریدا کۆبوونەوە. ئەو حیزبەش ئەوە بوو کە ئەتاتورک لە ساڵی ١٩٢٣دا دروستیکرد بەمەبەستی مسۆگەرکردنی پشتیوانی پێویست بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی خۆی لەمەڕ مۆدێرنیزەکردن و عەلمانییەت بەشێوەیەکی تایبەت(٢). کەمالیستەکان هەروەک ئیتیحادییەکانی پێش خۆیان، جێبەجێکەری سیاسەتێکی مۆدێرنیزە بوون کە بناغەکەی لە دیدێکی پۆستیڤیستی جیهانییەوە بنیاتنرا بوو. ئەوەی ئایینی بە ڕێگرێک لە بەردەم پەرەسەندنی مۆدێرنیزەکردنی کۆمەڵگە و دەوڵەت دەزانی. مۆدێرنیزەکردنی ئەوان زۆر لەوە زیاتر نەبوو کە کەنیسەی لە دەوڵەت جیاکردەوە. وەک

---

١. سامی شۆڕش: تورکیا و ئەوروپا کورد لەو بازنەدا، چ١، چاپخانەی خانی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٤.

٢. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٣)، ساڵی سیازدەهەم، تشرینی دووەمی ٢٠٠٥، ل١٦٣.

ئامرازێکی ملکەچپێکردن و هەروەها پێکەوەگرێدانی ئایین بە بیرۆکراتییەتی دەوڵەتەوە(١).

جگەلەمە، عەلمانییەتی ئەتاتورک ڕوخسارێکی یاسایی و کارگێڕیشی وەرگرت و لەوەدا دەرکەوت کە هەوڵیدا گرۆتینی ئایین لە تورکیادا خامۆش بکات و لەو سەروبەندەدا چەندەها یاسا و دامەزراوەی تایبەت بەکاروباری ئایین بەرکەنار کران و لەجێی ئەوان یاسا و دامەزراوەی مەدەنی دانران. وەک دەستپێک خەلافەت بەپێی یاسای ژمارە (٤٢٩) ی ٣ی ئازاری ١٩٢٤ هەڵوەشێنرایەوە، ئەویش پاش ئەوەی کە مستەفا کەمال چەند جارێک ڕایگەیاند کە خەلافەت گرنگی خۆی لەدەستداوە و هیچ پاساوێک بۆ مانەوەی نییە(٢). دوو ڕۆژ دواتر سوڵتان و خانەوادەکەی بە چەند ئۆتۆمبێلێک ڕەوانەی سنوور کران و دوورخرانەوە(٣).

بەهەڵوەشانەوەی خەلافەت کۆتایی بە گەورەیی و باڵادەستی تورکیا لە جیهانی ئیسلامی هێنا و بوو بەیەکەمین دەوڵەتی ئیسلامیش کە ئایینی لە سیاسەت جیاکردەوە، ئەتاتورک ئیسلام و زانایانی ئایینی بە مەترسییەکی گەورە بۆ سەر دەسەڵات و سەروەری حوکم ئەزانی، هەر لەبەرئەوەش بوو پەلەی کرد لە دروستکردنی کۆمەڵێک دامەزراوەی یاسایی بۆ لێدان لە دامەزراوە ئاینییەکان و دانانی سنورێک بۆ چالاکییان(٤). سەیرەکە لەوەدایە، سستەمی عەلمانی بەلای مستەفا کەمالەوە ئەوە بوو ئیتر ئایین وەک بەهایەکی مرۆیی و ئاسمانی سەیر نەکرێت. لێرەوە دروستکردنی مزگەوتی نوێی لە وڵاتەکەیدا قەدەغەکرد و ژمارەیەکی زۆریش لە مزگەوتەکانی سەردەمی عوسمانی کرد بە مۆزەخانە و تەواوی قوتابخانە ئاینییەکانیشی لە وڵاتدا داخست(٥). دواتر زمانی عەرەبی و (ئەلف با) عەرەبییەکەی عوسمانیشی گۆڕی بە ئەلف بای لاتینی(٦).

---

١. ئێریك جەی زۆچەر: مێژووی هاوچەرخی تورکیا، و.د.یاسین سەردەشتی، چ٢، چاپخانەی سیما، سلێمانی ، ٢٠١١، ل٣٤٣.

٢. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: تورکیای نەبەرد لەپێناو مانەوەدا، لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٣٠٧ ؛ فايزة علوش: مصطفى كمال أتاتورك وموقفه من الخلافة العثمانية(١٨٨١-١٩٣٨)، رسالة الماجستر فی تخصص التاريخ المعاصر، جامعة محمد خيضر ـ بسكرة، ٢٠١٤-٢٠١٥، ص٨٣ ؛ كرم أوكتم: تركيا الأمة الغاضبة، ت.مصطفى مجدى الجمال، ط١، القاهرة، ٢٠١١، ص١١.

٣. محى الدين ميدانى: الثورة التركية من دور السلطنة الى عهد الجمهورية، بيروت، ١٩٣٢، ص٧٦.

٤. د.كريم مطر حمزة الزبيدى: موجز تاريخ تركيا فی القرن العشرين، المطبعة جعفر العصامی للطبع والتجليد الفنی، مؤسسة ثائر العصامي، ٢٠٢٠، ص١٨٤.

٥. شامی شۆڕش، ل٢٤ ؛ مەنال لوتفی: تورکیا لە ئەتاتورکەوە بۆ ئەردۆگان، و.مەجید ساڵح و موحسین ئەدیب، چ١، چاپخانەی ڕوون، ٢٠٠٨، ل١٢٨-١٣٢ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل١٠٧، ٣٠٨.

٦. فايزة علوش:: م.س، ص٨٥.

یەکێکی دیکە لە کارەکانی مستەفا کەمال ئەتاتورک ئەوە بوو (١٩٢٥) بانگدانی نوێژی لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی تورکی گۆڕی. کارێک کە کاردانەوەی توندی خەڵکە مسوڵمانەکەی ئەو وڵاتەی لێکەوتەوە، بۆیە بەناچاری لە ساڵی ١٩٣٣دا ئەم یاسایەی هەڵوەشاندەوە. لەهەمانکاتیشدا دروستکردنی مزگەوتی نوێ و قوتابخانەی ئایینی لە وڵاتەکەیدا قەدەغەکرد. داپۆشینی جلوبەرگی ئایینی(جوببە و عەمامە)ی قەدەغە کرد و سستەمێکی تایبەتی لەم بوارەدا بەسەر کۆمەڵگەدا سەپاند(١). ڕۆژی پشووی لە هەینییەوە گۆڕی بۆ یەکشەممە(١٩٢٨)، هەروەها ڕۆژژمێریشی لە کۆچییەوە گۆڕی بە زاینی(٢).

لێرەوە سیاسەتە ڕیفۆرمخوازییەکەی ئەتاتورک سێ ئەنجامی گرنگی لێکەوتەوە، کە دواتر کاریان کردە سەر هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی و سیاسی مێژووی تورکیا:

١- کۆنترۆڵکردنی ئایین لەلایەن دەوڵەتەوە، بەپێچەوانەی دەوڵەتی عەلمانییەوە کە تیایدا حکومەتەکان دەست لە کاروباری ئایین وەرنادەن.

٢- فراوانبوونی عەلمانیەت، لە سەرەتای ساڵانی بیستەوە هەتا کۆتایی چلەکان، ئەوەی کە بەسەر کۆمەڵگەکانی شار و چینە ڕووناکبیرەکانی تورکیادا زاڵ بوو عەلمانییەتێکی توندڕەو بوو، چونکە کەمالیستەکان باوەڕی تەواویان بەوە هەبوو کە پێویستە دەوڵەت بەشێوەیەکی توندوتۆڵ کۆنترۆڵی ئایین بکات، ئەم سیاسەتەش وڵاتی بەو ئەنجامە گەیاند کە نەوەیەکی نوێی ڕووناکبیر پەیدا ببێ کە یان هیچی دەربارەی ئیسلام نەدەزانی یاخود زانیارییەکانی لەو ڕووەوە فرەکرچ و کاڵ بوو. ئیدی تورکەکان ئەو بۆچوونەیان لەلا پەیدابوو کەوا تەماشای عەلمانییەت بکەن مەزهەبێکە بەتەواوی لەگەڵ کەمالیزمدا دەگونجێت، چونکە کەمالیزم باوەڕی تەواوی بەوە هەبوو کە دەبێ دامودەزگای ئاینیی ملکەچی دەوڵەت ببێ، کارگەیشتە ئەو ڕادەیەی کە هەموو لادانێکیان لە عەلمانییەتی مۆدیل ئەتاتورکییانە بە کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی لەقەڵەم دەدا.

٣- دوورخستنەوەی زانایانی ئایینی و ئایندارەکان، کەمالیستەکان توانیان سەرکەوتووبن لە بانگەشەکردن بۆ عەلمانیەت لەنێو ناوەندە ڕووناکبیرییەکاندا، بەڵام لەنێو گوند و دانیشتوانی شارە بچووک و دوورە دەستەکاندا ئەو ئەنجامەیان بەدەست نەهێنا، ئەگەرچی ڕژێم هەوڵیدا ئیسلامی ڕەسمی ملکەچ بکات و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، بەڵام لە ملکەچکردنی ئیسلامی جەماوەریدا شکستی خوارد، چونکە

---

١. مەنال لوتفی: س.پ، ل١٢٩.

٢. فایزة علوش: م.س، ص٨٥.

هەڵسوڕان و چالاکی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان بەشێوەیەکی نهێنی بەردەوام بوون لەسەر کار خۆیان(١).

بەوپێیە ناوەڕۆکی عەلمانییەتەکەی ئەتاتورک سەرەتای ڕێچکەیەکی ئایدۆلۆژی گرتەبەر(٢)، ئەوە لەکاتێکدا تورکیا وڵاتێکە زۆرینەی دانیشتوانەکەی مسوڵمانن، هەندێک لە ئامارەکان ڕێژەی مسوڵمان لەو وڵاتەدا بە (٨٥٪ -٩٠٪) دەخەمڵێنن، زۆرینەی ئەو ڕێژەیەش سوونني مەزهەبن و کەمینەیەکیش سەر بە مەزهەبی شیعەن. کۆمەڵگەی ئیسلامی لە تورکیادا ڕیشەیەکی مێژوویی کۆنی هەیە. بۆ ماوەی زیاتر لە شەش سەدە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بنکەی خیلافەتی ئیسلامی بووە. لەوەش گرنگتر، ئەوەی نەتەوەی تورکی لە سەدەی سیازدەهەم لە ژیانی خێڵایەتی ڕزگارکردووە و فێری نیشتەجێبوونی کردووە و گەیاندوونی بە پایەی ئەمڕۆیان، ئاییني ئیسلام بووە. بۆیە هەوڵ و تەقەلاکانی سیستەمی ئایدۆلۆژیا پەرستەکەی کەمالی بۆ پچڕاندنی هەموو جۆرە پەیوەندییەکی کۆمەڵگەی تورکی بە پاشخانی ئیسلامی و شارستانییەتی ئیسلامییەوە، ڕەنگە لە هەوڵێکی بێ ئەنجام بەولاوە هیچی دیکە نەبێت(٣).

یەکێکی دیکە لە هەڵەکانی کەمال ئەتاتورک ئەوەبوو کە دەیویست لەڕێگەی خۆپچڕاندن لە ئیسلام و کەشوهەوای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕێگەی بەعەلمانیکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگەوە جێبەجێ بکات(٤)، ئەوە لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵکی تورکیا هەر لە ماناي عەلمانیەت نەدەگەیشتن و بۆڵەیان دەهات و دەیانپرسی عەلمانیەت چییە(٥)؟

هەڵەی ئەتاتورک لەو مەیدانەدا ئەوەبوو، کە ویستی لە ڕێگەی قەدەغەکردنی ئایینەوە سستەمی عەلمانی لە وڵاتەکەیدا بسەپێنێت. بەڵام بەپێچەوانەوە، سڕینەوەی ئایین کارێکی کرد دەوڵەت و کۆمەڵگە لە تورکیادا پێناسەی خۆیان ونبکەن و دوچاری قەیران و سەرلێشێوانێکی ڕۆشنبیریی و کەلتووریی گەورە ببن. هەندێک لە لێکۆڵەرەوەی شارەزا لە بواری تورکیاناسیدا پێیانوایە قەیرانی ونکردنی پێناسە لە هەموو کێشەکانی دیکەی وەک قوبرس و کورد و ئەرمەن بۆ تورکیا کاریگەرتر و گەورەتر بوو. لەڕاستیدا ڕیفۆرمەکانی ئەتاتورک هەروا بێ کێشە و بێ ڕەخنە تێنەپەڕی، بەتایبەتی لەلایەن نەوەی یەکەمی ئەو تورکانەی کە گۆڕانکارییە لەناکاوەکانی ئەتاتورک تووشی کێشەی کردبوون.

---

١. د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: ئایندەی ڕووبەڕووبونەوەی عەلمانیەت و ئیسلام لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٢)، ساڵی پانزەهەم، ئابی ٢٠٠٧، ل٨٧-٨٨.

٢. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٠٦.

٣. سامی شۆڕش: س.پ، ل٥٩.

٤. هـ.س، ل٦٠.

٥. مەنال لوتفی: س.پ، ل١٣١.

ڕیفۆرمەکانی ئەتاتورک بەبڕیارێک لە سەرەوە دەردەچوون، واتە گەلانی تورکیا داوایان نەکردبوو، بەڵکو بە زۆر دەیسەپاندن، هەربۆیە قەبوڵکردنی ئەو بڕیارانە لە سەرەتاوە زۆر سەخت و قورس بوو(١).

دواجار ئەتاتورک لە ڕێکەوتی ١٩٣٨/١١/١٠دا کۆچی دوایی کرد و عیسمەت ئینینۆ لە پۆستی سەرۆکایەتی کۆمار و پارتی گەلی کۆماریدا شوێنی گرتەوە(٢). سیستەمە عەلمانییەکەشی ئەگەرچی لە سەردەمی خۆیی و چەند ساڵێکیش لە دوای مردنی زۆر بەتوندوتیژی جێبەجێ دەکرا، بەڵام لە دوای مردنی خۆی، ئیتر ئەگەری ئەوە هاتە پێشەوە کە تاڕادەیەک توندوتیژییەکە خاوبکرێتەوە، یان وردتر لەناو خەڵکیدا دەنگۆی ئەوە پەیدابوو کە دەبێت عەلمانیەتەکە وایلێبکرێت کە توانای گونجانی هەبێت لەگەڵ ئایین و ژیانی ڕۆحی کۆمەڵگەدا(٣).

**باسی دووەم/ ڕەوشی ئایینی لە سەردەمی عیسمەت ئینینۆدا(١٩٣٨-١٩٥٠):**

پاش کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی(١٩٤٥)، عیسمەت ئینینۆ درکی بەوە کرد، کە ئاڕاستەی گشتی جیهانی دوای شەڕ، بەرەو ئازادیی و دیموکراسی و لەنێوبردنی دیکتاتۆرییەت و سیاسەتی تاکحیزبی دەڕوات، ئینینۆ دودڵ نەبوو لە دەربڕینی ڕەزامەندی بۆ دامەزراندنی پلورالیزمی حیزبی(٤). ڕوونتر بڵێین لە ئاکامی گۆڕانکارییە ئابووریی و کۆمەڵایەتییەکانی تورکیا لە ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی و ئەو پەرەسەندنە گرنگ و گەورەیەی کە لە دوای جەنگ لە پەیوەندییە نیودەوڵەتییەکاندا هاتە ئاراوە، عیسمەت ئینینۆی ناچار بەپێویستی سەلماندنی ژیانی فرەپارتایەتی لە تورکیا کرد(٥). لە ١ی تشرینی دووەمی ١٩٤٥داو لە پەیامی ساڵانەیدا بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی گەورە عیسمەت ئینینۆی سەرۆک کۆماری تورکیا سەرەتای قۆناغێکی نوێی لە مێژووی هاوچەرخی تورکیا ڕاگەیاند و پێشوازی لە سستەمی فرەحیزبی لە وڵاتەکەی کرد. هەندێک لە گرووپەکانی ناو پارتی دەسەڵاتدار لەوانە جەلال بایار و عەدنان موندەریس و فوئاد کۆپرلوو و ڕەفیق ئاڵتان ناکۆکییان لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبەکەیاندا هەبوو، ئەم ناکۆکییە بووبە هۆی کەرتبوونی پارتی گەلی کۆماری بە سەرۆکایەتی هەرچوارکەسی ناوبراو، کە ئەمانەش

١. هـ.س ل١٢٩.

٢. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٤ ؛ مەنال لوتفی: س.پ، ل١٤٣.

٣. سامی شۆرش: س.پ، ل٦١.

٤. د.یاسین سەردەشتی و ئەوانی تر: مێژووی چەپ لە تورکیا، چاپی یەکەم، چاپخانەی تاران، ٢٠١٦، ل٢٢.

٥. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٤.



**سڕینەوەی ئایین کارێکی کرد دەوڵەت و کۆمەڵگە لە تورکیادا پێناسەی خۆیان ونبکەن و دوچاری قەیران و سەرلێشێوانێکی ڕۆشنبیریی و کەلتووریی گەورە ببن.**

لە ٧ی کانوونی دووەمی ١٩٤٦ حیزبێکی نوێیان بەناوی (پارتی دیموکرات) ڕاگەیاند(١).

بەوجۆرە لە ساڵی ١٩٤٦ بەدواوە تورکیا پێی نایە قۆناغی فرەحیزبی(٢). ڕاستییەکەی لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی جەنگی دووەمی جیهانیدا، بیری سیاسیش لە تورکیا پەرەیسەند و شانبەشانی ئەم پەرەسەندنە هەم لەناو پارتی گەلی کۆماری دەسەڵاتدار و هەم لە شەقامدا داوای کرانەوە کرا، ئەوەش وای لە سیاسەتمەدارانی تورکیا کرد وای ببین کە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە گۆڕانکاری لە تورکیا بێتەدی هەتاکو لە پێشکەوتن بەجێنەمێنێ و وەک دەوڵەتێکی دیموکرات جێیەک بۆ خۆی لە جیهانی نوێدا بکاتەوە(٣).

سەبارەت بە بواری ئاینیش، دوای پێشکەشکردنی یاسای فرەپارتی هەردوو پارتەکە کەوتبوونە سەرەتاتکێ بۆ بەدەستهێنانی دەنگی مسوڵمانان(٤). لێرە بەدواوە خەڵکی تورکیا بەئاشکرا داوای گێڕانەوەی ئایینیان دەکرد. تەنانەت لەنێو دەزگای سیاسی تورکیاشدا خەڵکانێک هەبوون بانگەشەی گێڕانەوەی ئاینیان دەکرد. زۆرجاریش هۆی ئەو بانگەشەیە فاکتەری ئایین نەبوو، بەڵکو جیاوازی بوو لە نێوان دوو جۆر لە تێگەیشتن بۆ عەلمانییەت: کەمالیستەکان پێیانوابوو نابێت هیچ دەستکارییەکی کەلتووری کەمال ئەتاتورک بکرێت لە بواری عەلمانیدا. بەڵام خەڵکانێکی دیکە هەبوون پێیانوابوو نابێت ئایین سەرکوت بکرێت،

١. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٨٩؛ د.کريم مطر حمزة الزبيدي: م.س، ص١٥٣؛ سامی شۆرش: س.پ، ل٤٣؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٠.

٢. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٤.

٣. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: پەرەسەندنی دیاردەی ئایینی ـ سیاسی لە تورکیای هاوچەرخ، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(١)، ساڵی هەژدەهەم، شوباتی ٢٠١٠، ل٨٨.

٤. ئێریك جەی زۆچەر: س.پ، ل٣٤٣.

بەڵکو دەبێت وەک ئازادیی تاکەکەس ڕێزی لێ بگیرێت(١).

دەکرێ بڵێین، سەرانی هەردوو حیزب لەوە گەیشتبوون کە ئیسلام هێزێکی کاریگەرە و هەستی ئاینیش لەلای خەڵی خامۆش نەبووە بەتایبەتی لە ناوچە گوندنشینەکاندا کە کەمالیزم نەیتوانی بوو زۆر دەستیان تێوەربدات تەنانەت هەندێک شاریش وەک کوانوی بەها ئاینییەکان مابوونەوە وەک قۆنیە و سێواس ...هتد. لە ساڵی ١٩٤٦وە ئیدی ڕۆژنامەکان پێیان لەسەر گرنگی خوێندنی ئایینی و ڕۆڵی لە گێڕانەوەی بەها ئەخلاقییەکاندا دادەگرت. ژمارەیەک لە پەرلەمانتاران لەوەش زیاتر پێیان لێنا، کاتێک ڕایانگەیاند: گەلی تورک بەرپرس نییە لە کردەوەکانی ئەتاتورک و لێپرسراوێتی پچڕانی پەتی بنچینە ئەخلاقییەکانی کۆمەڵی مسوڵمانانی تورک ناخاتە ئەستۆی خۆیەوە(٢).

بەوشێوەیە ئەو سەرکوتکارییەی کە بۆماوەی زیاتر لە بیست ساڵ خۆی بەسەر گەلانی تورکیادا سەپاندبوو نەما، ئەو خەڵکەی لەو ساڵانەدا لە ئەنجامدانی ڕێ و ڕەسمی ئایینی و مەزهەبی و مومارەسەکردنی دابونەریتیان بێ بەش بوون، خۆیان لەگەڵ پارێزگارانی ئازادیی و ئاینیدا دۆزییەوە، هەر لەبەرئەوەبوو زۆربەی خەڵکی پشتیوانیان لەم بزووتنەوە تازەیە دەکرد، بزووتنەوە نوێیەکە بەڵێنی باشترکردنی ڕەوشی ئابووری پێدان و لەڕووی ئایدۆلۆژیی و گفتی ئازادی ئایینی و مەزهەبییەوە بەڵێنی دڵخۆشکەری پێدان(٣).

ئەگەر بەوردیش لە وردەکارییەکانی هەلومەرجی ناوخۆی کۆمەڵگەی تورکی بکۆڵینەوە دەبینین بزووتنەوەی ئیسلامی سیاسی لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا یەک لە بزووتنەوە بەهێزەکانی ئیسلامی سیاسی بووە لە تەواوی جیهانی ئیسلامیدا. مەیدانە سەرەکییەکەی ئەو بزووتنەوەیەش لەڕابردوودا هەر تەنها بازنەی هەژاران و نەخوێندەواران و خەڵکانی گوندنشین نەبووە، بەڵکو زۆربەی کاکڵە سەرەکییەکەی ئەو بزووتنەوەیە لەناو قوتابیانی زانکۆ و بازنەی خوێندەواران و قوتابخانە ئاینییەکان و بوارە زانستییەکان بووە. بۆ نمونە، بزووتنەوەکە تاڕادەیەکی بەرچاو جێپێیەکی بەهێزی هەبووە لەناو پارێزەران و ئەندازیاران و مامۆستایاندا(٤). لەو ڕووەوە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٤٦-١٩٤٨دا نزیکەی (٢٤) حیزبی نوێ لە تورکیا دامەزران، لەو

١. سامی شۆڕش: س.پ، ل٦١.

٢. بەوەرگرتن لە: فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣١٤ ؛ د.خەلیل عەلی مورد: پاسەوانانی کەمالیزم(هەڵوێستی دامەزراوە سەربازیی بەرامبەر بە ئیسلام و بزاوتی ئیسلامی لە تورکیا ١٩٥٠-١٩٩٧)، و. بەرزانی مەلا تەها و د.سەلام عەبدولکەریم، چاپخانەی پەنجەرە ـ تاران، ٢٠١٥، ل١٢٠.

٣. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٩٣.

٤. سامی شۆڕش: س.پ، ل٦٠-٦١.

ڕێژەیە بەلایەنی کەمەوە هەشتییان مەیلی ئیسلامگەراییان هەبوو، کە گرنگترینیان ئەمانە بوون: پارتی دادی کۆمەڵایەتی، پارتی جوتیاران، پارتی پێشکەوتنی نەتەوەیی، پارتی پاراستنی ئیسلام و پارتی پارێزگاران. جگەلەمانە چەردەیەک ڕێکخراو و کۆمەڵەی ئیسلامگەراش پەیدابوون وەک: کۆمەڵەی ئیسلام و کۆمەڵەی پاکسازی و چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێکی ئاینیش کە کاتی خۆی کەمالییەکان دایانخستبوون، هاتنەوە سەر شانۆ، وەک: سەبیلو ڕەشاد، سەلامەت، حورئادەم.

ئەم گرووپانە داوایان لە پارتی گەلی کۆماری کرد دەستبەرداری سیاسەتە عەلمانییەکەی ببێ و چیتر دەست لە کاروباری ئاینی هاولاتیان وەرنەدات، هەروەها داوایان لێکرد یاسا عەلمانییەکان هەڵبوەشێنێتەوە و نەوەی نوێ بە پەروەردەیەکی نوێ پەروەردە بکرێت(١).

حکومەت بۆی دەرکەوتبوو کە هەژموونی پارتە سیاسییەکانی ئۆپۆزسیۆن لە بەرامبەر پارتی فەرمانڕەوا، پارتی گەلی کۆماری پەرەیسەندووە، بۆیە بڕیاریدا کاتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی کە بڕیار بوو ساڵی ١٩٤٧ ئەنجامبدرێت و تیایدا ماوەی ئەندامانی ئەنجومەن بەسەر دەچوو دەبوو بۆ ٢١ی تەموزی ١٩٤٦ پێش بخات، هەڵمەتی هەڵبژاردن لە ٧ی تەموزی ١٩٤٦ەوە دەستپێیکرد، هەڵمەتەکە ململانێیەکی توندی نێوان پارتی فەرمانڕەوا و هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی بەخۆیەوە بینی، دواتر ئەنجامی هەڵبژاردنەکە لە ئێوارەی ڕۆژی ٢٤ی تەموز ڕاگەینرا، لە هەڵبژاردنەکەدا پارتی گەلی کۆماری فەرمانڕەوا (٣٩٦) کورسی لە کۆی (٤٦٥)کورسی بەدەستهێنا، لە بەرامبەردا پارتی دیموکرات کە گەورەترین پارتی ئۆپۆزسیۆن بوو توانی تەنها (٦٢) کورسی بەدەستبێنێ، هەرچی بێلایەنەکانە (٧) کورسییان مسۆگەر کرد(٢).

ئەو چوار ساڵەی (١٩٤٦–١٩٥٠) کە تێپەڕبوو کێبەرکێیەکی توندی لە نێوان ئەو دوو پارتەدا بەخۆیەوە بینی. لەگەڵ ئەوەی هەردوکیان سیکۆلاریست بوون، بەڵام دریغییان نەکرد لە بەرکارهێنانی ئایین بۆ ئامانج و مەرامە سیاسییەکانیان، واتە بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەران و گەیشتن بەدەسەلات. پارتی گەلی کۆماری بڕێک سازشی لە پرسە ئاینییەکاندا کرد، یەکەم لەژێر فشاری ڕای گشتی، دووەمیش بەخاتری بەرەنگاربوونەوەی تۆمەتەکانی پارتی دیموکرات بەوەی (پارتێکە دژی ئیسلامە)(٣).

---

١. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٨٩.

٢. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: مێژووی ئێران و تورکیا، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١١، ل٣١٥-٣١٦.

٣. د.خەلیل عەلی مورد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١١٨-١١٩.

لێرەوە پارتی گەلی کۆماری سەبارەت بە ئایین نەرمتر خۆی نیشاندا(١) لە گەرمەی کێشمەکێش و ململانێی نێوان پارتی گەلی کۆماریی و هێزە ئۆپۆزسیۆنەکاندا، سەرکردایەتی پارتی گەلی کۆماری لەژێر فشاردا تاوی عەلمانییەتی خۆی خاوکردەوە(٢)، بەشێوەیەک پاش کۆنگرەی حەوتەمی لە ساڵی ١٩٤٧وە حکومەتەکەی پارتی گەلی کۆماری ئەو بەربەستانەی ئاسان کرد کە خرابوونەسەر ئەنجامدانی سەر فەریزەی حەج، کە حکومەتی تورکیا لە سەردەمی ئەتاتورکدا ئەم فەریزەیەی قەدەغەکردبوو، چونکە حکومەت حەزی بە بەشداری هاوڵاتیانی تورک نەدەکرد لەو گردبوونەوە ئیسلامییەدا(٣)، بەڵام لەو ساڵەدا ڕێگەی بەوەدا کە بوجەیەک بۆ ئەو کەسانە تەرخان بکرێت کە خواستی چوونە حەجییان هەیە(٤)، ئیدی یەکەم گرووپی حاجییانی تورک سەردانی حیجازییان کرد(٥).

هەر لە هەمان ساڵدا وەزیری ڕۆشنبیری پلانێکی ڕاگەیاند لەبارەی ڕاهێنانی پێشنوێژان لە پەیمانگا ئاینییە تایبەتەکاندا، لە تەموزی هەمان ساڵدا پارتەکە لە چوارچێوەی ماددەی(٢) کە لە پەیڕەو و پڕۆگرامەکانیدا هاتبوو(پارتەکە ڕەزامەندە بەجیاکردنەوەی کاروبارە ئاینییەکان لە کاروباری دەوڵەت، هەروەها پارتەکە داندەنێت بە ئازادی هەست و سۆز و ئیمان وەک شتێکی پیرۆز بۆ هەمووان، مافی هەمووانە بەو زمان و ڕێگەیە سرووتەکانیان جێبەجێ بکەن کە پێیان باشە، پارتەکە ڕازی دەبێت بەبیرۆکەی دامەزراندنی ئەو ڕێکخراوانەی کە خاوەن ئامانجی ئاینین، هەروەها دارایی ئەو ڕێکخراوانە بخاتە ژێر چاودێری خۆیەوە، پێویستیشە ئەو ڕێکخراوانە توانایان هەبێت بۆ ئاڕاستەکردنی کاروباری ئایینی شوێنکەوتووەکانیان).

لە ساڵی ١٩٤٩ پارتی گەلی کۆماری ڕازی بوو بە ئامادەکردنی فێرکردنی ئایینی ئیختیاری لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا. هەروەها لە ٤ی حوزەیرانی ١٩٤٩ یاسای ژمارە (٥٤٢٤) دەرچوو بۆ دامەزراندنی کۆلێژی زانستە ئاینییەکان(كلية الالهيات) لە زانکۆی ئەنکەرە. کۆلێژەکە لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا کرایەوە(٦) و، مامۆستایان لە

---

١. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٢ ؛ د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٠.

٢. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٠.

٣. د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١١٩ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٣)، ساڵی سیازدەهەم، تشرینی دووەمی ٢٠٠٥، ل١٦٩.

٤. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٠ ؛ محمد نوردين: قبعة وعمامة مدخل الى الحركات الاسلامية في تركيا، دار انهار للنشر، بيروت، ١٩٩٧، ص٢١.

٥. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٩.

٦. لە بەیاننامەی دامەزراندی کۆلێژەکەدا ئاماژە بەوە دەکرا کە دوو مەبەست لە پشت کردنەوەی کۆلێژەکەوەن،

مەغریب و یوگسلافیا و دەوڵەتانی تری ئیسلامی بۆ وانەگوتنەوە بانگهێشتکران.

کۆتا ڕێ و شوێنی پارتی گەلی کۆماری لە پێش دوورکەوتنەوەی لە دەسەڵات خۆی لەو یاسایەدا دەبینێتەوە کە لە ٢٣ی ئازاری ١٩٥٠دا دەرکرا تایبەت بە بەرفراوانکردنی (بەڕێوەبردنی کاروبارە ئاینییەکان)، لە یاساکەدا هاتبوو کە جێگری بەڕێوەبەرێک دیاری بکرێت و، لیژنەیەکی ڕاوێژکاریش دابنرێ بۆ چاپەمەنییەکان و ئیدارەی دەزگا خێرخوازییەکان، لیژنەیەکی سەرپەرشتیاریش دیاری بکرێت بۆ بڵاوکردنەوەی قورئانی پیرۆز، هەروەها دیاریکردنی موفتی لە تەواوی ناوچەکانی وڵاتدا. پارتەکە لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠دا پەیمانیدا بە کردنەوەی مەزارگە و شوێنە پیرۆزەکان، هەروەها پەیمانیدا کە وەفاداربێت بۆ ئایینی ئیسلام(١).

هەرچی سەبارەت بە پارتی دیموکراتە، بەر لە ساڵانی ١٩٥٠، زۆر وریا بوون لە پێداگری سەبارەت بەوەی کە ئەوان ڕێگەنادەن هیچ گۆڕانێکی بنەڕەتی لە بنەما سیکۆلارەکانی دەوڵەتدا بکرێت. ئەوەش بووە هۆی ئەوەی لەلایەن ڕەوتە ئیسلامییەکانەوە ڕیسوا بێنە پێش چاو. وەک ئەو ڕەوتەی کە گۆڤاری (سبیل الروشد) نوێنەرایەتی دەکرد، ئەوەی کە دەستیکردبوو بە هێرشکردن بۆ سەر پارتی دیموکرات بوەهۆی ئەوەی کە ژمارەیەک پارتی بەرهەڵستکاری ڕادیکاڵتر دابمەزرێت کە لە هەموویان گرنگتر (پارتی نەتەوەیی) بوو(٢). بەڵام مەندەریس، لە ساڵی ١٩٥٠وە بەرنامەیەکی وای دانا کە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی و لیبراڵی لەناو دەوڵەتی تورکیادا ئەنجامبدات. ناوەڕۆکی گۆڕانکارییەکەش کە ڕێگەی پێ نەدراو سەری نەگرت، سەرچاوەی لەوەوە وەرگرتبوو کە شێوازێکی یاسایی لە ڕێگەی پەرلەمانەوە بدۆزێتەوە بۆ خاوکردنەوەی هەڵوێستی دەوڵەت لە بەرامبەر کەمینە ئایینی و نەتەوەییەکان(٣).

---

یەکەمیان پەوەردەکردنی پیاوانی ئاین کە گەلی تورك وەك گەلێکی بەزۆرینە مسوڵمان پێویستی پێیانە، دووەمیان بەشداریکردنە لە پەرەپێدانی بیری ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی زانستی مۆدێرندا.(د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٩-١٧٠)

١. د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١١٩-١٢٠ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٠ ؛ د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٠ ؛ محمد نوردین: م.س، ص٢١.

٢. ئێریك جەی زۆچەر: س.پ، ٢٠١١، ل٣٤٢-٣٤٣ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣١٦ ؛ د.خەلیل عەلی مورد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١١٩-١٢٠ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٦٩ ؛ د.کریم مطر حمزة الزبیدی: م.س، ص١٥٣.

٣. سامی شۆڕش: س.پ، ل٤٤-٤٥.

**بەشی دووەم/ هەڵویستی پارتی دیموکرات بەرامبەر بە ئایین**

**باسی یەکەم/ چونێتی مامەڵەی پارتی دیموکرات لەگەڵ ئایین**

هەروەک پێشتر باسکرا، پاش دامەزراندنی بەماوەیەکی کەم، پارتی دیموکرات ژمارەیەکی زۆر لەو خەڵکانەی بەلای خۆیدا ڕاکێشا کە نارازی بوون لە سیاسەتەکانی پارتی گەلی کۆماریی و پاوانکردنی دەسەڵات، لەوانە ئەو کەسانەش کە دید و تێڕوانینی ئیسلامگەرایان هەبوو، بەڵام ئەمانەی دوایی هەستیان بە نائومێدی کرد کاتێک پارتەکەیان بە ئاشکرا بەگژ بناغەی کەمالیزمدا نەچوویەوە بەتایبەتی عەلمانییەت. هەر ئەمانەش بوون کە لە پشت ئەو لەتبوونەوە بوون کە ساڵی ١٩٤٨ بەرۆکی حیزبەکەی گرت و بوو بەمایەی پێکهێنانی پارتی میللەت. وادیارە ئەم کەرتبوونە بووە بە هاندەرێک بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری لە سیاسەتی پارتی دیموکراتدا، چونکە ئەم پارتە هەوڵیدا خاوەن دیدە ئیسلامییەکانی ناو ڕیزەکانی خۆی بپارێزێت و بوار نەدات پەیوەندی بە پارتی میللەتەوە بکەن. فاکتەرەکانی تر هەوڵدان بوو بۆ بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەران لە گوند و لادێکاندا لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٠دا(١).

جیا لەوانە چاودێران ئاماژە بەوە دەکەن کە مەندەریس خۆی لە ئەوروپا و ئەمریکا خوێندنی تەواو کردووە، بۆیە باوەڕی بە لیبرالیزم و ڕۆژئاوایی زۆر زیاتر بوو لەوەی باوەڕی بە عەلمانییە توندوتیژەکەی ئەتاتورک هەبێت. بۆیە دەیویست کۆمەڵێک یاسا لە ڕێگەی پەرلەمانەوە دەربکات کە تاڕادەیەکی بەرچاو ئازادی بیروڕا دەربڕین و نووسین و بڵاوکردنەوە و ئازادی ئایینی لە بەردەم مسوڵمانان و بیروباوەڕە غەیرە کەمالییەکاندا دابین بکات(٢). مەندەریس جگەلەوەی کە پارتی گەلی کۆماری  بە فاشیەت چواندبوو، ئەوەشی گووتبوو کە جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوان ڕژێمەکانی ستالین و پارتی گەلی کۆماریدا نییە(٣).

دیاربوو ڕێ و شوێنەکانی پارتی گەلی کۆماری نەیانتوانی بوو وێنەی ئەو پارتە لە چاوی  ئەو زۆرینەیەی کە بەدرێژایی دەسەڵاتی ئەو پارتە پەراوێز خرابوو جوان بکەن(٤)، دواجار حیزبی دیموکرات یەکەم سەرکەوتنی گەورەی بەدەستهێنا، کاتێک لە هەڵبژاردنی ١٤ی ئایاری١٩٥٠ زۆرینەی (٥٣,٦٪)ی کورسییەکانی ئەنجومەنی نیشتمانی بردەوە کە لە (٤٢٠) کورسی پێکدەهات، لە بەرامبەردا پارتی گەلی کۆماری ٤٠٪ی کورسییەکانی

---

١. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١.

٢. سامی شۆڕش: س.پ، ل٤٥.

٣. رضا هلال: السيف الهلال تركيا من أتاتورك الى أربكان(الصراع بين المؤسسة العسكرية والاسلام السياسى)، ط١، دارالشروق، القاهرة، ١٩٩٩، ص٩٨.

٤.  د.خەلیل عەلی مورد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١٢٠.



**مەندەریس جگەلەوەی کە پارتی گەلی کۆماری بە فاشیەت چواندبوو، ئەوەشی گووتبوو کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ڕژێمەکانی ستالین و پارتی گەلی کۆماریدا نییە.**

بەدەستهێنا کە ٦٨کورسی بوو(١)، سێیەمین پارت کە (پارتی نەتەوەیی) کۆنەپەرست بوو، تەنها یەک کورسی بەدەستهێنا، پارتی ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٣دا قەدەغەکرا بەبیانووی ئەوەی کە ئایینی بۆ سیاسەت بەکارهێناوە. بەڵام هەرزوو بەناوی (پارتی کۆماری نەتەوەیی) خۆیان ڕێکخستەوە(٢). هەرچی بێلایەنەکانیشە سێ کورسییان بەدەستهێنا(٣).

دوای ئەم سەرکەوتنە، جەلال بایار بە سەرۆک کۆمار و عەدنان مەندەریس سەرۆک وەزیر و ڕەفیق کورئالتان بە سەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی دیاریکران، لێرەوە حکومەت بڕیاریدا بەرنامەیەکی سیاسیی و ئابووری لیبڕالتر بگرێتەبەر(٤). لە یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانیدا، عەدنان مەندەریس ڕۆژی ١٤ی ئایاری وەک ڕۆژێکی مێژوویی کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە تورکیا ناوبرد، بەوپێیەی کە کۆتایی قۆناغێک و چوونە ناو قۆناغێکی بوو لەو وڵاتەدا(٥).

هۆکاری سەرکەوتنی پارتی دیموکراتیش لە هەڵبژاردنەکاندا دەکرێت لە چەند خاڵێکدا بخرێتە ڕوو:

١. ئارەزووی گەلی تورکیا بوو بۆ گۆڕینی سستمی حکومڕانی دوای نزیکەی (٢٧) ساڵ لە حوکمی پارتی گەلی کۆماری.

٢. سەرنەکەوتنی پارتی گەلی کۆماری لە دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەکی گونجاو بۆ گیروگرفتەکانی ئابووری تورکیا، بەتایبەتی بەرزبوونەوەی ڕێژەی هەڵاوسان و لاوازی توانای ئابووری لەو پرۆژانەی کە دەوڵەت خاوەنی بوون.

---

١. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣١٩ ؛ رضا هلال: م.س، ص٩٧-٩٨.

٢. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٣٠ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣١٣.

٣. د. ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣١٩.

٤. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣١٩.

٥. رضا هلال: م.س، ص٩٩.

٣. حیزبی دیموکرات لە هەڵبژاردنەکاندا پشتی بە بۆرژوای نیشتمانی و موڵکدارانی زەوی بەست، ئەوانەی کە لە چەمکی سۆسیالیزم دەترسان کە دوای شەڕی دووەمی جیهانی دزەی کردبوویە ناو پارتی گەلی کۆمارییەوە.

٤. هۆکاری ئایینیش ڕۆڵێکی گرنگ و گەورەی بینی لە سەرکەوتنی حیزبی دیموکرات، ئەویش دوای ئەوەی لە بەرنامەی سیاسی خۆیدا جەختیکردەوە لەسەر دووبارە خوێندنی ئایین و بڵاوکردنەوەی بەرنامەی ئایینی لە ڕادیۆ و ڕێگەدان بەکارکردنی ڕێکخراوە ئاینییەکان لە تەواوی وڵاتدا(١).

٥. هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتنی ئەم پارتە لەو هەڵبژاردنەدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە جوتیارەکان دەنگیان بەو پارتەدا(٢).

عەدنان مەندەریس، لە زۆر بۆنەدا ئەوەی دوپات دەکردەوە، کە پارتی دیموکرات لە بڕیاری جیاکردنەوەی ئایین لە دەوڵەت پاشگەزنابیتەوە، بەڵام تورکیا دەوڵەتێکی ئیسلامییە و هەروا دەمێنێتەوە(٣). ئەم هەڵویستانەش وای لە پارتی گەلی کۆماری کرد، کە پارتی دیموکرات بەوە تۆمەتبار بکات کە هەستی ئایینی بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسییەکانی دەقۆزێتەوە، ئەوەش پێچەوانەی پرەنسیپەکانی عەلمانی ئەتاتورکە(٤). بۆیە وەک خیانەت لە بەرامبەر شۆڕش تەماشا دەکرا(٥).

هەرچی چاودێرە ڕۆژئاواییەکانیشە، گۆڕانکارییەکانی پاش سەرکەوتنی پارتی دیموکراتیان بە (ڕابوونێکی ئیسلامی) لەقەڵەم دەدا. لەکاتێکدا ڕاستییەکە ئەوە بوو کە ئەم مەسەلەیە گۆڕانیکی زۆر گرنگ بوو بەتایبەتی کە لە دەوڵەتێکدا بزووتنەوەیەکی کلتووری ڕادیکاڵی بەخۆیەوە دەبینی و بۆماوەیەک ئایین سستی تیایدا بەخۆیەوە بینی بوو(٦).

ئەم سەرکەوتنەی پارتی دیموکرات کە بەسەر پارتی گەلی کۆماریدا بەدەستیهێنا، یەکەم سەرکەوتن و دواسەرکەوتن نەبوو لە مێژووی پارتەکەدا، بەڵکو ئەم پارتە توانی لە دوو گەڕی دیکەی هەڵبژاردن کە ئەوانیش بریتی بوون لە هەڵبژاردنەکانی ساڵانی ١٩٥٤ و ١٩٥٧ بەسەر پارتی گەلی کۆماریدا سەربکەوێت، بەوەش دەرفەتی بۆ ڕەخسا

---

١. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣١٩-٣٢٠ ؛ محەمەد فاتح: پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان لە تورکیا(١٩٢٣-٢٠٠٣)، چاپخانەی حەمدی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئایدیا، سلێمانی، ٢٠١٦، ل٣٩.

٢. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١.

٣. محەمەد فاتیح: س.پ، ل٣٩.

٤. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٢.

٥. حميد بوزرسلان: تاريخ تركيا المعاصر، ترجمة: حسين عمر، الطبعة الاولى، المركز الثقافي العربي، ٢٠٠٩، ص٨٠.

٦. د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: ئایندەی ڕووبەڕووبونەوەی عەلمانیەت و ئیسلام لە تورکیا، گۆڤاری سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، ژمارە(٢)، ساڵی پانزەهەم، ئابی ٢٠٠٧، ل٩٠.

کە بۆماوەی (١٠) ساڵی تەواو (١٩٥٠–١٩٦٠) حوکمڕانی تورکیا بکات(١).

دیموکراتەکان کاتێک دەسەڵاتیان گرتەدەست لە سەر هەمان سیاسەتی پارتی گەلی کۆماری بەردەوامبوون لە گرتنەبەری سیاسەتیکی نەرمی سنووردارکردنی بەرجەستەکردنی هەست ئایینی و چاوپۆشی لە هەست و سۆزی دانیشتوانی مسوڵمان، کەچی لەهەمانکاتدا دژایەتی خواستە دژەسیکۆلاریزمییەکانیان دەکرد(٢). بۆیە دەڵێین، سەرکەوتنی پارتی دیموکرات لە هەڵبژاردنەکاندا، وەرچەرخانێکی سیاسی پێشکەوتوو نەبوو لە مێژووی هاوچەرخی تورکیادا، بەڵکو دیمەنێک بوو لە ئارەزووکردنی تازەگەری دوای دیکتاتۆریەتی تاکە حیزب کە زیاتر لە چارەکە سەدەیەک بەردەوام بوو. لەڕاستیدا سەرکەوتنی پارتی دیموکرات ئاستەنگێک نەبوو بۆ پارتی گەلی کۆماری بە ئەندازەی ئەوەی کە ئەنجامێک بوو بۆ گواستنەوەی ئاشتییانە لە سیستەمی تاک پارتی بۆ سیستەمی فرەپارتایەتی. لەبەرئەوەی پارتی دیموکرات لەڕووی تیۆری گشتییەوە، جیاوازییەکی زۆری نەبوو لەگەڵ فەلسەفەی پارتی گەلی کۆماری، چونکە پارتی دیموکراتیش بەهەمان شێوەی پارتی گەلی کۆماری جەختی لەسەر شەش پرەنسیپە ناسراوەکەی پارتی گەلی کۆماری دەکردەوە. بۆیە مێژوونووسان ماوەی حوکمڕانی پارتی دیموکرات بە (کۆماری سێیەم) ناودەبەن، دوای کۆماری یەکەم بە سەرۆکایەتی کەمال ئەتاتورک(١٩٢٣–١٩٣٨) و کۆماری دووەم بە سەرۆکایەتی عیسمەت ئینینۆ(١٩٣٨–١٩٥٠)، کە هەردووکیان بیر و هزری عەلمانییەتیان زۆر بەتوندی پەیڕەو دەکرد، لەکاتێکدا کە کۆماری سێیەم لەو ڕووەوە کەمێک سوکتر بوو(٣).

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە، ئەم پارتە لە بەرنامەی کاری خۆیدا (١٩٤٦)، جەختی لە سستەمی عەلمانییەت کردەوە، هەروەک لە مادەی(١٤)ی یاسای ناوخۆی پارتەکەدا هاتووە:" تێگەیشتنی پارتی دیموکرات بۆ عەلمانییەت، بریتییە لەوەی، کە نابێت دەوڵەت دەستوەربداتە ناو کاروباری ئایینییەوە. پارتی دیموکرات ئەو بۆچوونە بەڕاست نازانێت، کە پێی وایە عەلمانییەت دژی ئایینە. بەپێی ئەم بنەمایە پارتی دیموکرات دانی بە ئازادی ئایینیدا دەنێت، وەک یەکێک لە مافەکانی تاک، هەروەها لایەنگری دامەزراندنی ڕێکخراوە ئاینییەکان دەکات، بۆ فێربوون لەسەر دەستی مامۆستایانی ئایینی. ئەو ڕێکخراوانە شتێکی پێویستن، بەڵام لەلایەکی دیکەوە پارتی دیموکرات باوەڕی بە بەکارهێنانی ئایین

---

١. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٣ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١-١٧٢ ؛ د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: س.پ، ل٨٩.

٢. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٤.

٣. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٠ ؛ محەمەد فاتیح: س.پ، ل٣٩.

نییە بۆ مەبەستی سیاسی...هتد"(١).

لە سەرەتادا بۆئەوەی گۆمان لەسەر پارتەکەی دروست نەبێت، پارتی دیموکرات بە بەردەوامی ئەوەی دوپات دەکردەوە کە بە هیچ شێوەیەک دەستبەرداری بیروباوەڕی کەمالیزم نابێت، کەچی ئەمە ڕێگەی لەوە نەگرت کە هەوڵبدا سود لە هەستی ئایینی هاوڵاتیان وەربگرێت، بەتایبەتی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠دا کە ئەم پارتە سەرکەوتنی تیادا بەدەستهێنا و یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی بردنەوەی لە هەڵبژاردنەکەدا ئەو هەڵوێستە بوو کە سەبارەت بە مەسەلە ئاینییەکان نواندبووی.

دوای ئەوەی پارتەکە هەڵبژاردنەکانی بردەوە و حکومەتی پێکهێنا، بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام سیاسەتێکی تاڕادەیەک نەرمونیانی گرتەبەر، لەم ڕووەوە یەکەم هەنگاوی کەمکردنەوەی کەفوکوڵی ڕەوتە عەلمانییە توندڕەوەکانی حکومەتی پێشوو بوو. هەروەها ڕێگەیدا هاوسەنگییەکی نوێ بێتە ئاراوە، لەم بوارەدا:

- قەدەغەکردنی بانگدانی بە زمانی عەرەبی هەڵگرت.

- قەدەغەی سەر بەرنامە ئاینییەکانی ڕادیۆی نەهێشت، لێرەوە قورئانخوێندن لە ڕادیۆکان بە ئازادی پەخش دەکرا.

- لە تشرینی یەکەمی ١٩٥٠شدا خوێندنی ئایینی لە قوتابخانەکاندا دەستپێکردەوە.

- بواریش درا بە مسوڵمانان مزگەوتە کۆنەکان نۆژەنبکەنەوە و مزگەوتی نوێش دروستبکەن، تەنانەت ئەو مافەشیان پێدرا کە پارەی بۆ کۆ بکەنەوە(٢). بەگوێرەی ئامارێک ژمارەی ئەو مزگەوتە نوێیانەی کە لە ماوەی فەرمانڕەوایی پارتی دیموکرات(١٩٥٠-١٩٦٠) لە تورکیا دروستکراون بە (٥) هەزار مزگەوت مەزەندە کراوە، لەو ڕێژەیە (٥٠)یان لە شاری ئەنقەرەی پایتەختدا بووە(٣). ژمارەی ئەوانەشی کە نۆژەنکرانەوە گەیشتە نزیکەی (١٥) هەزار مزگەوت.

- بوار درا بە کردنەوەی نزرگە پیرۆزەکان.

- ژمارەی کۆمەڵە و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لە (٩٥) کۆمەڵەوە زیادی کرد بۆ نزیکەی (٥٠٠٠) کۆمەڵە(٤).

---

١. محەمەد فاتح: س.پ، ل٣٩-٤٠.

٢. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر:: س.پ، ل٩٠-٩١ ؛ حمید بوزرسلان: م.س، ص٨٠ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣١٧ ؛ د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٢ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١، ل١٧٣ ؛ ئێریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٥ ؛ محمد نوردین: م.س، ص٢١-٢٢.

٣. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٢ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١.

٤. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩١ ؛ ئێریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٥.

ـ ژمارەی پەیمانگاکانی پێگەیاندنی پێشنوێژ و وتارخوێنەکانیش لە (٧)وە بوو بە (١٩) پەیمانگا(١).

ـ بواردرا بە حەج کردن، کە لە سەردەمی ئەتاتورکەوە قەدەغەکرابوون(٢).

ـ حکومەت ڕێگەیدا مەولودنامە لە یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر(د.خ) لە مزگەوتەکاندا ساز بکرێ(٣).

ـ هەڵوەشاندنەوەی دەستێوەردانی حکومەت لە جلوبەرگی ژناندا(٤).

ـ فرۆشتنی ئەدەبیات و نوسراوە ئاینییەکان ڕێگەی پێدرا(٥).

ـ یەکێکی دیکە لە دیاردە گرنگەکانی سەردەمی پارتی دیموکرات ڕێگەدان بوو بەجۆرەها شێوەی گوزارشت کردن لە ئیسلام بەتایبەتی بەهۆی ڕۆژنامەگەرییەوە.

ئاشکرایە کە ئەم جۆرە هۆیانە لە سەردەمی پارتی گەلی کۆمارییەوە سەرکوت کرابوون و ڕێگەیان پێ نەدرابوو. بەڵام لە سەردەمی دیموکراتدا ڕەشەکە گۆڕا و چەندەها ڕۆژنامە بەپیر ئارەزووی خوێنەرەکانیانەوە چوون و کەوتنە بڵاوکردنەوەی وتار دەربارەی ئایین و تەرخانکردنی ستوونێکی ئایینی لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ باسکردنی مەسەلەکانی پەوەندیدار بەو مانگە و بابەتە ئاینییەکان. هەروەها درێژە درا بە بڵاوکردنەوەی ئینسکلۆپیدیای ئیسلامی و چەندەها وتاری لێکۆڵیارە تورکەکان بە تێروتەسەلی بۆ باسکردنی بابەتی ئادگارە تورکییەکانی مێژوو و پەرەسەندنی ئیسلام تەرخان کرابوون. هەروەها بەرهەمی نوسەر و کەسایەتییە دیارەکانی وەک ئیبن خەلدون، غەزالی، سوهرەوەردی، حەریری، ئیبن عەرەبی، جەلالەدینی ڕۆمی...هتد وەرگێڕدرانە سەر زمانی تورکی. ئەوە جیا لە دەرچوونی ژمارەیەکی زۆر لەو گۆڤارانەی کە گرنگییان بە ئیسلام و بابەتە ئاینییەکان دەدا(٦).

هەر لەم ماوەیەدا بزووتنەوە ئاینی ـ سیاسییەکانی تورکیا جارێکی تر کەوتنەوە چالاکی و جموجوڵێکی فراوانیان دەستپێکرد بەتایبەتی تەریقەتەکانی: بەکتاشی، نەقشبەندی، مەولەوی، سلێمانی، تیجانی و نورچی(نورسی). ئەم بزووتنەوە و تەریقەتە سۆفیگەرییانە لە شار و دێهاتەکانی تورکیا لقیان کردەوە، ئەوەش بوو بەهۆی بەهێزبوونی ڕۆڵی زانایان

---

١٠ د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٢ ؛ د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩١.

٢. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٢ ؛ لوتفی مەنال: س.پ، ل١٣٢ ؛ محەمەد فاتح: ل٣٩.

٣. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٣.

٤. محەمەد فاتح: س.پ، ل٣٩ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١.

٥. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٥.

٦. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٤-١٧٥.

و مەلاکان و لایەنگرانی ڕەوتی ئیسلامی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا. لەنێو ئەو تەریقەتانەدا هەریەکە لە تیجانی و نورچی و سلێمانی هەڵسوڕانێکی سیاسی فراوانیان دەستپێکرد بوو.

لە ساڵانی ١٩٥٠–١٩٥١دا بزووتنەوی تیجانی لە بڵاوکراوە و وتارە ئایینی و سیاسییەکانی لە مزگەوت و بۆنە و ئاهەنگە ئایینییەکانیدا بانگەشەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی کەمالیزم دەکرد و داوای دەستوورێکی نوێی لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلامی دەکرد، جگەلەمە، بزووتنەوەکە پەنای بۆ زەبروزەنگیش برد و لەم ڕووەوە هێرشکردنە سەر پەیکەرەکانی کەمال ئەتاتورک و شکاندنیان لە ئەستۆی ئەم بزووتنەوەیەدایە. پارتی دیموکرات بۆ ڕێگری لەم جۆرە کارانە بەدەرکردنی یاسایەک بۆ پاراستنی کەسایەتی و ڕێز و حورمەت و پەیکەرەکانی ئەتاتورک وەڵامی دایەوە، دواتریش شاڵاوێکی ڕەشبگیری دەستپێکرد، لەو شاڵاوەدا ڕابەری بزووتنەوەکە(کەمال پیلەڤئۆگلو) و نزیکەی (٣)هەزار کەس لە لایەنگرەکانی دەستگیرکران. لەوەش زیاتر حکومەت تۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لە نێوان  ئەم بزووتنەوەیە و ئیخوانولموسلیمینی میسر و فیدائییانی ئیسلامی ئێران دایە پاڵ بزووتنەوەکە.

بەپێی هەندێک لە سەرچاوەکان ژمارەی لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیە لە تورکیا هەتا ناوەڕاستی ساڵی ١٩٥١ گەیشتە نزیکەی (٣٠٠)هەزار کەس(١). بۆ ڕێگری لەم جۆرە کارانە یاسایەک لە هەمان ساڵ (١٩٥١) دژی شێواندنی بیرەوەری سەردەمی ئەتاتورک پەسەندکرا(٢). پارتی گەلی کۆماریش هەنگاوە یاسایی و سیاسی و دادوەرییەکانی پارتی دیموکراتیان لەم ڕووەوە پەسەند کرد(٣). هەربۆیە لە دوای ئەم ڕووداوەوە ڕۆڵی ئەم ڕێبازە بەشێوەیەکی بەرچاو ڕووی لە پاشەکرد(٤).

هەرچی سەبارەت بە بزووتنەوەی نورچی یە، لەلایەن پارتی دیموکرات خۆیەوە پشتگیری لێ دەکرا، لەوچوارچێوەیەدا دامەزرێنەر و ڕابەرەکەی، سەعیدی نورسی(١٨٧٣–١٩٦٠) ئازادکراو ڕێگە بە بزووتنەوەکەشی درا بە ئاشکرا دەست بە کاروچالاکی بکاتەوە، ئیدی بزووتنەوەکەش ڕۆژنامەی (اتحاد)ی لە ساڵی ١٩٥٠دا دەرکرد. بیر و پرۆگرامی ئەم بزووتنەوەیە لەو نامانەدا دەردەکەوێت کە نورسی بەناوی (پەیامەکانی نوور) نووسیویەتی و ژمارەیان زیاتر لە (١٣٠) نامەیە. کە تیایدا هەموو ڕواڵەتەکانی ئەتاتورکی

١. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩١ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١٢٦-١٢٨ ؛ ئێریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٤-٣٤٥ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢٠-٣٢١ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٣.

٢. ئێریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٤-٣٤٥ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢٠-٣٢١.

٣. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢١.

٤. د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١٢٨.

بەلاوە دەنا و داوای پیادەکردنی شەریعەتی ئیسلامی لەگەڵ گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و دابونەریتی عوسمانی دەکرد(١).

هەروەها تەریقەتی سلێمانچیش چالاکی نواند، ئەم تەریقەتە ئاینییە سۆفییە لەسەر دەستی سلێمان(١٩٤٦-١٩٦٣) کە موریدێکی نەقشبەندی بوو دامەزرا، ئەرکەکەی دامەزراندنی خوێندنگەی ئایینی بوو بەنهێنی. ئەمانیش وەک نورچییەکان ژێرخانیکی گرنگیان هەبوو کە پێکهاتبوو لە گرووپی بچووک بچووک، بەڵام بەربڵاو و پەڕاگەندە. ئەم بزووتنەوەیە زیاتر لەناو کرێکارە تورکە ئاوارەکانی ئەوروپا لایەنگری هەبوو. بزووتنەوەکە بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە سوپای سلێمانچی کە ژمارەی دەگاتە ٣٠٠ هەزار مورید دەتوانێ تورکیا لە سیکۆلاریزم و بێ ئایینی ڕزگار بکات.

سەرباری تەریقەتە ئاینییەکان، چەندین ڕێکخراو و حیزب پەیدابوون کە مەیلیان بەلای ئیسلامدا هەبوو، وەک پارتی دیموکراتی ئیسلامی، پارتی ڕابوونی نیشتمانی، پارتی پارێزگاری لە ئیسلام، پارتی نەتەوە و کۆمەڵەی سوپایی بیوک توگو. هەندێک لەوانە ڕێیان پێدرا ڕۆژنامەیان هەبێ. هەندێکیشیان دایانشکاند بەلای زەبروزەنگ و تیرۆرکردنی کەسایەتییە ناسراوەکانی جولەکەی دۆنمە(٢). بەڵام پارتی دیموکرات لە گرتنەبەری ڕێ و شوێنی توندوتۆڵدا دژی هەر جموجوڵێکی ئایینی کە لێی ڕادەبینرا هەڕەشە لە ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی تورکیا بکات، هیچ دودڵییەکی نەدەنواند(٣).

هەربۆیە پارتی دیموکرات لە ٢٣ی تەموزی ١٩٥٣دا پڕۆژە یاسایەکی خستەڕوو کەبەوپێیە ڕێگە لە ئایین دەگرێت بۆ مەبەستی سیاسی بەکاربهێنرێت(٤)، چونکە ئیسلام فاکتەرێکی یەکلاکەرەوە بوو لە هەڵبژاردندا و دەتوانرا بەهۆیەوە سود لە پێشینە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکانی جوتیاران وەربگیرێ(٥). ئەوەی جێگەی سەرنج بوو نوێنەرانی پارتی گەلی کۆماری لە ئەنجومەنی نیشتمانی تورکیادا دژ بەم یاسایە دەنگیاندا، هەرچەندە پێشتر لایەنگری سیاسەتی عەلمانی دیموکراتییەکان بوو، ئەم پڕۆژە یاسایە و پڕۆژەی قەدەغەکردنی مامۆستایان لە سیاسەت کردن، پارتی دیموکرات بەناوی (یاساکانی

---

١. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٢ ؛ د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ ، ل٣٢٢ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١٢٩-١٣٠ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٤.

٢. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ ، ل٩٢ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم، ل١٢٨-١٢٩.

٣. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢٠.

٤. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٣.

٥. د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: س.پ، ل٩٠.

سەلامەتی نیشتمانی) خستبوویانە بەردەم ئەنجومەن بەمەبەستی پەسەندکردنی(١) بۆ چارەسەرکردنی ئاڕاستە مەترسیدارە هەڵچووەکانی ناو کۆمەڵە و پارتە ئیسلامییەکان، پارتی دیموکرات هەمان ئەو ڕێوشوێنانەی بەکارهێنا کە لەگەڵ تەریقەتە سۆفییەکاندا بەکاریان هێنابوو، واتە لەلایەک دەرکردنی یاسا و لەلایەکی ترەوە بەکارهێنانی هێز و ڕێوشوینی دادوەری لەچوارچێوەی یاسا پەیڕەوکراوەکاندا، بەم پێودانگە هەندێ لەو گرووپانەیان هەڵوەشاندەوە کە دژی دەستوور بوون و هەندێک لە سەرانی حیزبەکانیشیان دادگایی کرد وەک جەواد ڕەفعەت ئاتلخان سەرۆکی پارتی دیموکراتی ئیسلامی، هەروەها بارەگای گشتی پارتی نەتەوەییان ڕۆژنامەی(میللەت)یان داخست، بەبیانووی ئەوەی پڕوپاگەندەیان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینی کردووە.

تەکبیرەکانی پارتی دیموکرات لە دژی تەریقەت و ڕێکخراو و حیزبە ئاینییەکان تەنها بۆ ئەوە کران کە پارتی دیموکرات ئەو گرووپانە نەهێڵێت کە لە تواناناندا هەبوو دەنگی ئایندارەکان بەدەستبهێنن و پارتی دیموکرات لەو دەنگانە بێبەش بکەن، لەبەرئەوە هێندەی نەخایاند پارتی دیموکرات لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٤دا کەوتە مەرایی کردن بۆ ئیسلامییەکان بەمەبەستی بەدەستهێنانی دەنگییان لە دژی ڕکابەرەکەی خۆی کە پارتی گەلی کۆمارییە. سەرباری بەکارهێنانی ئاین وەک چەکێک لە دژی تەوژمی ڕووە گەشەی کۆمۆنیست لە تورکیادا(٢).

وەک چۆن پارتی گەلی کۆماری پاساو و پاکانەی خۆی هەبوو سەبارەت بە گۆڕینی هەڵویستی لە بەرامبەر بە ئایین، پارتی دیموکراتیش پاساوی خۆی هەبوو کەوایان لێکرد بایەخێکی زیاتر بە ئایین بدات، لەوانە:

١ـ تەماشاکردنی ئیسلام وەک ڕێ و شوێنێک بۆ سەقامگیرکردنی ئاکار.

٢ـ تورکیا هێشتا لەو ئاستەدا نییە کە هەموو ڕێ و شوێنە مۆدێرنەکان بۆ وروژاندن و یەکخستنی ڕای گشتی پەرەپێبدات. ئەمەش دەرفەت بۆ بزووتنەوە ئایینییەکان دەڕەخسێنێ خۆیان تاقیبکەنەوە و بەشداری لە یەکخستنی جەماوەردا بکەن.

٣ـ هەوڵ دەدرا ئایینی ئیسلام وەک بەربەستێک لە بەرامبەر بڵاوبوونەوە و گەشەکردنی ڕەوتی کۆمۆنیستیدا سودی لێوەربگیرێت. بەو پێودانگە مەندەریس ئیسلامی وەک ئایدۆلۆژیایەک دژی کۆمۆنیزم بەردەهێنا و تۆمەتی کوفر و ئیلحادی خستە پاڵ چەپەکانەوە.

٤ـ هەروەها مەندەریس دەیویست سود لە ئایینی ئیسلام وەربگرێت بۆ پەردەپۆشکردنی

---

١. د.ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد و د.خەلیل عەلی موراد: س.پ، ل٣٢٣.

٢. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٣.

ئەو قەیرانە ئابوورییەی کە وڵاتەکەی گرتبوویەوە بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٥٨دا کە خراپی ڕەوشی ئابووریی و هەڵاوسان و بێ بازاڕی بەتەواوی تەنگی بە تورکیا هەڵچنی بوو. ئەوە لەکاتێکدا لە قۆناغی ڕزگاری سەربەخۆیی تورکیاوە ئایین بۆ وروژاندنی جەماوەر بەکارنەهاتبوو، بەڵام جارێکی تر مەندەریس لە ناوەڕاستی پەنجاکانەوە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو قەیرانە ئابوورییەی کە بەرۆکی حکومەتەکەی گرتبوو پەنای بۆ بردەوە.

٥. لەناوەڕاستی پەنجاکاندا کاتێک تورکیا لە ئێران و پاکستان و عێراق نزیکبوویەوە و دواجار پەیمانی بەغدای ساڵی ١٩٥٥ی لێ شین بوو، پێویستی بە زەقکردنەوەی سیمای ئیسلامییانەی تورکیا هەبوو، بەتایبەتی لەوکاتەی کە سوریا و میسر ڕەخنەی توندیان لە پەیمانەکە گرت و بەچاوی گومانەوە دەیانڕوانییە ئیسلامبوونی تورکیا. تورکیاش بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانانە، لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە باسی لە ڕۆڵی مێژوویی تورکی لە ئایینی ئیسلام و بەشداری تورک لە شارستانییەتی ئیسلامیدا دەکرد(١).

لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٥٧دا پارتی دیموکرات ڕووبەڕووی بەرهەڵستییەکی توند و بەهێزبوویەوە، قەیرانی ئابووریی و کەمبوونەوەی پشتگیری دانیشتوانی شار و زیدەخوێندەوارەکان، هەندێک جار زیاد لە پێویست خۆهەڵواسین بە ئایین و نیشاندانی کۆمارییەکان وەک کۆمۆنیست و بێباوەڕ، هەروەها شانازیکردن بە ژمارەی مزگەوتە نوێیەکان و ئەو قوتابخانە ئایینییانەی کە کرابوونەوە لە سایەی فەرمانڕەوایی دیموکراتەکاندا(٢). بۆیە لەم هەڵبژاردنە نوێیەشدا جارێکی تر بەناچاری پەنای بردەوەبەر بەکارهێنانی ئایین بۆ نزمی ئاستی جەماوەری خۆی و لەم بوارەدا داوای پێکهێنانی (بەرەی نیشتمانی)یان کرد بەمەبەستی پارێزگاریکردن لە ئیسلام دژی بیروباوەڕە دژە ئایینییەکان. هەردوو جارەکە ئەم پارتە سەرکەوتووبوو لە بەدەستهێنانی دەنگی دەنگدەران و ژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان بەتایبەتی توانی زۆربەی دەنگی گوندنشینانی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت(٣).

ئەوەش وایکرد پارتی دیموکرات بە بەکارهێنانی ئایین بۆ بانگەشەی سیاسی تۆمەتبار بکرێت، چونکە ئەوە مانای پاشگەزبوونەوە بوو لە سیکۆلاریزم کە بنەمایەکی سەرەکی دەوڵەتە. پارتی گەلی کۆماری هەر لە سەرەتاوە لەم ئاوازەی دەخوێند و لە ئێستادا

١. فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣١٧-٣١٨ ؛ د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧١.

٢. ئێریك جەی زۆچەر: س.پ.: ل٣٤٣.

٣. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٣ ؛ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢١ ؛ خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٨٠-١٨١.

بەشێوەیەکی زیاتر خوێندەوارە ڕۆشنبیرەکان بەدەمیانەوە گرتبوو. لەڕاستیدا هەڵوێستی پارتی دیموکرات لەگەڵ ئایین ناکۆک بوو. مەندەریس پەنای بۆ سۆزی ئایینی دەبرد بەتایبەت لەکاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکاندا. لە کۆنگرەی پارتەکەیدا گووتی:“ بەبێ گوێدانە هاتوهاواری خرۆشاوە شۆڕشگێڕەکان ئێمە بانگمان کردووە بە عەرەبی و خوێندنی ئایینیمان لە خوێندنگەکاندا پەسەندکرد، لە ئێزگەی ڕادیۆوە قورئانمان پەخشکرد، تورکیا وڵاتێکی مسوڵمانە و هەر بەوجۆرەش دەمێنێتەوە“. لەهەمانکاتدا پارتی دیموکرات هەوڵی نەدا چ لە بواری کارگێڕیی یاخود لە بواری پەیوەردەیی وڵاتدا ڕۆڵێکی مەزنتر بە ئیسلام ببەخشێت(١).

دیموکراتەکان کۆتاییان بە ئاوێتەکردنی دەزگا ئاینییەکان بە بیرۆکراتییەتی دەوڵەتی نەهێنا (لەڕێگەی بەڕێوەبەرایەتی کاروباری ئاینییەوە بەڕێوە دەچوو)، هەروەها هەموو بانگبێژ و پێشنێویژەکان وەک کارمەندی دەوڵەت مانەوە. هەرچەندە ئەوان نیمچە سەربەخۆییەکی ڕێکخراوە ئاینییەکانیان پەسەند کرد وەک ڕێبازە سۆفیگەراکان. تەنانەت شەرعییەتیشیان پێدا پاش ئەوەی پشتگیری جوڵانەوەی نورسییان کرد لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٤ و ١٩٥٧دا(٢).

لە کۆتایی سەردەمی حوکمڕانی پارتی دیموکراتدا هەندێک لە پەرلەمانتارەکان بەتایبەتی نوێنەری شاری قۆنیە(فاخر ئاغا ئۆغلو) لە ساڵی ١٩٥٩ و چەند پەرلەمانتارێکی دیکە هەندێک پێشنیازیان پێشکەشکرد بۆ دەستکاریکردنی دەستوور و گێڕانەوەی ئەو بەندەی دەستوور کە دەیگووت ئیسلام ئایینی دەوڵەتە، بەڵام ئەو پێشنیازانە ئەوەندە پشتیوانیان لێ نەکرا کە گفتوگۆیان لەبارەوە بکرێت(٣).

ئەوەی سەرکردایەتی پارتی دیموکرات بەشێوەیەکی تاکتیکی لە ڕێگەی هەڵوێستیان لە بەرامبەر بە ئیسلام بەڕێوەیان دەبرد، ئەوەبوو کە بەلایانەوە زۆر پێویست نەبوو ئایین لەگەڵ پەرەسەندندا ناکۆک بێت، بۆ زۆربەی دەستەبژێرە خوێندەوارەکە (کارمەند، مامۆستایان، ئەکادیمیستەکان، ئەفسەران) ئەوانەی بە فیکری کەمالیزم بارگاویی ببوون و ئەوانەی کە خۆیان ئەو پێگەیان لەنێو چینی دەسەڵاتداردا لەوێوە بەدەستهێنابوو کە نوێنەرایەتی ڕۆژئاواگەراییان دەکرد، ئەم قەبوڵکردنە هەژموونی کەلتوورییانی، هەروەها ئەو قۆرخکردنەی ئەوانی بۆ شانۆی سیاسی و ماشێنی دەوڵەت دەخستە مەترسییەوە. ئەمەش ئەوە لێکدەداتەوە کە بۆچی کاردانەوەیان لە بەرامبەر بەرجەستەکردنی تەنانەت

---

١. بەوەرگرتن لە: ئیریك جەی زۆجەر: س.پ.: ل٣٤٣.

٢. هـ.س، ل٣٤٥.

٣. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٦-١٧٧.

هەستی ئایینی ناسیاسیش کەمتر لە هستریایانە بوو. لەڕێگەی سوپاوە کە خۆی بە پاسەوانی میراتی ئەتاتورک دەزانی، ئەو هەستەی کە پارتی دیموکرات ناپاکی لە ئاست دابونەریتی کەمالیزم کردووە بەتایبەتی هەڵەیە. ئەمە سەلماندی کە بۆ حکومەت گورزێکی کوشندەیە(١).

لەڕاستیدا نەرمڕەوی لە سیاسەتی سیکۆلاریزمدا لە سایەی پارتی دیموکراتەوە بووبە هۆی ئەوەی ئیسلام زیاتر لە ژیانی گشتی ڕۆژانەی خەڵکدا لە شارەکاندا دەربکەوێت. لەو شارانەی کە کەلتووری لادێکانی بەئاشکرا لە ڕێگەی فراوانبوونی شارنشینییەوە تێدا دەبینرا. ڕۆشنبیرانی تورک ئەوەیان وەک ژیانەوەی ئیسلام دەبینی(٢). کار بەو ڕادەیە گەیشت ئەو گرووپانەی کە پشتیوانیان لە مۆدێنیزە و عەلمانییەت دەکرد، بەتایبەتی ڕۆشنبیرانی شارەکان، ڕەخنەی توندیان لە پارتی دیموکرات گرت و بەگومانەوە باسی ئەوەیان دەکرد کە لە ساڵانی داهاتوودا عەلمانییەت لە تورکیا زەحمەتە خۆی ڕابگرێ و ئەو تۆمەتەیان ڕووبەڕووی سەرۆک وەزیران عەدنان مەندەریس کردەوە کە بەهۆی نەرمی نواندن بەرامبەر بە چالاکییە ئایینییەکان دەیەوێت دەنگی دەنگدەران بکڕێت. تەنانەت هەندێک دەنگی نارەزایی لەنێو خودی پارتی دیموکراتدا بەرامبەر بە نەرمی نواندنەکانی پارتەکەیان لە ئاست چالاکییە ئایینییەکاندا بەرزبوویەوە.

لەلایەکی دیکەوە پارتی گەلی کۆماری کە بەدرێژایی دەیەی پەنجاکان حیزبی سەرەکی ئۆپۆزسیۆن بوو، چەند جارێک ڕەخنەی لە پارتی دیموکرات گرت و ئەو پارتەی بەوە تۆمەتبار کرد کە دژایەتی عەلمانیەت و کەمالیزم دەکات و ئایین بۆ مەبەستی سیاسی بەکاردەهێنێت(٣). پارتی ناوبراو ڕایگەیاند کە ئەوان مەبەستیان دژایەتی ئاینی ئیسلام نییە، بەڵام سەرنج بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە بەکارهێنانی ئایین لە سیاسەتدا وڵات ڕووبەڕووی کارەسات دەکاتەوە(٤).

باسی دووەم/ ڕۆڵی ئایین لە کۆتایی هێنان بە فەرمانڕەوایەتی پارتی دیموکراتدا:

پارتی دیموکرات لە ماوەی دە ساڵەی حوکمڕانیدا ڕووبەڕووی چەندین گیروگرفت بوویەوە کە بوونە هۆی لاوازبوون و دواتر دوورخستنەوەی لە دەسەڵات، لەوانە قەیرانی ئابووری، مەسەلەی ئایین، سیاسەتی سەرکوتکردنی ئۆپۆزسیۆن سەرەنجام پاشاگەردانی باڵی بەسەر وڵاتدا کێشا و خۆپیشاندانی خوێندکاران تەواوی وڵاتی گرتەوە

١. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٤٥.

٢. ھ.س، ل٣٤٥.

٣. د.خەلیل عەلی موراد: حیزبە سیاسییەکان و مەسەلەی ئاین لە تورکیا، ل١٧٧.

٤. ھ.س ل١٧٨.

و زۆر دڵڕەقانە سەرکوتکران بەوهۆیەشەوە کوژراوی لێکەوتەوە. ئەوەش پاڵی بە سوپاوە نا کودەتا لە تورکیا ئەنجامبدات(١). لە بەرەبەیانی ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ تورکیا یەکەم کودەتای سەربازی لە مێژووی هاوچەرخیدا بەسەرکردایەتی جەنەڕاڵ جەمال گۆرسێل(١٩٦٠-١٩٦٦) بەخۆیەوە بینی، کە کۆتایی بە فەرمانڕەوایی دە ساڵەی پارتی دیموکرات هێنا و سوپا دەستی بەسەر وڵاتدا گرت(٢). ڕۆژێک پاش کودەتاکە ڕاگەیەنرا کە جەمال گۆرسێل وەک سەرۆک کۆمار و سەرۆک وەزیر و وەزیری بەرگری دیاریکراوە. ئەوەش لەڕووی تیۆرییەوە هێندەی دەسەڵاتی ڕەها درابوویە کە ئەتاتورکیش بەخۆیەوە نەیبینی بوو(٣).

یەکێک لەو پرسانەی کە لە دوای کودەتاکە باڵی بەسەر ڕای گشتی تورکیادا کێشا، بریتی بوو لە چارەنووسی سەرکردەکانی پارتی دیموکرات، ئەوانەی ڕاستەوخۆ پاش کودەتاکە دەستبەسەر کران. دادگایی کردنەکان لە ڕێ و شوێنێکی توندی پارێزراوی نێو دوورگەیەکی دەریای مەرمەرە و هەروەها لە ئەستەنبوڵیش بەڕێوە دەچوون(٤).

لە ١٥ی ئەیلولی ١٩٦١ دادگا بڕیاریدا بە زیندانیکردنی هەتاهەتایی جەلال بایار و لەسێدارەدانی هەریەک لە عەدنان موندەریس و فەتین ڕوشدی وەزیری دەرەوە و حەسەن بولاتقان وەزیری دارایی، بڕیارەکەش بەسەریاندا جێبەجێ کرا(٥).

لەڕاستیدا کودەتاکە چەندین فاکتەری لە پشتەوە بوو، لە دیارترینیان نیگەرانی سوپا بوو لە هەڵکشانی تەوژمی ئیسلامی لە وڵاتدا، و بەکارهێنانی هەست و سۆزە ئاینییەکان لەپێناو ئامانجە سیاسییەکان لەلایەن پارتی دیموکراتەوە(٦)، ڕوونتر بڵێین، پارتی دیموکرات بەوە تۆمەتبارکرا کە ویستوویەتی دەوڵەت بەرەو ئیسلامگەرایی بباتەوە و هەڕەشەیان لە پرەنسیپەکانی کەمال ئەتاتورک و ڕژێمەکەی کردووە. ئەوەش دادی نەدان کە ئەم سێ ڕابەرە تورکیایان بەهاوپەیمانێتی ڕۆژئاوایی سیاسی و سوپاییەوە گرێداوە و تورکیایان بردووەتە ناو پەیمانی ناتۆ و دەرگای وڵاتەکەیان لەسەر گازی پشت بۆ سەرمایە و کۆمپانیا بیانییە ڕۆژئاواییەکان کردووەتەوە(٧).

---

١. د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٤.

٢. د.یاسین سەردەشتی و ئەوانی تر: س.پ، ل٢٤ ؛ رضا هلال: م.س، ص١٠٠.

٣. ئیریك جەی زۆجەر: س.پ، ل٣٥٦.

٤. د.یاسین سەردەشتی و ئەوانی تر: س.پ، ل٦٦-٦٧.

٥. محەمەد فاتح: س.پ، ل٤٥ ؛ رضا هلال: م.س، ص١٠١ ؛ د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: س.پ ، ل٩٠-٩١ ؛ د.یاسین سەردەشتی و ئەوانی تر: س.پ، ل٦٧-٦٨.

٦. د.خەلیل عەلی موراد: پاسەوانانی کەمالیزم ، ل١٣٤.

٧. د.نەوال عەبدولجەبار سوڵتان: س.پ، ل٩٠-٩١.

دوای لە سێدارەدانی مەندەریس، دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی سوپا بەسەر دەوڵەت و بڕیاری سیاسییەوە بەردەوام بوو هەتا هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٥. لەو ماوەیەدا هەرچی بڕیار و یاسایەک لە سەردەمی مەندەریسدا دەرچوو بوو و بەبۆچوونی دامەزراوەی سوپا لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئەتاتورک نەدەگونجان بڕیاری هەڵوەشاندنەوەیان درا. بڕیاریش درا لەوە بەدوا لە هیچ ئامارێکی دەوڵەتی و غەیرە دەوڵەتیدا ئاماژە بە ڕەچەڵەکی نەتەوەیی و ئایینی هیچ هاوڵاتییەکی تورکیا نەدرێت لە غەیری ڕەچەڵەکی تورکی. ئەمە، بۆ هەموو هاوڵاتیانی سنووری دەوڵەتی تورکیا بوو بە یاسایەکی فەرمی(١).

لەڕاستیدا ڕیفۆرمەکانی پارتی دیموکرات لە بواری ئاینیدا زیاتر پەیوەندییان بە بەرژەوەندییە سیاسییەکانی ئەو پارتەوە هەبووە و هیچ بنەمایەکی ئایدۆلۆجی نەبووە. لەو هۆکارانەش کە پارتی دیموکراتیان بەرەو ئەو سیاسەتە ئاڕاستە کرد پێویستی بەپەرچدانەوەی پارتی گەلی کۆماری، پەیداکردنی بەرەیەکی یەکگرتوو لە دژی کۆمۆنیستەکان و بەدەستهێنانی هەرچی زۆرتری ڕێژەی دەنگدەران بوو(٢).

بەکورتی، سیاسەتی پارتی دیموکرات بەرامبەر بە ئایین بەدرێژایی ماوەی حوکمڕانییەکەی سیاسەتێکی مەبدەئی نەبوو، بەڵکو پراگماتیکی بووە و لەسەر بنەمای بەرژەوەندی دامەزرا بوو، چونکە ئەم پارتە دەستبەرداری بنەماکانی کەمالیزم نەبوو بەتایبەتی سیکۆلاریزم و بە دووڕوویی هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئاینیدا دەکرد، تاوێک لە دژی ڕکابەرە عەلمانییەکەی خۆی بۆ کۆکردنەوەی دەنگ و هەروەها بۆ ڕەواندنەوەی هەڕەشەی کۆمۆنیزم سودی لە ئۆپۆزسیۆنی ئایینی وەردەگرت، تاوێکی تر ئەم ئۆپۆزسیۆنەی دادەپڵۆسی و لێنەدەگەڕا لە دەرەوەی چوارچێوەی ڕەسمی دەوڵەت دامودەزگای شۆڕشگێڕانەی ئیسلامگەرا دابمەزرێت(٣).

## ئەنجام

دوای کۆتایی هاتنی دەوڵەتی عوسمانی و هاتنی کەمالییەکان بۆ سەر حوکم لە تورکیا، کەمال ئەتاتورک لە ڕێگەی کۆمەڵێک بڕیار و یاساوە تەواوی دیاردە ئاینییەکانی لەو وڵاتەدا یاساغ کرد، هەروەک سزای توندیشی لەسەر هەرکەس و گرووپ و ڕێکخراوێک دانا کە بیەوێت لە دەرەوەی یاسا و ڕێنماییەکانی حکومەت مامەڵە لەگەڵ ئاییندا بکات و

---

١٠سامی شۆرش: س.پ، ل٤٦.

٢٠ فەیرۆز ئەحمەد و ئەوانی تر: س.پ، ل٣٢٠.

٣٠ د.عیسمەت بورهانەدین عەبدولقادر: س.پ، ل٩٤.

ئایین بۆ مەبەستی سیاسی بەکاربهێنێت، ڕێ و شوێنێک کە یەکسان بوو بە چەپاندنی گەلانی تورکیای زۆرینە مسوڵمان، چونکە ئەوە پێچەوانەی سرووشت و بیروباوەڕی زۆرینەی ڕەهای هاوڵاتیانی تورکیا بوو، هەربۆیە دوای چارەکە سەدەیەک لە حوکمی دیکتاتۆرییانەی ئەو پارتە، سەرەنجام ڕووداوەکانی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی و دوای جەنگەکە ناچاریان بە کەمێک کرانەوە بەڕووی ئاییندا کرد، نەخاسمە دوای دروستبوونی پارتی دیموکرات، کە وەک مێملێکی سەرسەختی پارتی گەلی کۆماری هاتە نێو گۆڕەپانەکە، پارتی ناوبراو یەکێک لەو کایە و بوارانەی کە دەستی بۆ برد بریتی بوو لە بابەتی ئایین، چونکە زۆرباش لەوە گەیشتبوو کە هاوڵاتیانی تورکیا لە ماوەی حوکمی پارتی گەلی کۆماریدا ڕووبەڕووی چ سەرگەردانی و چەوساندنەوەیەک بوونەتەوە، هەربۆیە پارتی ناوبراو زۆر لێزانانە و بۆ مەبەستی سیاسی دەستی بۆ ئەو بابەتە گرنگە برد، بابەتێک کە زۆرینەی دانیشتوانی تورکیا پێشوازییان لێکرد.

ڕاستە هۆکارەکانی سەرکەوتنی هەرسێ خولی هەڵبژاردنی (١١٩٥٠، ١٩٥٤، ١٩٥٧) زۆر و جۆراو جۆر بوون، بەڵام ئایین ڕۆڵی سەرەکی لە سەرکەوتنی پارتی دیموکراتدا گێڕا، ئەوە لەکاتێکدا پارتی ناوبراو ناوبەناو ئەوەی دوپات دەکردەوە کە پابەندە بە سستەمە عەلمانییەتەکە و تاڕادەیەکی زۆریش خۆی بە پارێزەری بیروباوەڕەکانی کەمالیزم دەزانی.

هەرچۆنێک بێت دەیەی پەنجاکان بەهۆی ئاسانکاریی و کرانەوەکانی پارتی دیموکرات بەڕووی ئاییندا تورکیا بوو بە یەکێک لەو وڵاتانەی کە گرووپ و ڕێکخراوە ئیسلامییەکان دەستیان بە چالاکییەکانی خۆیان تێدا کردەوە، تا ئەو ئاستەی هەندێک جار دەبوونە مایەی هەڕەشە بۆ سەر دەوڵەت و سستەمە عەلمانییەکەی، پارتی دیموکراتیش چ لەبەر ترس و گلەیی نەیارەکانی بەتایبەت پارتی گەلی کۆماری بێ یاخود بەهۆی خواستی خۆی و لەپێناو پاراستنی پایەکانی حوکمڕانی لەو وڵاتەدا ناچار دەبوو هەندێکجار ڕێ و شوێنی توند لە بەرامبەر ئەو کەس و گرووپە ئیسلامییانەدا بگرێتەبەر کە مەترسییان بۆ سەر سستمە عەلمانییەکە و دەوڵەت دروست دەکرد.

دواجار وەک چۆن ئایین هاوکار و پاڵپشتێکی گەورەی پارتەکە بوو لەو سێ خولەی هەڵبژاردندا کە ئەم تیایاندا سەرکەوتووبوو، هەربەوچەشنەش ئایین بووبە یەکێک لە هۆکارەکانی شکستپێهێنان و ڕووخانی حکومەتەکەی مەندەریس لەلایەن سوپاوە، چونکە سوپا لە پاڵ کۆمەڵێک تۆمەتی دیکەدا، پارتی دیموکراتی بە کەڵکوەرگرتن لە ئایین بۆ مەبەستی سیاسی و ختوکەدانی جەماوەر لە بەرژەوەندی خۆی و بوژانەی بیری ئیسلامگەرایی لە سایەی ئەو پارتە و دروستبوونی مەترسی لەسەر سستمە عەلمانییەکەی تورکیا تۆمەتبارکرد، ئەوەش بوو بەهۆی لەکارلادان و دوورخستنەوەی لەسەر حوکم.

# سنەویزادە مەسعوود مەردۆخی

د.هێمن عومەر خۆشناو

ئەم زانایە لە بنەماڵەی سنەوییەکانی مەردۆخییە کە لە بەغدا و سنە و سلێمانی بڵاوبوونەتەوە و بەشێکیشیان کەوتوونەتە ئەستەنبوڵ. بەگوێرەی تۆماری ڕەسمیی فەرمانبەرانی دەوڵەت، کورتەی ژیاننامەی خۆی بەم شێوەیەی خوارەوە نووسیوە:

مەسعوود ئەفەندی نەوەی شارحی تەهزیب و زانای بەناوبانگ و کۆچکردوو شێخ عەبدولقادرە. لە ساڵی ١٢٧٦ی کۆچی ]١٨٥٩–١٨٦٠ [لە شاری سلێمانی لەدایکبووە. لە زێدی خۆیەوە سەری هەڵگرتووە بۆ مزگەوتی ئایاصۆفیا لە ئەستەنبوڵ و لەوێ لای حافز حیلمی ئەفەندی زانستەکانی خوێندووە و دواتر مەکتەبی حقووقی شاهانەی تەواو کردووە. لە ٥ی جەمادیلئاخیرەی ساڵی ١٣٠٣ی کۆچیدا (بەرامبەر ١٨٨٦/٣/١١ز) بە بەرزترین پلە بڕوانامەی حقووقی وەرگرتووە. عەرەبی و فارسی بە قسەکردن و نووسین و زمانی کوردی بە قسەکردن زانیوە. (گولستان و قەواعید) ناوی ئەو کتێبەن کە ناوبراو بە مۆڵەتیی ڕەسمیی لە ئەستەنبوڵ چاپی کردوون، لە ٩ی ڕەمەزانی ساڵی ١٣١٣ی کۆچی (بەرامبەر ١٨٩٦/٢/٢٣ز)بە مووچەی ١٢٠٠ قرووش بە بڕیاری ئەنجومەنی هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی عەدلییە، لە ویلایەتی بەیرووت لە سنجاقی تەرابلوسوششام، لە سەرۆکایەتی دادگای بازرگانی دامەزراوە. لە ٥ی جەمادی یەکەمی ساڵی ١٣١٧ی کۆچی (بەرامبەر ١٨٩٩/٩/١١ز) بە مووچەی ٢٢٥٠ قرووش پلەی بەرزکراوەتەوە و گواستراوەتەوە سەرۆکایەتی دادگای بازرگانیی تەرابلوسی ڕۆژئاوا. دواتر چەند زانیارییەکی تر لەبارەی مووچەکەی خراوەتەڕوو و ئەو تۆمارەش لە ١٧ی زولحیججەی ساڵی ١٣١٩ی کۆچی (بەرامبەر ١٩٠٢/٣/٢٧ز) نووسراوە. ئیتر دوای ئەوە هیچ زانیارییەکی تر لەبارەی ئەو زاتەوە نازانرێ.(١)

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا کە مێژووی ١٣١٧/٥/٥ی کۆچی (بەرامبەر ١٨٩٩/٩/١١ز) لەسەر نووسراوە، ئاماژە بەوە دراوە کە لە شوێنی مەسعوود ئەفەندی لە سەرۆکایەتی دادگای بازرگانی، عاصم ئەفەندی دانرا. لەو بەڵگەنامەیەدا کورتە ژیانی ناوبراو بەشێوەی خشتە دیاریکراوە، کە گوتراوە مەسعوود ئەفەندی لەدایکبووی سنجاقی سلێمانییە و تەمەنی چل ساڵە، مەکتەبی حقووقی شاهانەی بە پلەی بەرز تەواوکردووە و بڕوانامەکەی جێگیرکراوە. لەبەرئەوەی لە سەرۆکایەتی دادگای بازرگانی تەرابلوسوششام سەرکەوتوو بووە، بۆیە بۆ سەرۆکایەتی دادگای بازرگانی تەرابلوسی ڕۆژئاوا هەڵبژێردراوە.(٢)

مەسعوود مەردۆخی سنەویزادە کە لە کۆتایی کتێبێکیدا بە ئەبوئەسعەدیش خۆی ناساندووە و وادیارە یەکێک لە کوڕەکانی ناوی ئەسعەد بووە، هەروەک لە پێشەکییەکەدا دەڵێ ئەو کاتەی کە لە سنجاقی (جدە) بووم لە کتێبە گەورەکانی زمانی عەرەبییەوە ئەم کتێبەم کە بە عەرەبییەکەی (تهذیب الخطاب فی علم الاعراب)ە بۆ هەردوو لە کوڕەکانم

---

1. DH.SAİDd.00092

2. İ..AZN.00035.00008.003

(ئەسعەد و سەعدی) کورتکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە بەرگی کتێبەکە نووسراوە کە نووسەر کتێبی دیکەی هەن.

لە بەڵگەیەکی بەشی ئەوراقی نێو کتێبخانەی شارەوانی گەورەی ئەستەنبوڵ بە ژمارە ٥٤٣٩٣ هاتووە کە؛ ناوبراو مەسعوود کوڕی مەحموود ئەلمەردۆخی خاوەنی کتێبی (تهذیب الخطاب فی علم الاعراب)ە و سەرۆکی دادگای بەرایی جیددەیە لە ساڵی ١٣٢٥.

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەی هەمان کتێبخانە بە ژمارە ٥٤٣٩٤ هاتووە کە ئەندامی دادگای ئیستیئنافی حەلەبە لە ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی، هەروەها ساڵی ١٣٤٠ یش (١٩٢١-١٩٢٢ز) نووسراوە، وا دیارە تا ئەو ساڵە هەر لە ژیاندا بووە، کە تەمەنی دەکاتە سەرووی شەست ساڵ، ئاماژەیشی بە دوو کتێبی تری ناوبراو داوە، کە بریتین لە:

نحو عربی معلمی، بە ژمارە ١٥٠٧٨

تسهیل مدخل الفبا بە ژمارە ٢٠٧٨٧

کتێبەکانی سەر بەرگ بریتین لە:

١-نحو عربی معلمی (١١٤ مادەلک قواعد اساسیة و ١٨٢ ادات وأمثلەسی)یاخو تهذیب الخطاب فی علم الاعراب، مؤلفی سنوی زادە مسعود المیردوخی، ایکنجی طبعی، استانبول، نجم استقبال مطبعەسی، ١٣٤٠. ٣٢ لاپەڕە.

ئەم کتێبە دەربارەی نەحووی عەرەبییە و بە شێوەیەکی زۆر ئاسان بە زمانی تورکی ڕاڤەی کردووە و بۆ ئەو تورکزمانانەی تازە دەست بە فێربوونی عەرەبی و نەحووی عەرەبی دەکەن کتێبێکی زۆر ئاسان و بەپێزە. ئەم کتێبەش چاپی دووەمە، ناشزانرێ چاپی یەکەمی لە چ ساڵێک چاپ کراوە. ئەوەندە هەیە لە پێشەکیی کتێبەکەدا ساڵی نووسینی پێشەکییەکەی بە ١٣٢٥ی کۆچی نووسیوە کە دەکاتە ساڵی ١٩٠٧ی زایینی.

کتێبەکە لە کتێبخانەی ئیسام بەم دوو ژمارانە پارێزراوە: (E13619) و (٤٩٢,٧).

هەروەها لە کتێبخانەی شارەوانیی گەورەی ئەستەنبوڵیش بەم ژمارانە تۆمارکراوە:

قەبارە: ١٩X١٣ سانتیم

لاپەڕە: ٣٢

ساڵی چاپ: ١٣٤٠ک/ ١٩٢٤ ز

شوێنی چاپ: ئەستەنبوڵ

چاپخانە: ؟

چاپی دووەم

ژمارە: OE_TK_01570

ناوونیشان: SİN 1340 R/1924 k.1/1 492.7

کتێبەکانی دیکەی کە لە بەرگەکە وەک کتێبی چاپکراو نیشانیداون، بەڵام ئێمە بە چاوی خۆمان کتێبەکانمان نەبینین. بریتین لە:

٢-گلستان قواعد، قواعد فارسی. ئەم کتێبە نرخەکەی ٧٢٠ قڕووش بووە.

ئەم کتێبە ئەگەرچی لە بەرگەکەیدا تەنیا ناوی (مسعود) نووسراوە، بەڵام لە سەرەوەدا نووسراوە مسعود نەوەی عبدالقادری خاوەنی شەرحی تهذیب الکلام، بەمەش بەدیاردەکەوێت کە ناوبراو نەوەی شێخ عەبدولقادری موهاجرە. ئەم کتێبە لە کتێبخانەی زانکۆی ئەتاتورکی ئەرزەڕۆم بە ژمارە (٠١٢٩١٤٣) پارێزراوە و ٦٠ لاپەڕەیە و لە چاپخانەی قصبار لە ئەستەنبوڵ لە ساڵی ١٣١١ی کۆچی بەرامبەر ١٨٩٣ی زایینی چاپ کراوە.

٣-عروسان فوائد در گلستان قواعد: قواعد فارسی. ئەم کتێبە نرخەکەی ١٠ قڕووش بووە.

ئەم کتێبەش لە کتێبخانەی زانکۆی ئەتاتورکی ئەرزەڕۆم بە ژمارە (٠١٠٧٠٧٤) پارێزراوە. لەم کتێبەش نووسراوە سەرۆکی دادگای بازرگانیی تەرابلوس شام: مەسعوود. ساڵی ١٣١٦ی کۆچی، لە مطبعة البلاغة لە طرابلس الشام چاپ کراوە. لە کۆتایی کتێبەکەدا (شاکر صوفیەلی) سەرۆکی دادگای سزا، تەقریزنامە و سوپاسنامەیەکی بۆ نووسیوە و کتێبەکەش ٨٨ لاپەڕەیە.

٤-تقویم دائمی منظوم: ئەم تەقویمە نرخەکەی پازدە قڕووش بووە.

٥-مدخل الفبا: ئەم کتێبە نرخەکەی ٤ قڕووش بووە.

لەم کتێبەدا ناوی نووسەرەکە بە (مردوخی مسعود) لەسەر بەرگەکە نووسراوە. لە چاپخانەی (لوکس) لە حەلەب لە ساڵی (١٣٣٢) ی کۆچی (١٩١٤ز)چاپ کراوە. کتێبەکە وەک سیپارەی کوردی وایە، چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسییە بۆ دەستپێکەران. دیارە ئەو کاتە نووسەر ئەندامی دادگای ئیستیئنافی حەلەب بووە. لە کۆتایی کتێبەکەشدا کە بیست لاپەڕەیە، بە هەر سێ زمانی تورکی، عەرەبی و فارسی شیعرێکی لەبارەی کتێبەکە نووسیوە. کتێبەکە لە زانکۆی ئەتاتورک لە ئەرزەڕۆم بە ژمارە (٠١٣٤٦٦٨) پارێزراوە.

هەموو کتێبەکان وەک نووسراوە شوێنی فرۆشتنیان: باب عالی جوارندە، نجم استقبال مطبعەسی یە.

## سەرچاوەکان:


- DH.SAİDd.00092
- İ..AZN.00035.00008.003

- کتێبخانەی ئیسام
- کتێبخانەی شارەوانی گەورەی ئەستەنبوڵ
- کتێبخانەی زانکۆی ئەتاتورک لە ئەرزەڕۆم



# هەڵەبجە و ڕاپەڕینەکانی لە بیرەوەری ئازاد تۆفیق (پارێزگاری هەڵەبجە)دا

**ئامادەکردنی: عادل صدیق**

ئەم دیدارە کاتژمێر دووی پاشنیوەڕۆی ڕۆژی ٢٠٢٢/٢/١٥ لەگەڵ بەڕێز ئازاد تۆفیق پارێزگاری هەڵەبجە لە ماڵەکەی خۆی کە دەکەوێتە نێوان هەڵەبجە و ناحیەی سیروان ئەنجامدراوە. دیدارەکە لەچوارچێوەی زنجیرە دیدارێکدایە کە لەگەڵ شایەتحاڵەکانی ڕاپەڕینی ١٣ی مایسی ١٩٨٧ هەڵەبجە ئەنجامدراوە. کاک ئازاد لەم دیدارەدا تیشک دەخاتە سەر وێستگەکانی ژیانی خۆی لە منداڵییەوە هەتا قۆناغەکانی خوێندن و تێکەڵبوونی بە کایەی ڕۆشنبیریی و ژیانی سیاسیی و ئەو سەختی و نەهامەتییانەی کە ڕوبەڕووی بووەتەوە هەتا ڕۆژی دوو ڕۆژ بەر لە کیمیابیبارانی هەڵەبجە، ناوبراو لە ڕێگەی گێڕانەوەکانییەوە بەوردی تیشک دەخاتە سەر بەشداریی و ڕۆڵی خۆیی و هاوڕێکانی لە ڕاپەڕینەکەکانی کۆتایی حەفتاکان و دەیەی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو. بەهیوایین ناوەڕۆکی ئەم دیدارە ببێتە بەڵگەیەکی دیکەی مێژوویی لەسەر کۆی ئەو باس و بابەتانەی کە لەم دیدارەدا ورووژێنراون بەتایبەت هۆکار و دەرەنجامەکانی ڕاپەڕینی مایسی ١٩٨٧ هەڵەبجە.

**پرسیار/ ئەکرێ خۆتان بناسێنن؟**

وەڵام/ من ناوم ئازاد تۆفیق ڕەحیم ـ ە، لە ڕۆژی ١٩٦٠/٤/٢٤، لە کۆڵانێکی گەڕەکی پیرمحەمەد لە ماڵێکی هەژارنشین لەدایکبووم، لە ماڵی باوکی دایکم کە ئێمە پێی ئەڵێین باوکم، ماڵی عەلی کەریم هاروونی، تا ساڵی ١٩٧١ لەو ماڵەدا بووین، دوای ساڵی ١٩٧١ ماڵمان بار ئەکات بۆ ناحیەی سیروان، پێشتر باوکم ئەگیرێ لەسەر ئەوەی کە پێی ئەوترێ کوردایەتی و پارتایەتی، دوای یانزەی ئازار ڕێکەوتنی کورد و شۆڕش و حکومەتی عێراقی ئەوکاتە ئەبێ، عەفوات دەرئەچێ هەموو کەس ئەگەڕێتەوە سەر وەزیفەکەی، باوکی منیش بەر ئەبێت و ئەگەڕێتەوە سەر وەزیفەکەی و لە بەهاری ١٩٧١دا بار ئەکەین بۆ ناحیەی سیروان.

باوکم کە پێی ئەڵێم کاکەم، ئەوە باوکمە، ناوی تۆفیقی ڕەحیمە، ساڵی ١٩٢٨ لە گوندی عەبابەیلێ لەدایکبووە، بە منداڵی دێنە هەڵەبجە(١٩٣٢بۆ١٩٣٣) و لە گەڕەکی پیر محەمەد نیشتەجێ ئەبن، ئیتر لە هەڵەبجەدا گەورە ئەبێت و دواتر دایکم لە ساڵی ١٩٥٢ ئەهێنێت. دایکیشم ناوی سۆیبەیە، سۆیبەی کچی عەلی کەریمی هاروونی، ئەویش لە ساڵی ١٩٣٢ لەدایکبووە، خەڵکی هەڵەبجەیە بووە و هەر لە هەڵەبجەدا لەدایکبووە و لە کۆڕەوەکەدا(١٩٩١) کۆچی دوایی کردووە.

سەبارەت بەبراو خوشکەکانم، من یەک برا (نزار) و سێ خوشکم (لەیلا و لەمیعە و بەیان)هەیە، لەیلا لێرەیە، لەمیعە و بەیان لە ئەورووپان، من لە نزار گەورەترم، بەڵام دوو خوشکم لە من گەورەترن، سەبارەت بە ساڵی لەدایکبوونمان، لەیلا ساڵی ١٩٥٤ و لەمیعە ١٩٥٨ و من ١٩٦٠ و بەیان ١٩٦٢ و نزاریش شەوی هەینی ١٩٦٩/١٢/١٩ لەدایکبووە، وا ئەزانم ئێستا لەدایکبووە.

باوکم هیچ برایەکی نەبووە، تەنها سێ خوشکی هەبووە، بەناوەکانی: شەمسە، ڕووناک، حەپسە. شەمسە دە ساڵە مردووە، حەپسە چوار ساڵە مردووە، ڕووناکیش لە ژیاندا ماوە. باوکم ساڵی ١٩٢٨ لەدایک ئەبێ، لە ساڵی ١٩٣٣بۆ١٩٣٤ دێنە هەڵەبجە، واتە کە دێنە هەڵەبجە هێشتا نەچووەتە قوتابخانە، لێرە(هەڵەبجە) هەتاکوو سێی خوێندووە، بەڵام حەیف لێم نەپرسی لە چ مەکتەبێک خوێندوویەتی.

وەک پیشەش، باوکم لە پەنجاکاندا چاییچی بووە، دوای ئەوە لە شەستەکان یانەی فەرمانبەرانی ئەکرێتەوە، باوکم تەعینی ئەو یانەیە ئەبێ، واتە ئیدارەی ئەو یانەیە ئەبات بەڕێوە تا ساڵی ١٩٧١، بەڵام ماوەیەک لە ١٩٦٥ ئەگیرێ و بەند ئەکرێ، دواتر بەرئەبێت و دێتەوە. ساڵی ١٩٧١ وەزیفەی هەبووە، لەسەر مەزەخەکەی ئاوی سیروان ئیشی کردووە، کە بە گاز کاری کردووە، ئەبوو ڕۆژانە مەزەخەکە ئیش پێ بکات و تەنکییەکە

پڕ بکات و ئاوەکە بەناو ناحیەی سیرواندا بڵاو ببێتەوە، یانی تەوزیع بکرێت بە ماڵاندا. ئەمە کارەکەی بووە.

ساڵی ١٩٦٦ باوکم کە پێمان ئەگووت کاکە، دەستی من ئەگرێ لەگەڵ کوڕێکی هاوڕێمدا بەناوی عادلی کەریمی ئەحمەد ئەوبەری، ئێستا وەکیلی وەزیرە لە بەغدا، بەیەکەوەین کوڕی ماڵێکین، یەک دیوارمان نێوانە، دەستمان ئەگرێ و ئەمانیبات هەردووکمان لە قوتابخانەی سەرکەوتن داخڵ ئەکات. سەرکەوتن لە شوێنی مەرزەبۆتۆی ئێستادا بوو.

مامۆستاکانیشمان بریتی بوون لە: ئەحمەدی مەحمودی مام عەزیز، ڕەئووفی ئەخلی بارام، شێخ کەمال، نەوزاد، نووری مەحموده فەنی، حەمەعەلی مامەکەریم، کە ئێستاش لە ژیاندا ماوە، مامۆستا شێخ عومەر عەبابەیلێیی، باوکی کاک حەسەن کە ئێستا ئەندازیارە و یەکێکە لە ئەندازیارە زۆر باشەکان لە سلێمانی. مامۆستا نەوزاد ماوە، بەڵام مامۆستا ڕەئووف و مامۆستا نوری و مامۆستا ئەحمەد کە بەڕێوەبەر بوو کۆچی دواییان کردووە.

من هەتاکوو پۆلی پێنجی سەرەتایی لەوێ ئەخوێنم، ساڵ ئەبێ بە ١٩٧١، باوکم ئیعادەی وەزیفە ئەبێتەوە کە گیراوە، ماڵمان بار ئەکات بۆ خانووە زەردەکانی سیروان، لەوێین تا بەهاری ١٩٨٠، واتە بەهاری ١٩٧١ تا بەهاری ١٩٨٠، نۆ ساڵ ماڵمان لە سیروان ئەبێت، لەوێ چوومە شەشی سەرەتایی، لە مەکتەبی سیروانی سەرەتایی ئەخوێنم، یەکی ناوەندییش لەوێ ئەخوێنم، دوایی بۆ دوو ناوەندی دیم بۆ مەکتەبی شارەزوور لە هەڵەبجە، تا سێی ناوەندی هەر لە ناوەندی شارەزوور ئەبم.

شارەزوور یەکەمجار مامۆستا هیوای شێخ صەفادین بەڕێوەبەری بوو، مامۆستاکانیشمان بریتی بوون لە: محەمەدی شێخ موحسین و سروەخانی خوشکی، مامۆستا شەماڵ ڕەشید کە خەڵکی سلێمانی بوو، برای دکتۆر لەتیف ڕەشیدە کە ئێستا کاندیدە بۆ سەرۆک کۆماری عێراق، مامۆستا نووری بوو، مامۆستا حەمەفەرەجی ئەحمەدی حەمەموراد مامۆستای وێنەمان بوو، مامۆستایەکی عەرەبیشمان بۆ هاتبوو ناوی مامۆستا جیهاد بوو، وەرزشی پێ ئەوتین، ئەمە لە دوای ١٩٧٧ بوو. ئەم مامۆستایانە وانەیان پێ ئەوتین، ماوەیەکیش بەڕێوەبەرەکەمان ناوی مامۆستا حافظ مائی بوو، ساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧، لە ساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩دا بوو بە مامۆستا هیوای شێخ صەفادین، وەک گووتم ئەوکات ماڵمان لە سیروان بوو، هەربۆیە ڕۆژانە هاتوچۆم ئەکرد، جاری وا هەبوو سەیارەی فەرمانگەی پرۆژەی شارەزوور(مەشروعەکەی) سایەقەکەی کوڕێکی زاوامان بوو، یان خاڵۆم بوو، یان هەر سایەقێکی دیکە، ئەیانزانی من کوڕی تۆفیقم و ماڵمان لە سیروانە هەڵیان ئەگرتم.

ئەڵبەت من بە تەنها نەبووم، قوتابی تریشم لەگەڵ بوو، دوو کوڕی ڕەفیقم بەناوی

عەلی حاجی عەبدولڕەحیم ئەویش تا سێی ناوەندی خوێند، کاک بەکری برای سێی ناوەندی تەواوکرد، دواتر ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆی تەواو کرد.

**پرسیار/ کاک ئازاد، ئەڵێن عەبابەیلێ لە گوند گەورەترە بووە، لەبەرئەوەی خەڵکی جیاوازی تێدا بووە، واتە عەبابەیلێ تەنها خەڵکی عەبابەیلێی تێدا نەبووە، بۆ نمونە هەورامی، جافی و خەڵکی ڕۆژهەڵاتی کوردستان و زەنگەنەی تێدا بووە، ئێوە ئەمەتان بیستووە؟**

وەڵام/ من ناتوانم پشتڕاستی بکەمەوە هەورامی تیا بووبێ، ناتوانم پشتڕاستی بکەمەوە زەنگەنەی تیا بووبێ، یان جافی تێدا بووبێ، عەبابەیلێ لە مسکێن و شێخان پێکهاتبوو، لە بیست و بیست و یەکی سەدەی ڕابردوو کە شێخان، شێخ ڕەشیدی باوکی شێخ کەمال ڕۆڵی هەبووە، دوای ئەو شێخ کەمال ڕۆڵی هەبووە، خەڵکی دیکەی هەژار هەبووە، لە عەبابەیلێ پێموایە ڕۆژهەڵاتی تێدا بووە، چونکە عەبابەیلێ خەتی تەماسی نێوان کوردستانی عێراق و ئێرانە، لەوێوە ئەڕۆیتە ئەشکەوەڵ و بە گریانهدا ئەچیتە ئەودیو بۆ شۆشمێ و ئەوانە، یان لە تەوێڵەوە بۆ ڕۆژهەڵات، ئەکرێ ئەوانی تیا بووبێ. عەبابەیلێ وابوو، گوند نەبووە، وەک بیستبێتم سەندیکای کرێکارانی تیا بووە، بزووتنەوەی چەپ(شیوعی) و نەتەوەیی(پارتی) تێدا بەهێز بووە. لە عەبابەیلێدا قوتابخانە هەبووە، ئەگەر ئامارێک وەرگریت، هی پەنجا ساڵ لەمەوپێش، واتە ئێستا ساڵی ٢٠٢٢وە بۆ ١٩٧٢، لە ٧٢دا ئەگەر ١٠٠ مامۆستا لە هەڵەبجەدا بووبێت، ئەتوانین بڵێین ٣٠ خەڵکی عەبابەیلێ بووە، ١٠ بەڕێوەبەر بووبێ ٣یان خەڵکی عەبابەیلێ بووە، بۆیە ئەتوانین بڵێین خوێندەواری و بڕوانامە لە عەبابەیلێدا، حەرەکەی کرێکاری و بزووتنەوەی چەپ لە عەبابەیلێدا وایکردبوو ڕەونەقێکی مەدەنیانە و پێشکەوتووی هەبێت.

**پرسیار/ هیچ یادگارییەکتان لەگەڵ بۆردومانی ١٩٧٤دا هەیە، لەکاتێکدا ئێوە ماڵتان لە سیروان بووە؟**

وەڵام/ ئێمە ١٩٧١ ئەچینە سیروان، بەڵام ماڵی باوکی دایکم و ماڵی خاڵۆکانم لە هەڵەبجە بوون، من قوتابیم و هاتوچۆ ئەکەم، ڕۆژی ١٩٧٤/٤/٢٤ بۆردومانی قەڵادزێ ئەکرێ، ڕۆژی ٤/٢٥ من و کاکەم هاتین بۆ هەڵەبجە، ماڵی خوشکێکم وتیان با بێینەوە بۆ سیروان نەک بۆردومانی هەڵەبجەش بکرێ، چونکە هەر لە ڕۆژی ٢٥دا بە فڕۆکە کەشفی هەڵەبجە کرا، سورِێکی خوارد و گەڕایەوە، من بیرم دێ ڕۆژی ٤/٢٦، کە ڕۆژی هەینی بوو، بۆردومانی هەڵەبجە کرا ئێمە لە سیروان بووین، فڕۆکەکان بەسەر سیرواندا هاتن و هەڵەبجەیان بۆردومان کرد. دێتە خەیاڵم سێ بۆ چوار فڕۆکە هاتن، بۆردومانیان کرد و گەڕانەوە، ئیتر من هەستم ناکەم فڕۆکەی تر هاتبێتەوە، ماڵی باوکم پێوە ئەبن، لەوکاتەدا



**من بە سەراحەت ئەیڵێم دوای دروستبوونی تەنزیمی ئاڵای شۆڕش هەموو تەنزیمەکانی تر لە هەڵەبجە تووشی شەلەل بوون، چونکە ئاڵای شۆڕش نوخبە موسەقەف و عاقڵەکەی ناو کۆمەڵە بوون، هەموویان، دەستبژێرەکان بوون.**

کچێکی پوورم لەگەڵ مێردەکەی و سێ منداڵی لە سلێمانییەوە ڕایانکردبوو لەوێ بوون.

کچە پوورەکەم ناو گوڵاڵە و مێردەکەشی ناوی قادر ڕەشید بوو، جوانە و دوو کوڕی تریان هەبوو، نازانم ناوەکانیان چییە، لەم بۆردومانەدا لە ماڵی باوکم ئەبن لە پیرمحەمەد، هەم باوکی دایکم بریندار ئەبێ، هەم ئەم کچەی پوورم، مێردەکەی و کچێکی و کوڕێکی شەهید ئەبن، خۆی و یەک کچی ئەمێنن بەناوی جوانە ئەچنەوە بۆ سلێمانی. لە ماڵی باوکمدا کرێچیمان هەبوو، کاک ئومێد هەیە لە مۆنۆمێنتەکە ئیش ئەکات، دایکی کاک ئومێد خزمی دایکی منە، ماڵی کاک ئومێد کرێچی ماڵی باوکم ئەبن، کە بۆردومانەکە ئەبێ دایکی و برایەکی پێوە ئەبن، ئومێد و باوکی دەرەچن، ئەم ئومێدە ساڵی ٨٨ جارێکی دیکە دوای ساڵی ١٩٧٥ باوکی ژن ئەهێنێتەوە، دیسان جارێکی دیکە بەر کیمیاویی ئەکەون، زڕدایکەکەی و خوشکی و برای تریشی تیا ئەچن، یانی دوو جار ماڵی وێران بووە.

ماڵی باوکم پێوە ئەبێ، خانووەکەیان ئەڕووخێ، بەرامبەر ماڵی ئێمە ماڵی لالۆ حەمەئەمینی قادر بەگ، ماڵی کەریم ئەوبەری، ماڵی قالەی قەساب کە ئەکاتە پورزای دایکم و نەورۆلین، هەموویان پێوە ئەبن، کوڕێکی قالەی قەساب بەناوی حەکیم ئەکوژرێ، مناڵێکی حەسەنی کوڕیشی شەهید ئەبێ، گەڕەکی پیرمحەمەد بەر بۆردومانی ١٩٧٤ کەوت، وەک چۆن لە ٨٨یشدا لە کیمیاییەکەدا گەڕەکی پیرمەحەمەد لە ڕووی گیانییەوە زۆر زەرەرمەند بوو، لە ٧٤یشدا زۆر زەرەرمەند بوون.

**پرسیار/ ئەو دوکان و خەڵکە دیارانەی لە (پیر محەمەد)دا هەبوون کێ بوون؟**

وەڵام/ لە پیرمحەمەددا دوکانەکانی سۆفی ساڵح و عەبە خڕە و حەمەی فەرەج هەبوو. سۆفی ساڵح دوکانی دارتاشی و ئەوانەی هەبوو، ئێمە ئەچووین مزراحمان لەوێ ئەکڕی، عەبە خڕە ئاشی هەبوو، بێجگە ئاش لە پاڵیدا خان هەبوو، بۆ ئەو وڵاخانەی کە بارەکان ئەهێنا بۆ ئاش، بۆئەوەی لەوێ بمێننەوە، کە خانی عەبە خڕەیان پێ ئەوت، کابرا

که ئەهات تەماتەی ئەهێنا، خەڵوزی ئەهێنا، میوەی ئەهێنا لە شارەزوورەوە، ئەهاتن کەر و بارەکەیان لەو خانەدا دائەنا، تا ئیشەکانیان ئەکرد، دوایی نانێکی ئەخوارد، یا حەمامیان ئەکرد، یان بۆرییە چرایەکی ئەکڕی، یان جلی ئەکڕی، یا شەکری ئەکڕی، یا چای ئەکڕی، دواتر ئەمانە ئەگەڕانەوە بۆ بەری نەورۆلی، یان بۆ شارەزوور، یان بۆ هەورامان. ئەوکات خانەکەی عەبەخڕە مەشهوور بوو.

هەر لە گەڕەکی پیرمەحەمەد ماڵی عەبە ڕیش سوور هەبوو، حەمامیان هەبوو، خەڵک ئەڕۆیشتن بە پارە خۆیانیان لێ ئەشۆرد. حەمامەکە لە ماڵی خۆیاندا بوو، من لەگەڵ دایکمدا چووم لەو ماڵە خۆم ئەشۆرد، مناڵ بووم، ئەمەی ئەیگێڕمەوە لە ٦٣ بوو، سێ ساڵ بووم، چوار ساڵ بووم، وای لێهاتبوو ئەوانەی لەگەڵ دایکمدا خۆیان ئەشۆرد ئەیانگووت ئەم کوڕە گەورە بووە دادە سۆیبە ئیتر مەیهێنە بۆ حەمام. ماڵی کەریم ئەوبەری لە پاڵ ماڵی ئێمەدا بوو، پیاوێکی بازرگان بوو، هەیبوو، کوڕەکانی ئەندازیار بوون، کچەکانی مامۆستا بوون، دەرچووی پەیمانگا، خێزانێکی خوێندەوار، ماڵی خولەسوور بەرامبەر ئێمە بوون، حاجی مەحمود تا ئێستا خۆشی ماوە و دوکانەکەشی ماوە لە گەڕەکی پیرمحەمەد. هەر لە گەڕەکی پیرمحەمەد دوکانی عوسمانی ڕەسام کە یەکێکە لە ڕەسامە مەشهوورەکان، ئازادی برای لەو دوکانەدا پێوە ئەبێت. عوسمان تاکە ڕەسامی هەڵەبجەیە، لە سەرووی ڕەسامەکەوە مەکتەبەیەکی جوان هەیە مەکتەبەی عومەری کاکی پێ ئەڵێن، مەکتەبەی مەولەوی، من لە ساڵی ١٩٧١-١٩٧٢ لە پێنجی سەرەتایی بووم ئەچووم لەوێ ڕۆژنامەم ئەکڕی، لە ساڵی ١٩٧٢-١٩٧٣دا مەتەڵ هەبوو لە ڕۆژنامەی ژین، وەڵامم ئەدایەوە نەمئەزانی چۆن بینێرم بۆ سلێمانی، پیاوێک کادر بوو لە ماڵماندا وەڵامەکەی لێ وەرئەگرتم خۆی پولێکی دە فلسی بۆ ئەکڕی، چونکە وەکو ئابوونەیەک بیدەی بە ڕۆژنامەکە، من لەم ئەخیرا ئەمزانی، ناوم لە ڕۆژنامەی ژین هەیە، ئازاد تۆفیق کە وەڵامی مەتەڵم داوەتەوە، دوو جاریش، بۆ مێژوو وێنەیانم لای خۆم پاراستووە، بۆ ئەرشیف ئەوە شتێکی جوانە، هەر لە پیر محەمەد دوکانێکی گەورە هەبوو وەکو ئەوەی ئەمڕۆ پێی ئەڵێن مۆڵ، دوکانی حاجی عەبدولڕەحمان (ئەوڕەحمانە فێڵە) لە موسەلەسەکەدا بوو، بە ڕەسم ماومە.

جگە لە مانە حاجی ئەولقادر(عەبدولقادریش) هەبوو، کە مەشهوور بوو بە حاجی شەخەڵە، حاجی ئەوڕەحمانە فێڵە پیاوێکی جوان، نورانی، ڕیشێکی هەبوو، ئەو کاتە مەکینەی هەبوو چۆرەک و نوقڵی دروست ئەکرد، هەموو جۆرە نوقڵێک و شیرینییەک لەوێ هەبوو. پیاوێ بە ئەسڵ هەڵەبجەیی بوو.

دوکانێکی دیکە هەبوو لەمبەرەوە لە پیرمحەمەد دوکانی ساڵحی مەلا سابیر باوکی

ئەم کاک ئازادەی کە مەسئولی تیپی مۆسیقا شنروییە، ئەم کاک سالّحە فرنی هەبوو، لەم فرنەدا بە کێک چۆلەکەی بۆ دروست ئەکردی، دەنووکێکی جوان و چاوێکی سووتاو، ئەچوویت ئەتکڕی و ئەتخوارد بە پێنج فلس، دەمانچەی ترەقەی هەبوو، چەقۆیەک هەبوو پێیان ئەوت چەقۆی دە فلسی، ئێمە ئەمانکڕی بۆ کۆلارە دروست کردن، شەڕە ڕممان ئەکرد بە دار، بەو چەقۆیە، بەڵام یەک کەس دە فلسی پێ بوو ئەوە بکڕێ، ئیتر ئەو چەقۆیە ئەبوو بە چەقۆی منالانی گەڕەک، توخوا ئەو چەقۆیەم بدەرێ، توخوا ئەو چەقۆیەم بدەرێ، لەبەرئەوە سەعات دە ئەو چەقۆیەت پێ بوو سەعات دوو ئەو چەقۆیە نەئەهاتە دەستی خۆت، دارلاسیکیان پێ چاک ئەکرد، چەرمی دارلاسیکیان پێ چاک ئەکرد، لاسیکی دارلاسیکیان پێ چاک ئەکرد، ڕممان پێ دروست ئەکرد، نوکەکەیمان پێ تیژ ئەکرد.

سەبارەت بە یارییەکانی سەردەمی منالّی ئێمە، گۆلّ گۆلّێن، حەوتبەردێن، پیلێکی مورەبەع هەبوو، لەم ماوەدا هەوالّم پرسی دەستم نەکەوت، ئەمەوێ حەوت لەو پیلە بکڕم هەر لە مالّەوە دایبنێم، من لە پۆلی یەکی سەرەتایی چیم خوێندووە، ئەلفباکەی بالّدار هەلّمگرتووە هەمە، حەزم ئەکرد ئەو پیلەشم هەبێ، حەوت بەردێنمان ئەکرد، یارییەکمان ئەکرد پێمان ئەوت فڕیوە، پێمان ئەوت یەکەو حەیزەران، هەلوکێن، توولێنمان بە بەرد ئەکرد، هەلوکێنمان بە دار ئەکرد، گۆلّ گۆلّێن ئەگەر یەکێ تۆپی هەبوایە، من باوکم لە نادی بوو، پارەمان هەبوو، تاکە کەس بووم لە کۆلانی گەڕەکی پیرمحەمەد فوتبۆلّم هەبوو، فوتبۆلّ چووپی هەبوو، چووپەکەی پڕ ئەکرا لە هەوا، ئینجا سەرەکەی ئەگیرا، وەختی وا هەبوو چووپەکە ئەتەقی، ئەڕۆیشتین چاکمان ئەکردەوە، یەکی پێنج فلس کۆبکەنەوە، من لە کتێبی یەکەمی بەشی پیرمحەمەددا باسم کردووە کە ئەو یارییانە چین.

**پرسیار/ ئێوە تا بەهاری ١٩٨٠ لە سیروان ئەبن، دوای ئەوە؟**

وەڵام/ ئێمە تا بەهاری ١٩٨٠ لە سیروان ئەبین، دوایی دێینەوە هەڵەبجە، لە هەڵەبجە هەر لە گەڕەکی پیرمحەمەد خانوویەک ئەکڕین بە قەرز و قۆڵە تیایدا ئەبین هەتا کیمیابارانی هەڵەبجە.

پرسیار/ سالّی ١٩٧٨ لە هەڵەبجە خۆپیشاندان و مانگرتن ئەکرێ، لەسەر چی بوو؟

وەڵام/ مانگرتنی یەکەم سالّی ١٩٧٨ لەسەر خوێندن بوو بە زمانی عەرەبی، من زۆر جوان باسی ئەوە ئەکەم، هەموو ڕیزیان کردووین لە قوتابخانەی شارەزوور، بەڕێوەبەر ناوی مامۆستا حافظە، باسمان بۆ ئەکا، ئەوەی زمانێ بزانێ باشە، دوو زمان بزانێ باشە، ئێوە بۆ خوێندنیان ناردوون، وردە وردە بۆئەوەی زمانی عەرەبی فێر ببن، مەنهەجەکەتان ئەبێ بە عەرەبی، ئێمە کردمان بە هۆسە و فسکە فسک و ڕیزەکانمان تێکدا و وتی کەس قسە نەکات، یەڵڵا مامۆستا بۆ پۆل، مەنهەجیان بەسەردا دابەش کردین، کە کتێبەکانیان

داینێ، لە قوتابخانەکەی ئێمە بوو بە خۆپیشاندان، کوڕێکی ڕەفیقم ناوی عوسمانی نەجیبە، شەقی لە کتێبێک هەڵدا دای لە سەقفەکە، کتێبەکە پەڕە پەڕە بوو، من چووم بە گژیا، وای ئەزانی کە چووم بە گژیا پێم ناخۆشە و من حەزئەکەم زمانەکە زمانی عەرەبی بێ، یانی وەکو وابێ من بەعسی بم، وتم کاکە عوسمان گیان پێم ناخۆشە لەبەرئەوەی تۆ لەم هەموو کتێبەدا لە کتێبی دینت هەڵداوە، ئەها پەڕە پەڕەی قورئانەکە، ئیتر هەردووکمان دەستمان گرت بە دینەکەوە و ماچمان کرد و خوا سەبەبکاری ئەمە بگرێ و ئەستەغفیروڵڵا خوایە گیان و ئەوەنە پەشۆکاین شەقمان لە کیمیا یان لە فیزیا یان لە عەرەبی یا لە بیرکاری یان لە کۆمەڵایەتی، نەدەدا، دینەکە بەر شەق کەوت، ئا لەبەرئەوە من تووڕە بووم لە عوسمان، ئیتر کردمان بە موزاهەرە و هاتینە دەرەوە، حکومەت هات. هەر ئێمەش نەبووین، مەکتەبەکانی دیکەش بوون، خەڵک هات تێکەڵمان بوو.

ئێمە هەتا فولکەکە ڕۆیشتین، کە مەکتەبی سەرکەوتنی ئێستا ئەکات، کە مەکتەبی شارەزوور بوو، هاتینە دەرەوە و ٥٠ مەتر ڕۆیشتین چواردەورمان گیرا، ئێمە مناڵ بووین هەریەکە بە لایەکدا ڕامان کرد، ئیتر ئەمەی تیانەبوو بڵێی حیزبێک و لایەنێکی سیاسی بوو، نەخێر خۆڕسک بوو.

بەڵام لە مانگی نیسانی ١٩٧٩ لە یاساڵیادی بۆردومانی ١٩٧٤دا موزاهەرەی دووەم کرا، ئەوە موزاهەرەیەکی گەورە بوو. من کۆتا ساڵی پۆلی سێی ناوەندی بووم، چونکە من لە پۆلی سێی ناوەندیدا کەوتم، هەر لە مەکتەبەکەی ئێمەوە ڕۆیشتین، خەڵکیش هات، ئەوکاتانە کۆمەڵێک گەنجی وەکو لەتیفی حەمە مەلا سابیر و ئەوان دەوری گەورەیان تیایدا هەبوو، ئیتر ئەوانی کە گەنج و زیاتر گەورە بوون، خەڵکێکی زۆر ئاپۆڕای بەست، تا لای شارەوانی ڕۆیشتین، لەوێدا جەیش و پۆلیس و مونەزەمە دابەزین، خۆپیشاندانەکە نزیکەی هەر سێ و چوار سەعاتێکی خایاند و کۆتایی پێهات.

**پرسیار/ ڕێکخستنی حیزبەکان دەستیان نەبوو لەو خۆپیشاندانەی ساڵی ١٩٧٩؟**

وەڵام/ من لە ١٩٧٩/٣/٢٣ بووم بە کۆمەڵە، ئەم خۆپیشاندانە کە بووە(١٩٧٩/٤/٢٦) یادی هەڵەبجەیە، واتە ناگاتە ٤٠ ڕۆژ دوای ئەوە، من ئەوەندە تەنزیم و شارەزا نیم بڵێم کۆمەڵە کردی، یەکێتی یان سۆشیالیست یان پارتی یان حیزبی شیوعی کردی، بەتایبەتی ئەوکاتە حیزبی شیوعی تازە چووبوونە دەرەوە، لێیان درابوو.

من باوکم پارتی بووە، پارتیم خۆشویستووە، ١٩٧٤ مناڵێکی سیانزە چواردە ساڵان بووم ڕامانکردووە بۆ ئێران، لەگەڵ باوکمدا بووم. ئەو ئێوارەی هەڵەبجە بۆردومان ئەکرێ، ماڵی باوکم پێوە بوون، کچی پوورم مێردەکەی و دوو مناڵی شەهید بووە، ئەوەی ماوە دێن بۆ سیروان بۆ ماڵی ئێمە، ئەوان نیوەیان ئەچنەوە بۆ سلێمانی، ماڵی

باوکم و ئێمە و خوشکم کە شووی کردووە، خێرا بە گوندی عەنەبدا ڕۆیشتین بۆ بیارە، شەو لە ماڵی خزمێکمان بەناوی مامۆستا محەمەد بیارەیی کە ئەمڕۆ تەعزیەی خێزانەکەیەتی(ئێستا کە ئەم قسانە ئەکەم)، ئەو کاتە ژنی نەهێنابوو، تەلەبە بوو لە ماڵی ئێمەدا ئەیخوێند، ڕۆیشتین لە ماڵی ئەوانماینەوە، شەوێک دووان سیان، ماڵی چەند خزمێکیشمان لە بەڵخە بوون، ماڵی لالۆ لەتیف، مامۆستا محەمەد، خاڵۆ عینایەت، کە هەموویان خزمی دایکم بوون، چونکە دایکم سەرێکی سۆسەکانەییە، لەوێ ماینەوە، دواتر ئۆردوگا لە نەوسوود کرایەوە، چووینە نەوسوود، لەوێ خێمەیان بۆ هەڵداین، ڕۆژانە نان و ئاو و هەموو شت بەلاش بوو، چل ڕۆژێک ماینەوە، نەوسوود نەیگرت ئۆردوگایەکی تریان لە پشتی پاوەوە کردەوە ناوی سەریاس بوو، چووینە پاوە، لەوێ ماینەوە هەتا کۆتایی مانگی دە و سەرەتای یانزە. ئەوێ سەریاسە، ئەوێ شاخی شاهۆیە، زستانی سەختە، ئەبێ بمانبەن بۆ گەرمەسێر، بردینیان بۆ سەرپێڵی زەهاو کە نزیکە لە سنووری قەسری شیرین، لە قەسریشەوە بۆ خانەقین، ئەوێ گەرمەسێر بوو، بارانێک ئەباری بەفرباری نەبوو، لەوێ ماینەوە تا نسکۆی شۆڕش، لە مانگی نیسانی١٩٧٥ عەفوات دەرئەچێ و ئێمە ئەگەڕێینەوە.

ڕێک هاتینە تەوێڵە، لە تەوێڵەوە هاتینە هەڵەبجە، لە هەڵەبجە هێشتا حکومەتی عێراقی نەگەڕابوویەوە، هێزی نەبوو، هێزەکە لە سەیدصادق بوو، ئەبوایە ئەوەی مۆزەفی حکومی و فەرمانبەرە بڕوات بۆ سەیدصادق ناوی خۆی بنووسێ، سەرۆکی ماڵ کێیە، بڵێین تۆفیقی ڕەحیم، کاک تۆفیق ناوی سیانیت، تۆفیق ڕەحیم عەزیز، چەند کەسن، ئەوەندە کەس، ناوەکان، خێزانم ئەمە، کوڕەکەم ئەوە، کچەکەم ئەوە، تەمەنیان چەندە، لە کوێ بووی لە ئێران، پیشەتان، ڕەگەزیان نێر یان مێ، ئینتیمای سیاسیت، پێشمەرگە، مەدەنی، لەگەڵ کێ، فۆرمێک پڕ ئەکرایەوە و پسولەیەکیان ئەدایتێ.

لیژنەکە، هەر ناوی عائدون بوو، واتە گەڕاوەکان، شیعارێکی گەورە نووسرابوو: (نرحب بكم عائدون إلى صف الوطني)، بەخێرهاتنی گەڕاوەکان دەکەین بۆ ڕیزی نیشتمانی. ئەمە لە سەیدصادق هەبوو، لە سلێمانی هەبوو، عەفواتەکە تەقریبەن مانگێکی خایاند، لەو مانگەدا ئەوەی هاتەوە هاتەوە و جارێکی دیکەش تازە کرایەوە وەجبەیەکی تر هاتنەوە.

**پرسیار/ ئەی خۆپیشاندانەکانی ١٩٨٢ لەسەر چی بوو؟**

وەڵام/ لە ساڵی ١٩٨٢ موزاهەرەیەکی گەورە کرا، من قوتابی بووم لە (دار المعلمين) ی سلێمانی، بۆیە من لەوکاتەدا لە هەڵەبجە نەبووم، کوڕێکی هاوڕێم کە ناوی بەختیار بوو، وتی سبەی لە هەڵەبجە خۆپیشانە، وتم بەیانی ئەڕۆینەوە، بەیانی تاقیکردنەوەی ئینگلیزی مامۆستا سەلاحمان هەبوو بۆیە نەمتوانی بگەڕێمەوە.

خۆپیشاندانەکە ڕۆژی ٤/٢٦ کرا، کوڕێکی هاوڕێم لە هەڵەبجەوە هات بۆ سلێمانی، وتی خۆپیشاندان بووە، وتم تۆ لێرە ئەبی ئەمشەو بچین بۆ ماڵی خوشکم، چونکە من لە ماڵی خوشکم بووم ئەمخوێند، وتی نەخێر من ئەڕۆمەوە، وتم بەیانی دێمەوە بۆ ئەو خۆپیشاندانە، موزاهەرەکەش وابزانم دوو ڕۆژی خایاند، بەڵام موزاهەرەیەکی زۆر گەورە بووە و خەڵکێکی زۆریش بەشداری کردبوو، تەنانەت پیاوانی دەوڵەت نەیانتوانی بوو بڕۆنە ناو بازاڕ، خەڵکیش لێرە، حیزبەکان، تەنزیمەکان، دەوریان تیادا هەبووە. لەوە بەدوا هەتا ساڵی ١٩٨٧ ڕێکخستنەکانی لایەنەکان ئیدارەی خۆپیشاندانەکانیان ئەکرد.

**پرسیار/ کە ئەبی بە ئەندام لە کۆمەڵە، هەر لەناو ڕێکخستنەکانی شار ئەمێنیتەوە؟**

وەڵام/ هەر لەناو ڕێکخستنەکانی شاردا ماومەتەوە، کەسێکی ئەکتیڤ بووم. پۆلی ئێمە کەرتی شەهید وەستا ئەنوەر بوو، پۆلی شەهید فاتیح بوو، لە ساڵی ١٩٨٢ لەم شارەدا سێ کەس بەرپرسی یەکەمی ڕێکخستن بووین، ئەوانیش من بووم، سەعیدی سەید قادر بوو، عادلی مامەکەریم بوو، مەسئولی یەکەمیشمان حەمیدی مەلا خەرامان بوو کە ئێستا لە ئەورووپایە.

ئیشی ئێمە وەکو ڕێکخستن، بەیان داکوتین بوو، ڕێکخستن و سەرکردایەتی خۆپیشاندان و مانگرتن بوو، نووسین بوو لەسەر دیوار، خەڵک ڕێکخستن بوو بۆ یەکێتی و کۆمەڵە، کۆکردنەوەی پیتاک بوو، بۆ نموونە پیتاکی تەندروستی، هەتا پیتاکی پارە، خەڵک هەیە لەم شارەدا چووم پسولەم داوەتێ، وتوومە تۆ ناوت فڵانە کەسە، وتوومە منیش ناوم فڵانە کەسە، لەبەرئەوەی تۆ ئاوای ئەمانەوێ بەیانی هەزار دینارمان بدەیتێ، من فڵان کەسیشم، فڵان کەسەکە تائێستا ماوە، بەیانی پاڕاوەتەوە هەزارم نیە پێنج سەدم هەیە، وتوومانە وەرەقەکەمان بدەرێ پێنج سەدمان لێوەرگرتووە.

ئاخر من ئەکتیڤ بووم، لە بواری ئەدەبدا ئیشم ئەکرد، شیعرم ئەنووسی، تەمسیلم ئەکرد، کۆڕم ئەگرت لە ٨٣ و ٨٤دا دیراسەی نەقدیم هەبوو، ئەمانە هەمووی کاریگەری هەبوو. من بەرپرسیشم گیراوە و لە خوار خۆشمەوە گیراوە، بەیانییەکیان چووم بۆ ماڵی نووری حەمەصاڵحی برای عومەری حەمەصاڵح لە بامۆک، زۆر زوو ڕۆیشتم، چووم بۆ لای کەمالی کوڕی، کەمال لەم دواییەدا شەهید بوو، کەمال کۆمەڵە بوو لای خۆم بوو، کە ئەچم بۆ ئەوێ و وەزع شپرزە بووە، وتیان کەمالی چی ئەم بەیانییە کەمالیان بردووە، کەمال تەنزیمە لای من، گیراوە، بەڵام قارەمان بوو، پرسیارێکی زۆریان لێ کرد دوو سێ ڕۆژ مایەوە، قورسە تۆ مەسئولی یەکێک بی ئەو بگیرێت، مەسئولەکەشم ناوی حەمید بووە، لە سلێمانی ئەگیرێ، منیش قوتابیم، قوتابخانە جێ ئەهێڵم فەصڵ ئەکرێم، جێی ناهێڵی دەستت لەسەر دڵتە، ئەویش قارەمانانە دەرچوو، ئەم تەجروبەم هەبوو، ڕۆژگارێ

بووە بەرپرسەکەم سجن بووە من تەنزیم بووم قارەمان بووە هاتووەتە دەرەوە، هەتا من دواییش کە بووم بە ئاڵای شۆڕش، مەسئولم لە ئاڵای شۆڕشدا سجن بووە، ئەوە حیکایەتێکی زۆر گەورەیە، لە سلێمانی هەر ماڵم جیهێشت.

**پرسیار/ جگە لەکایە سیاسییەکە، لە هەڵەبجە لە چ کایەیەکی رۆشنبیریدا کارت کردووە؟**

وەڵام/ من لە ماڵی خۆمان لە ساڵانی ١٩٦٥-١٩٦٦ کە قوتابییەکی سەرەتاییم، ئەمین ئەرسەلان و رۆستەم و زۆراب هەبووە، دانیشتووم ئەم حیکایەتانەم خوێندووەتەوە، بۆ دایک و باوکم، بۆ خۆم، تەزەوقم کردووە، لە ٦٧ و ٦٨دا ڕادیۆ لە هەموو ماڵێکدا نەبوو، ئێمە ڕادیۆمان هەبوو، دەنگی ڕادیۆی کرماشان شەو تەمسیلێکی ئەکرد بەناوی تەمسیلی کوردی، دائەنیشتین گوێمان ڕائەگرت، ئەم تەمسیلە هەمووی دۆبلاج بوو، تەقەی قاچی ئەسپەکە ئەهات، شتێک ئەکەوتە خوارەوە ئەشکا، ژنێک هات، پیاوەکە، ئەمە گوێمان لێ ڕائەگرت زەوقی ئەدەبی لای من دروست ئەکرد، من بۆ خۆم دیوانی شیعرم هەبووە. لە قوتابخانەدا زۆر تەمەڵ بووم، تا سێی ناوەندی، لە شەشدا کەوتووم، لە دوودا کەوتووم، لە سێدا کەوتووم، سێ ساڵ کەوتووم، ڕەفیقی من شەشی ئەدەبی بڕیوە من ئینجا سێی ناوەندیم بڕیوە، بەڵام لە دەرەوەی مەکتەب زیرەک بووم، ئەمخوێندەوە، من ساڵانی ١٩٧٢-١٩٧٣ موتابەعەی ڕۆژنامە ئەکەم، ئەو ڕۆژنامەیە ئەیخوێنمەوە، لەم ڕۆژنامەیەدا مەتەڵی تیایە، مەتەڵی ئەمجارە: چوار پیتی ڕێکە، ناوو لەقەبی شاعیرێکە، من ئەڵێم قانعە، پیتی یەکەم لە ئەوە و ئەوەی لێ پەیدا ئەبێ، نەمزانی چۆن بینێرم بۆ سلێمانی، بۆیان ناردووم بۆ سلێمانی، لە ڕۆژنامەی ژین دا ئەڵێ ئەمانە وەڵامی مەتەڵەکەیان بە ڕاست و دروستی داوەتەوە، فلان، فلان، ئازاد تۆفیق، ناوی منی تیایە، هاتمە ناو دنیای ڕۆژنامەوە.

بووبە ٧٤ و ٧٥ تەواو خەریکی خوێندنەوە بووم، لە ١٩٧٥ گۆڤاری بەیان، گۆڤاری ڕۆشنبیری، ڕۆژی کوردستان، کاک شێرکۆ و ئەوان ئەهاتن کۆڕیان ئەگرت، برۆ دانیشە، لێرە برای جەمیل، کوڕی حاجی کەرەم خان مەوالیدی ١٩٥٧ بوو، عومری لە ئێمە زیاتر بوو، دڵشادی عومەری کاکی، شاکر فەتاح، مامۆستا ئەمین، ئەمانە کۆڕیان ئەگرت ئەچووینە ناو کۆڕەکانیان، ئیتر من هاتمە ناو دنیای ئەدەبەوە، من شتێکت پێ بڵێم، ساڵی ١٩٧٨ دیوانێک دەردەچێت بەناوی (پرچی ئەو کچە ڕەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە)، هی لەتیف هەڵمەتە، شیعری موقاوەمەی تیایە، بەرەنگاری زۆر گەورەی جوان، پیرەمێردێ چووە قوتابخانەی گوندێ، لە حەوشەکەدا ڕاوەستا، دەورەیان لێدا مامۆستا، ها خاڵەگیان چیت گەرەکە، ها خاڵە گیان، پیرەمێردی بەستەزمان کە لاواز ببوو بە گۆچان، وتی توخوا مامۆستا گیان، فێرم ناکەی چۆن بنووسم کوردستان، ئەوسا بیانوتایە کوردستان خەڵک چەپڵەی لێ ئەدا،

خەڵک مووی گرژ ئەبوو، ئەمانە بڵاو ئەبوویەوە. ئەو کتێبە زۆر نادر بوو، ماڵی خوشکم بۆیان پەیدا کردبووم، بەڵام من کتێبەکەی لەتیف هەڵمەتم پێ بوو، خۆم بە پاشا ئەزانی..

ساڵی ١٩٨٠ یەکەم شیعر خۆم لە گۆڤارێکدا بە ناوی (ئاسۆ) لە هەڵەبجە دەرەچوو بڵاوبوویەوە، شیعرەکە تا ئێستەش ماوە و ماویشمە، شیعرەکە پۆستەرێکە، لە پۆستەی خوێنەراندا بڵاوبووەتەوە، شیعرەکەش قابیلی ئەوە نەبووە لاپەڕەیەکی بدەنێ، لە پۆستەی خوێنەراندا ئەمانە شتیان ناردووە نمونەیەکیشیان لەوەی من دابەزاندووە، فەخرم پێوە ئەکرد، ئەو کاتە من هاتمە ناو دنیای ئەدەب، دنیای شیعر نووسین، ناو موتابەعەی مۆسیقا، هونەر، وێنە، شانۆ، لێرە لە ١٩٧٨ شانۆمان ئەکرد، شانۆیی (شێتی نیشتمان)مان کرد.

دەرهێنەرەکەی عەلی سەعید جەواهیر بوو، باسی تەنزیم و نهێنی و ئەوانەی ئەکرد. ئەوانەی ڕۆڵیان ئەبینی فوئادی حاجی بەکر، ئازادی عەبەی چۆپی، من، عەبدوڵڵای حەمەلاو بەگ، کاوە، ڕێبواری برای فوئاد، شێتی نیشتمان ڕۆژانە هەموو هەڵەبجە ئەهاتن سەیریان ئەکرد. نمایشکردنەکەش لە هۆڵێکدا بوو، لەم ڕۆژانەدا سەرێکم لێ دا، وتم ئەبێ بچم ئەو هۆڵە ببینم، چووم بینیم چاوم پڕ بوو لە ئاو، هۆڵێکیان هەیە لە ناوەندی کچانی ئێرە، ست ژیان، ئەم هۆڵە سەکۆیەکی هەبوو بۆ شانۆ، لەسەر ئەو سەکۆیە پێشکەش ئەکرا، لە پاڵ ئەم شانۆیەدا، کە شریتی تا ئێستاش ماوە، موسیقاشمان پێشکەش ئەکرد، گۆرانی ئازادی عەبەی سەڕاج بوو، گۆرانی عەلی مامە سەعا، گۆرانی ئاری حسێن عەزیز، تیپی مۆسیقای شنروێ، لە بەینی ئەوانەدا ئەمانەیان ئەخوێندەوە: جەژنە جەژنە جەژنی کوردستانە جەژنی نەورۆزە، بە تیشکی ئاگر ئەنووسم جەژنە پیرۆزە، ئەمانە ئەخوێنرایەوە، سروودی دەمی ڕاپەڕینە دەمی ڕاپەڕین هەتاکەی بە سستی بژین. ئەوە هەرایەکی گەورەی نایەوە، ئیتر ڕۆحی کوردایەتی و نەواتی کوردایەتی لە ساڵی ١٩٧٦ – ١٩٧٨ زیندووبوویەوە، هەر لەو ماوەدا گۆڤارەکانی بەیان و ڕۆژی کوردستان و ڕۆشنبیری نوێ و کتێب دەرەچوون، ناڵەی جودایی هێمن، ڕۆڵ و کاریگەری خۆی هەبوو، من ئیتر لەوێوە دەستم کرد بە دنیای شیعر و چیرۆک و ئەو شتانە.

لە هەڵەبجەش لە ساڵی ١٩٨٠ گۆڤارێک بەناوی (ئاسۆگە)دەردەچوو، لێرە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری جەماوەری، کاک دڵشاد و جەباری حاجی کەرەم خان و بەیاد عەبدولقادر بوون، ژمارەکانی گۆڤارەکە ماون، لە ماوەی یەک ساڵدا شەش ژمارەی لێ دەرچووە. من لە ژمارە شەشدا شیعرێکیان بۆ ئەنێرم، لە پۆستەی خوێنەران بۆم بڵاوئەکەنەوە. دوایی بە نهێنی، من لە تەنزیمی کۆمەڵەدا ئەکتیڤ بووم، یەکێک بووم لە کۆمەڵە باریعەکانی ناو شار، چونکە من باسی ڕۆشنبیریم ئەکرد، کۆڕم ئەگرت، شیعرم ئەوت، موزاهەرەم ئەکرد، ئەهاتم بەملا و لادا، ئەجولام، بیرمان کردەوە گۆڤارێک دەربکەین، گۆڤارێکمان دەرکرد بە

ناوی (ڕەنجدەران/١٩٨٣)، گۆڤار بەدەست بنووسرێت، ئیستینساخ بکرێ. دوو ژمارە بوو سێ ژمارە بوو لێی دەرچوو، لە ماڵی ئێمەدا بە دەست تەبع ئەکرا.

خاوەن ئیمتیاز و شتی نەبوو، هەر بە نهێنی بوو، ئێمە لێرە لە پۆل دەرمان ئەکرد، بەرگەکەی کوڕێکی شیوعی کردویەتی، من چووم بۆ لای، سیقەم پێی بوو، ناوی ئەسغەر عەلی بوو، هونەرمەند بوو، پێرار شەهید بوو. ئێستا پەیکەرێکی بۆ کراوە لە هۆڵی ڕۆشنبیری ئێرە، وتی کاک ئازاد خۆت ئەزانی من شیوعیم، وتم ئەزانم شیوعیت، ئەم ڕەسمەی کاک شەهاب و کاک جەعفەر و کاک ئەنوەرم بۆ بکە، لە بڵاوکراوەیەکی کۆمەڵەدا ئەیکەین بە بەرگەکەی، چونکە یەکەم ژمارە لە مانگی ١٩٨٣/١١ بڵاوبوویەوە، کە ئەکاتە ساڵڕۆژی شەهیدبوونی کاک شەهاب و ئەوانی تر، لە ١١/٢١ ژمارەی دووەمی من لەگەڵیام، ژمارەی سێیەم من وازم لە کۆمەڵە هێنا، ژمارەی دووەمی لە مانگی ١٩٨٤/١ بوو، کە ساڵڕۆژی شەهید بوونی کاک ئارام بوو، ڕەسمێکی کاک ئاراممان دانابوو.

گۆڤارەکە بەدەست ئەماننووسی و بە ماجیک ڕێکمان ئەخست، پەخشانێکی تیدا بوو، چیرۆکێکی تیا بوو، وتارێکی سیاسی تیا بوو، شیعرێکی تیا بوو، وتەیەکی ئیفتیتاحی تیا بوو، حەیف تا ئەم ساڵانە لای کامەرانی نووری حەمەکەریم دانەیەک مابوو، نەمانزانی چی لێ بەسەرهات. کامەران ئێستا لە ئەورووپایە، ئەویش ڕەفیقمان بوو بە خەت بۆی ئەنووسین، زۆر سیقەمان پێی بوو، لە ساڵی ١٩٧٦ کۆمەڵە بوو دوایی وازی هێنا، ناوی کاوەی شێخ مستەفا بوو، مامۆستا کاوە، ئەو بەدەست بۆی ئەنووسین، ئێمەیش بەکاربۆن ئیستینساخمان ئەکرد. مقەبامان هێنابوو، تۆزێ جوان بوو، بیبڕە بۆی و ئاوا لوول ئەکرا، هەر بە قەد لەپی دەستێک ئەبوو، لەناو تەنزیمدا بڵاومان ئەکردەوە، ئیبراهیم هەورامانی ئەوەی بینیوە. ئەمە گۆڤاری (ڕەنجدەران)، بەڵام (ئاسۆگە) تائێستاش ماوە، حکومەت چاپی کردووەتەوە.

**پرسیار/ جگە لەمانە، شتی دیکەتان نەبوو؟**

وەڵام/ من هەست بەم دووانە ئەکەم.

**پرسیار/ وەکو ڕێکخستن؟**

وەڵام/ نەخێر، ئێمە نەمانبوو؟

**پرسیار/ ئێوە کە ئەم کارانەتان کرد، پرستان بە سەرەوە کردبوو، یان سەربەخۆ کارەکەتان ئەکرد؟**

وەڵام/نەخێر، ئێمە خۆمان وەکو ڕێکخستن کردمان، لەبەرئەوەی یەکێتی ئەو مەرکەزیەتەی نەبوو، زۆر ئازادی هەبوو، من لە کۆمەڵەدا بووم لە ژێرەوە وازم هێنابوو، بۆچی ئەڵێم مانگی یەک، تا مانگی یەک دەرمکرد، ئیتر دوای ئەوە ڕۆژی ١٩٨٤/١/٥ من لە مامۆستام لە

شانەدەری، وازم لە کۆمەڵە هێنا، بۆ بەیانییەکەی ٦ی کانوونی دووەم ئەکات، لەسەر پۆلی شەشی سەرەتایی بووم، مامۆستاییبوونەکەشم لە شانەدەری ئەوەبوو، پێنج مانگ بە وانەبێژ دایاننام لەوێ، لێرەوە ئەچووم بۆ شانەدەری بۆ وانەبێژی، دوو مەکتەب بوو بەیەکەوە، من لە مەکتەبی وەلی دێوانە بووم، وانەی کۆمەڵایەتیم ئەوتەوە، وتم بەخوێندکارەکان باوە گیان کۆتا وانەیە، دانیشن و خۆتان مەشغوڵ بکەن، دوایی بڕۆنەوە، خۆم دانیشتم ئیستیقالەکەم بە وردی نووسی، ئەو دەقەیە گریاشم، من کە ناوم ئەوەیە و ناوە نهێنیەکەشم ئەوەیە – ناوە نهێنییەکەم سەرکەوت بوو – داواتان لێ ئەکەم ئەم دەستلەکارکێشانەوەم لێ قبوڵ بکەن، چونکە من لێرە بەدواوە ناتوانم بەرنامە و پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان قبوڵ بکەم، دوای ئەوە هاتمەوە و ئیستیقالەکەم تەقدیم کرد.

بۆچی ئەمەم نووسی؟ لەبەرئەوەی نەڵێن تۆ لە چی عاجزی، خەتای دکتۆر بوو، دکتۆر ئاشت بکەنەوە، من بەرنامەکەم قبوڵ نەبوو، زۆر موتەئەسیر بوون، زۆریان پێ ناخۆش بوو، چونکە بەڕاستی من ئەکتیڤ بووم، کۆڕم ئەگرت، من حەمەفەریقم بانگ ئەکرد لێرە شیعری تراکتۆری ئەخوێندەوە، چیرۆکی تراکتۆری ئەخوێندەوە، کە لە یەکێک لە چیرۆکەکانی باسی ئەنفال دەکات، باسی نەهامەتی کورد دەکات، شانۆییم ئەکرد، ئەم شانۆییە توێژینەوەی نەقدیمان هەبوو لەسەری، (ماسیە ڕەشە بچکۆلەکە) چیرۆکیکی گەورەی صەمەدی بەهرەنگییە بۆ منداڵ، من شیعرم بۆ داناون، ماسیەکی سەرهەڵگرتووی... نەصەکەیم هەمووی ماوە، بە مۆسیقاش، تەنها یەک دەس دەسوپێمان پەیوەند ئەکات، چقڵی چاوی ئەو دوژمنەی پێمان ئەڵێ ناکرێ و نا، گەر بەهێز بین،.... ئیتر ئەوە کۆمەڵێک دیمەنە، هەر دیمەنێک شیعرێکی جوانم بۆ داناوە.

لەڕاستیدا وازهێنانەکە هۆکارەکەی شتی فیکری بوو، بڕوام بە کۆمەڵە نەبوو وەکو ئەو بارودۆخەی ئەو کاتە، هەستم کردبوو ئەمە حیزبێکی پان کوردییە و یەکێتی نیشتمانی و مام جەلال شتێکیان نەهێشتووەتەوە ناسنامەی کۆمەڵە و تەبەقی دیار بێ، تێکەڵی کردووە لەگەڵ شۆڕشگێڕاندا لە کۆتاییشدا کۆمەڵە نامێنێ، هەروای لێهات لە ١٩٨٩ کۆمەڵە نەما.

**پرسیار/ تا چەند حکومەت چاودێری چالاکییە ڕۆشنبیرییەکانی ئەکرد؟**

وەڵام/ هیچ نەبوو، کە ئەڵێم هیچ نەبوو لەوانەیە لات قورس بێ، من فیرار بووم لەم شارەدا، چووم بۆ قایمقامیەت، بە قات و بۆینباخێکەوە وایانزانی من مامۆستام، وتم بەیانی ئەو قاعەمان ئەوێ، وتیان بەسەرچاو، پۆلیسیشت بۆ ئەنێرین، بەڵام حکومەت خەڵکی ئەنارد، بۆ نموونە سەیرکە، من لە ساڵی ١٩٨٤، بە شریت ماومە تا ئێستا، دیراسەیەکی شیعریم هەیە لەسەر شیعری جەلال عازەبانی و سەلاحەڕەش، جەلال لە کیمیایەکەدا شەهید ئەبێ، ئەمانە شیعر ئەنووسن، منیش دیراسەیەکی نەقدی ئەکەم، ئەم





شیعرە تەبەقی نیە، ئەم شیعرە میسالییە، ئەم شیعرە هەر خەریکی بەربوونی نەزیفی خوێنە بۆ کچێک، خەمی نیشتمان گەورەیە، بۆ نموونە من ئەڵێم:

ئەدەب چیە گەر تێکەڵی ئێش و ژانی میللەت نەبێ

وشە چیە گەر لە مەیدانی ژیاندا نان و عیشق و مەشخەڵ نەبێ

کەی شاعیرە ئەوەی ئەمڕۆ بە دەردی خوا بڕوا و بمرێ

کەی مرۆڤە ئەو شاعیرەی وەکی حەربا لە هەر شوێنێ ڕەنگێ بگرێ

ئیتر پیایدا دێمەوە خوارەوە، دیراسەکەشم ماوە بە شیعر، بە سەوتی، کابرای عەرەبیش دانیشتووە، کوردێک تەرجەمەی بۆ ئەکات، کوردەکە ئێستا وەفاتی کردووە، کابراش کە ئیدارەی کۆڕەکەی من ئەکات لە سلێمانییەوە هاتووە و خەمیەتی. کێش ئیدارەی کۆڕەکەی ئەکا، دکتۆر هێرشی حەمەئەمینی خۆمان، ئێستا دکتۆرای لە ئەدەبدا هەیە، عائیلەیەکی شیوعین.

دکتۆر هێرش عائیلەیەکی چەپ بوون، شیوعی بوون، پیاوێکی چاک بوو، لە ڕۆشنبیری کارمەند بوو، هات ئیدارەی کۆڕەکەی کرد، سەوتیشی دەرچووە لە شریتەکەدا، وتم خەمت نەبێ کوردی نازانێ، ئەوەی بۆیشی تەرجەمە ئەکرد، پیاوانە تەرجومەی ئەکرد، تا نیوەی کۆڕەکە دانیشت و ڕۆیشت، ئیتر بوو بە دیراسە، بە نەقد، بە قسە، بۆ نموونە مەسرەحی ماسیە ڕەشە بچکۆلەکە، مەسرەحیەکمان تەقدیم کرد بەناوی چارەنووسی ئادەمیزاد، هی شۆلۆخۆفە، چارەنووسی ئادەمیزاد باسی مارکسیەتە، کابرایەکی بەعسی دانیشتووە، وتی بە من وەرە کوڕی خاڵۆ تۆفیق، من ئیدارە قاعەکەم ئەکرد، ئەمە چیە ئەم مەسرەحیە، بۆ باسی ئیشتراکیەت ئەکات و حیزبی بەعسیش وەحدە حریە ئیشتراکیەیە، وتی ئەوە قسە بۆ کێ ئەکەی خاڵۆ، ئەوە باسی کۆمەڵە ئەکات، وتی ئەو مەسرەحیە ئەوەستێنی یان دڵت بوەستێنم، ئا ئەوا، یەکسەر لەوێدا پەردە دادرایەوە و وازمان لێ هێنا. ئەم پیاوە وەفاتی کردووە پێویست ناکات ناوی ببەم، بەڵام مەبەستم چیە، ئەوکاتە ئیش قورس بوو. بەڵام بەڕاستی لە ساڵی هەشتا بەدواوە لە دوای سەعات چوار بەعس لە هەڵەبجەدا نەبوو، تەنها لە بنکە ڕەسمیەکاندا نەبێ، بەکورتی لە ساڵانی ١٩٨١-١٩٨٨ پیاوانی دەوڵەت ئەخزانە کونەکانیان، بەڵام لە ساڵانی ١٩٧٧ - ١٩٧٩ کارکردن قورس بوو.

بەکورتی، لە دوای عەسرەوە گەڕەکی کانی عاشقان بە دەست پێشمەرگەوە بوو، پیرمحەمەد کەمتر، کانی عاشقان زۆرتر، لە کانی عاشقانەوە ئەچووە گوڵان و ئەچووە چاووگ و بەرەو سەرتر.

**پرسیار/ دوای کۆمەڵە ژیانی سیاسی تۆ چی لێ دێ؟**

وەڵام/ دوای کۆمەڵە من لە ئاڵای شۆڕش ئیشم ئەکرد، ئاڵای شۆڕش لە مانگی کانوونی دووەمی١٩٨٥ دا، ئێمە یەکەم ئەڵقەی ئاڵای شۆڕش بووین، کاک سەرداری ڕەشەی حەمەی ئەحمەد، کە ئەندام پەرلەمانی خولی پێشووە، کاک ئەدهەمی مەلا عەلی، سجنی سیاسی حەفتاوحەوتە لەگەڵ سەرداردا، کاک صدیق کارمەندە لە کارەبا، من، ئێمە ئەساسی ئاڵای شۆڕش بووین، من بە سەراحەت ئەیڵێم دوای دروستبوونی تەنزیمی ئاڵای شۆڕش هەموو تەنزیمەکانی تر تووشی شەلەل بوون، چونکە ئاڵای شۆڕش نوخبە موسەقەف و عاقڵەکەی ناو کۆمەڵە بوون، هەموویان، دەستبژێرەکان بوون.

من لەناو ئاڵای شۆڕشدا بووم تا ڕۆژی ١٩٩١/١/٧، واتە تا تەقە لە ئەمنە سوورەکەش کرا، یەکەم کەسیش - ئەوە مەلا بەحتیار لە کتێبەکەی ئەخیری ڕەسمی منی تیایە - یەکەم خیتابی ئاشکرای ئاڵای شۆڕش منم لەبەر دەرکی سەرای سلێمانیدا، چونکە ٣/٧ ڕاپەڕین ئەبێ ئێمە ئاڵای شۆڕش لەوێین، مامۆستا محێدینی ڕەفیقم ئاڵای شۆڕشە، بریندار ئەبی لە پاڵمدا، بە پەلەپروزە ئەیگەیەنینە نەخۆشخانە، هەشتی مانگ بەعس تەواو ئەبێ، ئەمنەسورەکە ئەگیرێ، مقەڕی ئاڵای شۆڕش دائەنێین، کاک بەختیار دێتەوە بۆ لامان، لە ڕەوەکەدا لەگەڵ کاک بەحتیار ئەڕۆین، مام جەلال پێشوازی لە کاک بەختیار دەکات، ئەڵێ بیێم بۆ لات یان دێی بۆ لام، ئەڵێ من دێم جەنابی مام جەلال، هەر لە گۆخڵان، ئەوە دورودرێژە.

**پرسیار/ هۆکارەکانی خۆپیشاندانی ١٩٨٧/٥/١٣ی هەڵەبجە چی بوون؟**

وەڵام/ لە ساڵی ١٩٨٧ من لە هەڵەبجە بووم، ئێستا من ئەتوانم لەسەر چەمچەماڵ قسەی ناڕاست بکەم، چونکە نامناسن، بەڵام هەڵەبجەیی من ئەناسن، ئێستە ئەگەر بڕۆیتە ماڵی خاڵۆوانت و مامەکانت ئەزانن من کێم، من لە ساڵانی ١٩٨٤-١٩٨٦ ئەکتیڤم لە شانۆدا، ئەکتیڤم لە دیراساتی ئەدەبیدا، ئەکتیڤم لە هێنانی حەمەفەریق و عەلی کەریم و هێنانی هونەرمەند بۆ ئێرە، جەلیل زەنگەنە، چالاکی ئەدەبی مەسرەحی، ئەکتیڤم لەوەی ئیدارەی شانۆ ئەکەم و کۆڕ ئەگرم، خۆم دیراسەی نەقدیم هەیە، لەبەرئەوە خەڵک ڕێزیان لێ ئەگرتم، منیش ئیشم بە هیچ نەبوو سیاسەت نەبێ، باوکم بەڕەحمەت بێت، یەک ئەسەفی گەورەی هەبوو، ئەیوت تا تۆ مابی تەمامەتەیەکت نابێ براکانت خوشکەکانت بیخۆن، تۆ ئەم کتێبانە سەرت ئەخۆن، ئەم جرت و فرتە لەناوت ئەبات، نەیبینیم مامۆستا بم، نەک پارێزگار، هەر نەیبینیم پێنج دینارم پێ بێ، خەڵک لە دەوری من کۆئەبوویەوە، ٢٦ بۆ ٢٧ ساڵ عومرمە، هەشتاوپێنجە، هەشتاوشەشە، حەوتە، من نموونەیەکت بدەمێ، لە دوکانێک دانیشتبووین محلەبیمان ئەخوارد، کەسێک وتی هەرچی محەلەبی و شتەکانی مامۆستا ئازادە لەسەر من وتمان بۆ؟ وتی من وامزانیوە مامۆستا ئازاد کە لە دوکان و شتدا قسە

ئەکات فشە ئەکات، کە بینیم لە موزاهەرەکەدا زانیم فشە ناکات و چەند قارەمانە،.

ئەهاتن بۆ لام ئەیانوت: چی بکەین؟ دوکانێک هەبوو بەرامبەر چایخانەی خالۆ هی ڕێبواری سەرتاش بوو، ڕەفیقمان بوو، لەوێ کۆئەبووینەوە، ئەموت شت ئەکەین، پەلە مەکەن، ڕوویان ئەکردە من. هۆکارەکەشی ئەوەبوو، حکومەتی عێراقی ئەیویست دێیەکانی ناوچەرگەی شارەزوور، تەپی سەفا، خێڵی حەمە، تەپەکوڕە و گوندەکانی تر نەهێڵێ و باریان بکات، ئێمە ئەمانگووت ئەوە ماوە بەدەست پێشمەرگەوە، ئەوە ماوە کە توراس و کلتوور و ڕەسەنایەتی ئەم میللەتە بسەلمێنێ، هەر گوندی گردیگۆی سەر جادە بمێنێ بچیتە پشتی گردیگۆ، ناوگردان نەمێنێ، ئەوە قورس بوو، بەکورتی ڕاپەڕینەکە لەسەر گواستنەوەی گوندەکانی شارەزوور بوو، خۆپیشاندانەکەشمان چۆن دەستپێکرد؟ دیارە تەنزیمەکان دەوریان تیایدا هەبوو، من خۆم وەکو ئاڵای شۆڕش، دەوری قارەمانی و یەکەمیشم تیایدا هەبووە.

شەو برادەرانی حیزبی شیوعی بە مکەبەرە لە مزگەوتی جامیعە جاڕیاندا، بەعسی فاشیست ئەیەوێ گوندەکان ڕابگوێزێت، تکا لە خەڵکی هەڵەبجە دەکەین بەیانی دوکان و بازاڕەکان داخەن و، مان بگرن و ڕێپێوان بکەن، بەیانی بچن بە گژ ئەم دەسەڵاتەدا، چونکە ئەگەر ئەمەیان بۆ بکرێ، شتی گەورەتریشی بەدوادا دێ، پێموایە ئێستاش شریتەکە لە ئەرشیفی حیزبی شیوعیدا هەیە، حیزبی شیوعی دەورێکی باشی هەبوو لەوەدا، لەوانە عوسمانی عەلە بەورە، نەجمەدین، دڵزاری سەید تۆفیق کە شەهید بووە، کە لە موزاهەرەکەشدا لەگەڵ مندا دەوری زۆر هەبوو، ئەمانە دەوریان هەبوو.

من ئاڵای شۆڕش بووم، بەیانی زوو هاتمە دەرەوە، شتێکی جوانم هەیە کە ئەم بەیانییە لەسەریم خوێندووەتەوە، شەپۆلی شەقام، باسی موزاهەرەکە دەکات، کە بەیانی زوو هاتمە دەرەوە چوومە لای خالۆ، لەوێ ئەنوەری ڕابەم بینی. دواتر هیوای حەمە لاسلکی و مەریوانی عەلی شەمعێ هاتن، وتیان کاک ئازاد چی بکەین؟ بەیەکەوە ڕۆیشتین بەرەو مزگەوتی دارالاحسان، نەگەیشتینە مزگەوتی دارالاحسان دوو سێ برادەرمان وتیان حەزتان لەم بەزمەیە؟ ئەیانزانی ئێمە سەرمان لە چی ئەخورێت، ئەنوەر وتی بەڵێ ئەی چی بکەین؟ برادەرمان بوون، ئەوانیش تەنزیم و کۆمەڵە و ئەمانە بوون، وتی حەزتان لەم بەزمەیە مامۆستا ئازاد ئەزانم، من شەرواڵ و کراسێکم لەبەردابوو، من لێرە جلی کوردیم نەبوو، هەر هی ئەم کوڕەی برام بوو ئەگەر لەبەرم بکردایە، کە شەرواڵم لەپێ کرد خەڵک و گەنج و ئەوانە ئەیانگووت بەیانی موزاهەرە ئەبێ، ڕۆیشتینە ئەوێ کوڕێک ناوی حەمەسەلیمە پێشمەرگەی کۆمەڵەیە، بەڵام هاتووەتەوە، تەمەنی هەیە، مەوالیدی چلەکانە، هات بەرەو ڕووم، مامۆستا ئازاد چۆنی، وتم کاک حەسەن

گیان باشی، من ئەزانم ئەو کۆمەڵەشە و ئەزانێ منیش ئاڵای شۆڕشم، کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕشیش شیر و تیر لە یەک ئەسوون، چی بکەین چی نەکەین؟ تۆ ئامادەی موزاهەرە بکەی؟ من موزاهەرە ئەکەم، هوتافی یەکەمیشت بۆ ئەکێشم، هوتافی یەکەم چەند بڕگەیە، هوتافی یەکەمم کێشا. شوێنەکەش ڕێک بەردەم مزگەوتی دارالاحسان بوو، دە مەتر بەم لاوە ئێستا دوکانێکە تووری لێ ئەفرۆشێ، سەوزەی لێ ئەفرۆشێ، هەناری لێ ئەفرۆشێ. منم، ئەنوەرە، هیوایە، مەریوانە، لە خەیاڵم بێ، بە خوا دە کەس ئەبووین، پێنجەکەی تر نازانم کێن، حەمەسەلیم هەورامی هات، مەرحەبایی و چاکی و چۆنی کرد...

حەمەسەلیم کوڕێکی باڵابەرز بوو، پێشمەرگەی کۆمەڵەیە، ئێستەش ماوە، وتی مامۆستا چۆنی و ئەیزانی من چیم لە شارا؟ وتم ئێستا هوتافی یەکەمیشت بۆ ئەکێشم، وتی ئاوا؟ وتم بەڵێ، نەمهێشت قسەکەی تەواو بکات، جا سەیری ئەم هوتافە بکە، کاتی گەنجێتی و تێنەگەیشتن لە سیاسەت، من هوتافێک ئەکێشم ئەبێ موعاناتی گواستنەوەی خەڵکی لادێ بێ، بەڵام ئەڵیم چی لەوێدا: بڕوخێ ڕژێمە بۆرجوازییەکەی عێراق و بێتەدی حکومەتی کرێکاری. ئەمە کەی ڕەبتی بەوەوە هەیە، مارکسیەکی چەپی موتەتەڕیف، کە من وام وت و لە دوامەوە بوو بە چەپڵە، مەجموعەیەک دوکان کرابوویەوە، حەمەسەلیم وتی ئەو دوکانانە بۆ داناخەن؟ عەیب ناکەن، ئەها مناڵێکە ئەچێ بە گژ بەعسا ئێوە خەریکی پارە کۆکردنەوەن، دوکانەکانیان داخست، ئەم پێنج و دەیەی ئێمە ئەوەندەی من ئەم هوتافم کێشا و بوو بە چەپڵە و خرمەی داخستنی دوکان، هەر لە شوێنی خۆماندا بووبە پەنجا و سەد، بووبە دوو سەد. هاتین بەرەو مەکتەبی ئەحمەدموختار جافی ئەمڕۆ، نەگەیشتینە هەیکەلەکە و گەڕاینەوە، وتمان ئەچین بەرەو ناوەڕاستی بازاڕ، بەدەم شیعار وتنەوە، بۆ نموونە، بڕوخێ بەعس بژی کورد.

لەڕاستیدا دروشم ئامادەنەکرابوو، بۆیە دروشمێکی سەرەکی وا نەبوو، خۆڕسک بوو، من کە ئاڵای شۆڕش بووم، ئاڵای شۆڕش پێی نەوتم بڕۆ ئەوە بکە، دوایی هاتە ناو بابەتەکەوە، هاتین بەرەو بازاڕ، ئاپۆڕای خەڵک، دوکان نەما، گەشتینە ناو بازاڕ، دوکانەکەی حەمەی سافەی ئێستا، سەعات دە، دە و نیوە، پێنج هەزار کەس ئەبووین، ئافرەتی تیا بوو، عەبا بەسەری تیا بوو، پیاوی بەتەمەنی تیا بوو.

لەگەڵ ئەمەی ئێمەشدا، لە کانی عاشقانەوە حەمەی شێخ حەیدەریش دەستی پێکردبوو، بەڵام یەکەم هوتاف لای ئێمە بوو، لە کانی قوڵکەوە دەستیپێکرد، ئەوانیش ئاپۆڕای خەڵکی خۆیان دێن، بەڵام ئەمەی ئێمە دێینە ناوەڕاستی بازاڕ، کانی عاشقان لە سەعات چواری ئێوارەوە خەڵکی تیا نیە، دوورە، کە دێینە بازاڕ بەعس لە سەرەوە تەقە دەکات، لەم سەریشەوە تەقە دەکات، لەبەردەم حەمەی سافە چوونە ئەوبەرەوە قورسە، ئێستا

فیشەکێک بتەقینی لەوانەی حەوت مەتر ڕابکەم، پەنجا مەتر ڕابکەم، بەڵام ئەوکات قاچم ئەدا بە ئەرزەکەدا و ئەمگووت هیچ نییە، لەکاتێکدا فیشەکیش بەملاو لامدا گیزەی ئەهات، واتە حەماسی ئەو کاتە، من هاتمە ئەملاوە و مەریوان لەولای منەوە شەهید بوو.

مەریوان خەڵکی دەڵەمەڕ بوو، برای شاهۆ بوو، نازانم باوکی ناوی چیە، یەکەم شەهید بوو، هەر ئەو شەهیدەشماندا، عومەری حاجی عینایەت لە هەڵەبجەدا لەدایکبووە، بەڵام ماڵی باوکی دەڵەمەڕین ئەوە جیایە، عادلی ڕەفیقم ویستی دەست بخاتە ژێرسەری، سەری مەریوان دای لە زەوی، عادل و ئەنوەر ڕایانکێشایە ئەولا، یانی بۆ لای ئەو دوکاندارانەی کە ئێستاکە فیشەک و قەباخ و شتی لێ ئەفرۆشن(بازاڕی قاچاخچییەکان)، ئیتر لەویا نە لەمسەرەوە دیارە نە لەو سەرەوە، لەوێدا کە مەریوان شەهید بوو قەتع بوو، کەس نەیوێرا ئەمبەرەوبەر بکات. فیشەکەکە بەر سەری کەوتبوو، لە دەوری مەریوان کۆبووینەوە، تەواو چی بکەین؟

بەنیسبەت هەبوونی چەدار لەناو خۆپیشاندەراندا، ئەوەی پێمان ئەوتن جاش، هێزەکان هەبوون، چەکیان پێ بوو، بەڵام دەموچاویان بەستبوو، هاوکاری ئێمەیان ئەکرد بە تەقەکردن لە دژی بەعس، ئاخر ئێمە تەنزیم بووین، ئەوا من دەمانچەیەکم لابوو، ئەوە یەکێتی بۆ نموونە کلاشینکۆفێکی لابوو، بۆیە کلاشینکۆفێک و دەمانچەیەک بەرامبەر بەعس هیچی پێ ناکرێ. بەڕاستی ئەوانەیان کە خەفیفە بوون بەتایبەتی هێزەکەی تۆفیقی ڕەعنا دەوریان هەبوو، هێزەکەی ئەو هەر ئەو شەوەش مانەوە، بۆ بەیانی لەگەڵ مەلا عەلی و ئەواندا لەبەری نەورۆڵییەوە پەڕینەوە و چوونە ئێران.

ئێمە چووینە ئەوبەری چوارڕێیانەکەی بازاڕ، ئەوەی توانی پەڕییەوە ئەوبەر، چونکە ئەوبەر قەرەباڵغ بوو، لەوبەر ئاپۆڕای خەڵکی کانی عاشقان و کانیە قوڵکە و سەرا و پیرمحەمەد و ژن و پیاو کۆببوونەوە، ئەم کوڕە برایە مزگەوت و لەوێ بیشۆن، پێموایە لە مزگەوتی جامیعە شۆرا، خرایە سەر دارەمەیت، گوڵباران کرا، بە موزاهەرە جارێکی دیکەهاتینەوە بۆ ئەمبەر، هێنامانەوە بۆ دارالاحسان، چونکە ماڵی باوکی لەمبەر بوو، ئەوە تا ئێوارەی خایاند.

هێزەکانی ڕژێم نەیانئەتوانی لە شارەوانی ئێستا زیاتر بێتە خوارەوە، بۆ بەیانی دەستمان پێکردەوە جارێکی دیکە هێز هاتن، شیعارەکان شەو دانران، (الجنود إخواننا، والفاشیون أعدائنا). سەربازەکان برامانن و فاشییەکان دوژمنمانن، ئەمە شەوی ١٣ لەسەر ١٤، فریای ئەوانە کەوتین، بۆ نموونە، ئەم جوندییانە هاتن ئێمە نان و ئاو و شتمان بۆ بردن، هەبوو ڕەسمی ئەگرتن، ئەمانیش ئەیانوت ئێمە هەقمان نیە بەسەرتانەوە، ئەمە بەڕاستی تاکتیکی بەعس بوو، بۆئەوەی وردە وردە ڕامان بێنێت تا چواردەوری شار ئەگرێت، بۆ سبەینێ عەسرەکەی بەعس هێزی لە سلێمانی و شارەزوورەوە هێنا، دەوری

شار گیرا، ئەوانەمان کە لە خۆمان ئەترسایین بەپەلە پڕوزە ڕامان کرد بەرەو عەبابەیلێ، ١٣ی مانگ بەعس غایب بوو، چواردەش بەیانییەکەی بەعس غایب بوو تا نیوەڕۆ.

ئیتر بەعس چواردەی مانگ هەلیکۆپتەر هەڵساند، بە کوردی وتی: ئەو کەسەی بچێنە لایماڵی حەمەی ئاغاوەیسەوە لەم خوارەوە ئەمینە، ئەگینا قەسفی خەڵک دەکەین لە هەر حەرەکەیەکدا، بۆ نموونە بۆردومانی ناو شار کرا، خەڵک لە ماڵاندا پێوە بوو، بۆ نموونە ١٤ کەس پێوە بووە بردوویانە بۆ نەخۆشخانە، هاوڵاتیەک بووە خاڵۆی من بووە، مامەی تۆ بووە، مورافیقێکی لەگەڵدا بووە، بۆ عەسرەکەی چواردەوری نەخۆشخانەکەیان گرت، چی برینداری ١٩٨٧/٥/١٣ بوو هەر هەموویانیان برد و زیندەبەچاڵیان کردن، ئێمە وامانزانی براون بۆ جنوب، بەڵام هەر لە پشتی بامۆکەوە، لە بەینی معەسکەرەکە و عەبابەیلێدا، دوای ٩٢ ڕوفاتەکانیان دۆزرایەوە و بە ڕێوڕەسمێکی تایبەتی هێنانیانەوە. بە نزیکەیی ٥٢ کەس ئەو ڕۆژە بوونە قوربانی.

بەیانی ١٤ دەوری شار گیرا، ئێمە ڕامانکرد، بۆ دەرەوەی شار، من، عادل، کە ئێستە وەزیرە، کاک سەعیدی کارەبا کە ئێستە مودیری کارەبایە، کاک ئارامی برای هێمن و ئەوان، ئارام مەجید، ئەم چوارە چووین بۆ عەبابەیلێ. لە عەبابەیلێ من ئیشی خۆم بە تەنزیم کردبوو، دایکمم نارد بۆ عەربەت، لەوێش ماڵێک هەیە بیناسێ، تا خۆم دێمەوە، وەرەقە و پسولەی ئاڵای شۆڕشم بۆ کرا و بڕۆم، ئەوانیش ئیتر بۆ خۆمان بەیەکەوە بووین، من خەمی ئەوەشم بوو لە عەبابەیلێ پێشمەرگەی یەکێتی لێ بێت و بمگرێ، پێشمەرگەی کۆمەڵە بێت موحاسەبەشم بکات، چونکە نایشارمەوە برادەرەکانی خۆم کە چووبوون بۆ هەوارەکۆن موحاسەبەیان کردبوون وتبوویان کوا ئازاد؟ مامۆستا ئازاد کوا؟ بەشەرتێ ئەوان کۆمەڵە بوون، وتیان ئێوە سجنن، وتیان ئێمە کۆمەڵەین، من ئەوەندە چالاک بووم، ئەوەندە تەئسیرم هەبوو، برادەرەکە هاتەوە بۆ ئێرە، وتی زانیم ئێمە هیچ نین تۆ شتی، وتی تۆ ئاڵای شۆڕشی ئێمەیان لەسەر تۆ گرتووە، لەکاتێکدا ئێمە خۆمان کۆمەڵەین.

دوو ڕۆژێک لە عەبابەیلێ ماینەوە، وەزعەکە هێمن بوویەوە و هاتینەوە شار، لەگەڵ کاک عادل و ئەواندا وتمان با خۆمان بشارینەوە و بچین بۆ ماڵی خوشکم بۆ سلێمانی، کە ناوی لەمیعەیە، مێردی خوشکم ناوی سەلامە، ڕەفیقی کاک عادلە، ڕەفیقی کاک بەرزانە، نوری مەوالیدی ١٩٥٦و ئێستا لە ئەوروپایە، چووین دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە، موشکیلەیەک ڕوویدا، تەلەفونێک کرا بۆ ماڵیان من هەڵمگرت، بە عەرەبی وتی ماڵی سەلام؟ وتمان بەڵێ، وتم: هەسە بیلخاریج ان شاء الله یەجی، وتی: مەنو ئەنتە؟ وتی: ئەگەر هاتەوە، ئیزا جائەکە سەلام ئیزا سامح لی گولە، نازانم چی، سەرێکمان لێ بدا لە ئەمن، وتم بەسەرچاو. وتم وەڵڵا گیراین، داوای سەلام ئەکەن لە ئەمن، هەڵسە بگەڕێرەوە

بەبێ دەنگ، چووین بە پیکابێک وەرەقە تەزویر بکە و وەرەوە بۆ هەڵەبجە، بۆچی تەلەفون کراوە، سەلام بڕوات بۆ ئەمن؟ تومەز سەلام برایەکی گیراوە، لە هۆدەی ئیعدامە، یەکێک بوو لە تەنزیمەکانی یەکێتی کە دەوری لە کوشتنی دە دوانزە زابتدا هەبووە، بۆ مەیتەکەی بڕواتەوە، بڕوات بۆ کۆتا جار و پارەی فیشەکەکانی لێ بسێنن، ئێمە چۆڵمان کرد، هاتینەوە بۆ ئێرە، شار تۆزێ هێمن بوو، هیوای حەمە لاسلکی گیرا، بەڵام گرتنەکەی وا نەبوو بەریاندا.

مەریوان شەهید بوو، دوای ئەوە بەعس جگە لە کوشتنی ئەوانەی کوێرانە بۆردومانی کرد و جگە لەو عائیلە فەقیرانەی چواردەوری گرتن لە نەخۆشخانەکە، بۆ نموونە باوکی کاک جەلال عوسمان، حەماڵ بوو، باوکی کاک عەلی پارێزگار، لە ماڵە، ئەمانەیان پێچایەوە و بردنیان، دەوڵەت ئەوەندە چاوی نەبوو لێرە بڵێ دکتۆر عادلە ئازاد نیە، ئازادە دکتۆر عادل نیە، هەر شەلم کوێرم کردی.

**پرسیار/ ئێوە ئاگاداری ئەو خەڵکە بوون لە شار دەرچوون؟**

وەڵام/ بۆ شەوەکەی، ئەمە ماڵی ئێمە بوو، ١٣٠م لەولاتر ماڵی جەنابی مامۆستا مەلا عەلییە، تۆفیقی ڕەعناش ڕاستە پیاوی دەوڵەتە بەڵام هاوڕێمە، من ئەیناسم سیقەم پێیەتی، ئەشزانێ ئالای شۆڕشم و پێشتر کۆمەڵەش بووم(تۆفیق مانگێک نابێ وەفاتی کردووە)، هەر ئەو شەوە مامۆستا مەلا عەلی و ژمارەیەک مامۆستای هاوڕێی و دەیان عائیلە تر لە خزمانی نەورۆڵی و هێزەکەی تۆفیق کە لەگەڵ دەوڵەتدا بوون، هەموویان لەبەری نەورۆڵییەوە پەڕینەوە ئێران. پێموایە نزیکەی ٥٠٠ کەس ئەبوون، بەشێکیشی لە سازان و چنار و مۆردینەوە ڕۆیشتن، ئەوانەی لێرەوە ڕۆیشتبوون کۆکۆیی بوون، شارەزای ناوچەکەی خۆیان بوون و نزیکتر بوو بۆیان، بۆیە نەچوون بۆ بەری نەورۆڵی و هەر لێرەوە پەڕینەوە، ئەوانەی بەری نەورۆڵیش کە خزمانی مامۆستا مەلا عەلین، لە پریس و تریفە و گوندە و سەراوەوە ئەڕۆن و خۆیان نادەن لە سازان و مۆردین، ئیتر ئاوا بووە.

**پرسیار/ ئێوارەی ١٤ی مانگ بیلدۆزەر و شۆفڵ ئەهێنن گەڕەکی مۆردانە و کانی عاشقان ئەتەقێننەوە.**

وەڵام/ بە بیلدۆزەر نا، بە دەبابە، لە گەڕەکی کانییەقوڵکە لەمبەر، دەبابە ڕوو ئەکاتە ماڵی حەمەفەرەجی نانەوا، ئەڵێ وەرنە دەرەوە، زرم، ڕوو ئەکاتە ماڵی غەفوری حەبێ، ئەڵێ وەرنە دەرەوە، زرم، ڕوو ئەکاتە ماڵی مامۆستا مەلا عەلی، وەرنە دەرەوە و لەوێوە ڕوو ئەکاتە ماڵی عوسمانی حەمەپیرەژنی باوکی کامەران، ئەوەی گەراجەکەی هەیە، ئەوە ئەتەقینێتەوە، ئەم چوارە بە دەبابە تەقێنرانەوە، ئەوبەریش کە کانی عاشقان وای لێهات چواردەوریان گرتن، وردە وردە بە سێ و چوار ڕۆژ بە تی ئێن تی هەموو کانی

عاشقانیان تەخت کرد.

هێزێکی زۆر هاتبوو، ترس هەبوو، کەس نەیئەوێرا لە ماڵی خۆی بخەوێ، ئەیانگووت ئەم قواتە عەسکەریەش فەلەستینین، بەڵام ئێمە نەهاتین زۆر موتابەعە و وردەکاری بکەین، بزانین خەڵکی کوێن، خەڵک ئەیوت بابە ئەم ٥٢ کەسە بێ سەروشوێنە تا عەربەت بە شوێنیانەوە بوون، تا چەمچەماڵ بە شوێنیانەوە بوون، ئەصلێشی نەبوو، ئەم ٥٢ کەسەی کە کران بە ژێر خۆڵەوە و دوای ڕاپەڕین دۆزینمانەوە، نەهاتووەتە خواری سەیتەرەکە، یانی بەعس ئەوەندە کەتمان بوو شتەکەی، یەک نهێنی دەرچوایە خەڵکیان دەکوشت، بۆیە لە سەرەتادا نەمانەزانی ئەم سوپایەی کە هاتووە زێبارییە، یان سورییە یان فەلەستینییە.

**پرسیار/ لەو کاتەدا کێ قائیمقامی هەڵەبجە بوو؟ مولازم خالید چی بوو؟**

وەڵام/ پێموایە هۆشمەند بوو، هۆشمەند هەورامییە و خەڵکی هەڵەبجە بوو، ئێستاش ماوە. ئەو بینای کە ئێستا نوخشەخانی لێیە قائیمقامیەت بوو. مولازم خالیدیش مەسئولی ئەمن بوو تا هەشتا و هەشت، وابزانم مولازم خالید و مولازم عەلی جاشی کوردی خۆمان دەریانکردن و بردنیان بۆ سلێمانی. دائیرەی (ئەمن)یش لە سوچەکەی سەرەوەی باخی گشتی ئێستادا بوو. بیناکەی پشتی قوتابخانەی هەڵەبجەی کچانی ئێستاش بینایەکی نهێنی بوو، وەکو مونەزەمەش وابوو، سجنیش بوو.

**پرسیار/ لەو ماوەیەدا ئەوەی بەعسی بووبێ و خەڵک لێی ترسابێ، یان مامەڵەی ناشیرین و خراپ بووبێ کێ بوو؟**

وەڵام/ بۆ مامەڵەی ناشیرین، (ڕ.س) یەکێکە بوو لە بەعسییە ترسناکەکان، ئەهات لەبەرئەوەی ڕقی لە باوکی تۆیە، تۆ توتنت ئەکرد لە بەکراوا ئەهات ئەیکوشتی، هیچ نەبووی بۆ خۆت خەریکی تووتن بووی، ئەچوو فیراری ئەگرت ئەیکوشت، بە پلەی یەکەم (ڕ.س) بوو لەم ناوچەدا، ئەویش بەعس خۆی کوشتییەوە.

**پرسیار/ تا چەند مامەڵەی سلبی پێشمەرگە ڕۆڵی هەبوو لە پەرەسەندنی دیاردەی جاشایەتی لە کوردستاندا؟**

وەڵام/ ئەوە زیاتر لە شەستەکاندا بوو، بۆ نموونە (ڕ.س) پێشمەرگە بوو لە شۆڕشی ئەیلولدا، غەدری لێکرا وەکو باسی ئەکەن، کوشتنی شەخسێکە ئەویش لە تاوا ڕائەکات دێتەوە، یان (ت.ڕ)، مەفرەزەی یەکەمە، لە مەفرەزەی یەکەمیشدا حاکمە، ناوی حاکم (ک)، و کۆمەڵەیە، تائێستا بە نهێنی ماوەتەوە، ئەڵێن دوو ئامۆزای (ت) بە غەدر ئەکوژن، ئەم ئامۆزانەی خائین نەبوون، ئەویش ئەڵێ من لە شۆڕشێکدا ئیش ناکەم کە ئامۆزاکانم بکوژێ، لەکاتێکدا ئامۆزاکانم بن تورک بە بن تورک ئەگەڕێن بە شوێنمدا و نانم بۆ ئەهێنن، هێلکەی کولاوم بۆ ئەهێنن، دێتەوە خۆی تەسلیم ئەکاتەوە و ناشتوانی بە بەتاڵی

دانیشێ، شتی کردووە، تۆفیق و ئەوان لە ١٩٧٦دا لێرە تەمێی خەڵکێکیان ئەکرد، خەڵکیان لەم شارەدا کوشت، خەڵکێک دەستی چوو بوو بە خیانەتدا، ئەگەر بمایە زۆر پیس دەرئەچوو، نەیانهێشت بمێنێ، ناوەکان لە هەڵەبجەدا دیارن.

بۆیە کاریگەری هەبوو، تەنانەت لەم شۆڕشی نوێیەدا کە من تیایدا ماندووبووم و خەباتم کردووە، وەختی وا بووە ئاکاری ناشیرینی مەسئولێک وایکردووە پێشمەرگەیەک تەسلیم ببێتەوە و بووە بە جاش، لەکاتێکدا ساڵانی(١٩٧٧-١٩٨١) پێشمەرگە بووە، کە ئەمە وەک ئەوە وایە شەڕ لەگەڵ دێودا بکەیت، ئاخر دوای ١٩٨١ بارەگا ئەکرێتەوە، ناحیە ڕزگار ئەبێ، دێ ڕزگار دەبێ، من ١٩٨٣ چووم بۆ مەڵبەند، لەوێ دائەنیشتم سەیری تەلەفزیۆنم کردووە، مەڵبەندی یەکی یەکێتی لە حاجی مامەند، بۆ لای کاک بەختیار، بەکری حاجی سەفەر، کەمال شاکیر، پشتیوان، فەرهاد، ئەمیر، نەبەز، بۆ لای کێ و کێ، ژوورە و دانیشە و شەو ترەقە و میاو بکە و سەیری تەلەفزیۆن بکە، موەلیدەیان هەیە، خۆ ئەمە قورسە، بەعس دێت بۆردومانی دەکات، بەڵام فەرقی هەیە لەگەڵ ساڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩ مەسئولی مونەزەمە ئەچوو لە ئاوێسەر ئەیخواردەوە، ئەوەندە بێ منەت بوو، بەعسییەک لە ناصریەوە بێت و بتوانێ بڕوات لە ئاوێسەر بخواتەوە، بڕۆی لە ئەحمەدئاوا بخۆیتەوە، سەعات ١٠ بێیتەوە، وانیە، ئێ یەکێک ئەگەر بەعسی بێت دەستی بە شتێکدا بڕوات خراپی پێ ئەکەن، زۆریان تەمێ کرد.

**پرسیار/ دوای خۆپیشاندانەکەی ١٩٨٧/٥/١٣ ڕێکخستنەکان کز ئەبن یان بەهێزتر ئەبن؟**

وەڵام/ بۆ خۆم وەک ئاڵای شۆڕش، پێموایە تەنزیمەکان هەموویان کز بوون، ئەو تەنزیمە کز نەبوو کە فکری تیا بوو، یانی من لە گەرمەی موزاهەرەکەدا بەم کاک سەعیدەم وت ئەوە مەسئولی شارەکەتانە ئەها لەوێوە بۆ کوێ ئەڕوات، مەبەستم شانەی تەنزیکم بوو، ئەوە ئەبێ بێت لەگەڵ ئێمەدا موزاهەرە بکات یان لەوێوە بڕوات و سەری خۆی هەڵگرێ. چەپەکان لە موزاهەرەی ١٩٨٧دا کاریگەر بوون و دەوریان هەبوو، ئاڵای شۆڕش، ئەمە یەکێتیە، ئەمە پارتییە، ئیسلامییەکانیش، بەڵام دوای ١٩٨٧ ئەوەندە وەزع نەما، ٥/١٣ کە موزاهەرە دەبێ خەڵک تا ١٠/١٣ نایەتەوە سەر خۆی، گرتن هەیە، تەقاندنەوە هەیە، ٥٠٠ ماڵ لێرە ڕائەکات بۆ ئێران، باوکی ڕۆیشتووە و کوڕەکەی لێرەیە، کوڕەکەی ڕۆیشتووە و خوشکەکەی لێرەیە، پورزاکەی ڕۆیشتووە و ئامۆزاکەی لێرەیە، ئەو دڵی لای ئەمە و ئەو دڵی لای ئەوە، وەکو ئەڵێی کەئابەیەک شار ئەگرێتەوە نەبێتەوە، ئیتر لە ١٩٨٨/٣/١٦یش کیمیاییبارانەکە ڕوویدا.

دەنگوباسی ئەوەش هەبوو کە هەموو هەڵەبجە ڕابگوازرێت. من پێموایە گرتنی کوێت و حەماقەتی سەدام نەبوایە، سلێمانیش نەئەما. چونکە ساڵی ١٩٨٩ لە سلێمانیدا کۆڵانەکان

یەک دەرچەیان هەبوو، کۆڵانەکانی صابوونکەران پێچو پەنای تیایە، وایان کردبوو پێچ و پەنای نەمێنێ، لێرەدا گرتبوویان بۆئەوەی خەڵک تا ئەوێ بێت و بگەڕێتەوە و نەتوانێ خۆی دەرکات، ئەوەش لەو سەرەوە دێ هەر ئەبێ بگەڕێتەوە، ئەمانەی کردبوو، ئەمپریفایەری مزگەوتەکانی سەحب کردبوویەوە، جگە لە بانگ سەوت نەئەچوو بۆ دەرەوە، لە دەباشان تۆ بگیرایتایە ئیعدام بووی، شوێنی ماڵەکەی مام جەلال، کوردسات، ناڵێم لە چۆمان، ناڵێم لە ماوەت، ناڵێم لە گەڵاڵە، ناڵێم لە قۆپی قەراغ، لە زڕگوێز بگیرایتایە ئیعدام بووی، لە عەربەت ١٠٠م بەرەو ئیتیجاهی هەڵەبجە بگیرایتایە ئیعدام بووی. لە سلێمانی لە دەرەوەی شەستیەکە بڕۆیشتیتایە بۆ دەباشان، خۆ دەباشان ئێستا کوردسات بووەتە ناو ماڵ، ئیعدام بووی.

بەنیسبەت ئاڵای شۆڕشەوە، ئێمە تەنزیمێکی بەهێز بووین، کە چووینە سلێمانی، لەوێش من هەر تەنزیم بووم، بەشداربووم، لە سلێمانی مەسئولم گیرا، بە دەمانچە و ڕومانە و بەیانەوە. کە ناوی مامۆستا محێدین بوو، شارباژێڕییە، کە ئەگیرێ قارەمانە ئیعتیراف لەسەر من ناکات، من ماڵ جێئەهێڵم ئەچم لە ماڵی ئەم دکتۆر ئاراس عەزیزەکەی کە ئێستا یەکێکە لە دکتۆرە باشەکانی سلێمانی، ماڵی دکتۆر فاروق و ئەوان لە ئیختیفا ئەبن، تەنها دایکم ئەزانێ، باوکیشم نازانێ، ئازاد بۆ نایەتەوە، دایکم ئەڵێ چووزانم شتی لەژێر سەرایە بۆیە نایەتەوە.

**پرسیار/ لە کیمیاییەکەدا ئێوە لێرە بوون؟**

وەڵام/ نەخێر، ئێمە ٣/١٤ ڕائەکەین. با کیمیاییەکەت بۆ باس بکەم، شەوی ١١ لەسەر ١٢ من ئەچوومەوە بۆ هەڵەبجە، من ئاگام لێیە کە هێرشە، من خۆم ئاڵای شۆڕشم، شەوان لە ماڵی ئەنوەری ڕابەین، بۆ سیانزە وەزع تەواو خراپ ئەبێ، چواردە دوو شەممە ئەکات، ئەم ساڵیش(٢٠٢٢) دووشەممە چواردە ئەکات، ئێمە سێ سەیارەمان پێیە، ماڵی خوشکم هاتوون لە سلێمانییەوە پاسێکیان پێیە، ماڵی خوشکەکەی تریشکم(لەیلا) لێرە پیکابێکیان پێیە، ماڵی خاڵۆشم لێرە جیبێکیان پێیە، ئەهلی گەڕەک با بڕۆین، پیکابەکە دە کەس ئەگرێ، بیست خۆی داوە بە ئەرزا، پاسەکە ٢١ ئەگرێ بووە بە ٤٠، جیبەکە ٩ ئەگرێ بووە بە ١٣، وەلحاصڵ ڕۆژی دووشەممە کە ئەکاتە ١٩٨٨/٣/١٤ ماڵی مامە کەریم، ماڵی عادل، ماڵی قادر بەگ، ماڵی کاک وریا، ماڵی خۆمان، میوانێکی ماڵی مامەکەریم، ئەمانە دەرچووین، ئێمە دەرئەچین لە زەڵم تۆپبارانە جیبەکەی ماڵی عەلی وەستا قادر و بێشکەکەیان ئەسووتێ. ئێمە لە ڕێگای زەڵم بەسەر سەیارە و لاشەدا ئەڕۆیشن و دەرئەچین، چیمان کرد بە خۆمان برارۆ. بەوشێویە ئێمە دوو ڕۆژ بەر لە بۆردومانی کیمیایی (ڕۆژی دووشەممە) شارمان بەرەو سلێمانی جێهێشت و کیمیاییبارانی هەڵەبجەمان نەدی.



کاروان عوسمان خەیات «ڕێبین»/ تاران

# دەستنووسی زانایانی کورد

## لە کتێبخانەی دائیرەتولمەعاریفی گەورەی ئیسلامی ئێران لە تاران

هەر لە درێژەی ناساندنی دەستنووسەکانی کتێبخانەی دائیرەتولمەعایفدا و لە بەشی دووەمی ئەم بابەتەدا بڕیارم دابوو کە کۆمەڵەکان (مەجمووعە)ەکانیش وەرگێڕمە سەر زمانی کوردی، ئەوا لێرەدا بە هەندێک دەستکاری کەمەوە وەرمگێڕاوە و پێشکەشی ئێوەی خوێنەری دەکەم، هیوادارم جێی سوودوەرگرتن بێت. ئەوەی لە درێژەی ئەم بابەتانەدا ماوەتەوە، بەرگی سێیەمی کتێبەکەی ئەحمەد مەنزوورییە، لەوێشدا کۆمەڵێک دەستنووس و کۆمەڵەی تر هەن، بەهیوام ئەوانەیش بە زنجیرە بە دوای ئەمدا بڵاویان بکەمەوە، یان لە دەرفەتێکی تردا وەریان دەگێڕم و بڵاویان دەکەمەوە.

## ١- کۆمەڵەی ٥٩٢

ئەم کۆمەڵەیە ٨ بابەتی تێدایە و دووانیان هیی کوردە:

١- شرح الشافیة: ئیبن حاجب- نیزام نیشابووری؛ سەرەتا: احمدک اللهم علی أن وفقتنی لصرف. (گ١٨٧ ر).

٢- شرح شافی: ئیبن حاجب- سارووی مازندەرانی؛ سەرەتا: حمدله. صلاة. چنین گوید ذرۀ بی‌مقدار. (گ١٨٧ پ-٢٤١ ر).

تێبینی: بە چەند شێوە خەتی جیاواز نووسراوە؛ ١٣٢٠ (ش١)، خەتی نەسخ، حەسەن بن نەقدعەلی، ١١٩٦ (ش٢) و سەفەر ١٢٦٩ق (ش٤) و ڕەجەب ١٢٦٩ ق (ش٥)، ٤٤٦گ، ئەندازە: ١٥/٥×٢٢سم؛ ژمارە: ٥٧٨٣٧.

## ٢- کۆمەڵەی ٦٣٠

ئەم کۆمەڵەیە ٧ بابەتی تێدایە، ٦ بابەتیان هیی کوردە:

١- تقریب المرام فی شرح تهذیب الکلام: نووسینەکە هیی تەفتازانییە. شەرحی عەبدولقادری سەنەندجی؛ سەرەتا: بسمله. نحمد من هدانا الی طریق. (گ٧ پ-١٣٤ ر).

٢- المبدأ والمعاد؛ رساله فی المبدأ: نووسینی عەبدولقادری سەنەندجی؛ سەرەتا: بسمله. بعد حمده علی ما هدانا الی طریق.

٣- اثبات واجب الوجود: نووسینی عەبدولقادری سەنەندجی؛ سەرەتا: حمدله. صلاة. وبعد، فیقول.... (گ١٤٢ ر-١٤٥ پ).

٤- ابطال اللاتناهی، رسالة فی...: نووسینی عەبدولقادری سەنەندجی؛ سەرەتا: الحمدلله علی حلمه بعد علمه.

٥- قصیدۀ شکوائیه: محمدوسیم؛ دلم گرفت ز جور زمانه و ایام. (گ١٤٩ پ-١٥٠ ر).

٦- عقاید: نەناسراو، هەشت بەش؛ سەرەتا: سبحانک ما اعظم شأنک. (گ١٥٠ پ-١٥٥ پ).

تێبینی: نەستەعلیق و نەسخ و چەند دەستە، ١٢٩٩/٢ق، ١٦٦گ، کاغەزی فەرەنگی، ١٦/٥×٢٤سم؛ ژمارە ٧٨٧٢٤.

## ٣- کۆمەڵەی ٦٣١

ئەم کۆمەڵەیە لە پێنج بەش پێکهاتووە.

١- دقایق الاخبار: نەناسراو؛ سەرەتا: بسمله، الحمدلله افضل بنی‌آدم بالعلم والعمل. (سەفەر ١٢٩٤ق)، (گ١ ر-٦٥پ).

٢- کنز الاخبار: نەناسراوە. بەڵام گومان دەکەم ئەمەیش هەر دانراوی کورد بێت. سەرەتا: حمدله. وبعد الصلاة والسلام الواردة. (گ٦٥ پ-٧٢ پ).

٣- عقاید: مەولانا خالید، سەرەتا: هذا کتاب عقاید مولانا خالد قدس سره. الحمدلله الذی انعم علینا وهدانا. (گ٨٣-١٢٥ر).

تێبینی: نەسخ و نەستەعلیقی نوێی پوختە، محەمەدساڵح، ١٢٩٤ق (گ٦٥پ) ١٣٠٠ق

(١٢٥ر)، کاغەزی نۆکی، ١١×١٧٫٥سم؛ ژمارە ٦١٣٢٦.

## ٤- کۆمەڵەی ٦٣٨

ئەم دەستنووسە لە ١٠ بەش پێکهاتووە و ٣ بەشیان هیی کوردە.

١- شرح شرح الزوراء: مەلا شێخ کوردی. سەرەتا: الحمدلله المتوحد بجلاله. (گ١٢پ-١٥ر).

٢- الحاشية على اثبات الواجب: نەناسراو، پێدەچێت هەر هیی شێخ عەبدولقادری سەنەندجی بێت. سەرەتا: نحمدک يا من دل على ذاته بذاته. (گ١٣٨ر-١٦٩پ).

٣- حاشيةُ فلسفيةُ کلاميه: نەناسراو. سەرەتا: منهم من زعم آن جميع. (گ١٧٠-٢٠٥پ).

تێبینی: نەسخی نوێی پوختە، چوار کەس نووسیویەتییەوە: ١- یووسفی کوڕی مەلا قەنبەر (گ ١١پ)؛ ٢- مەلا شێخ کوردی بۆ شێخ محەمەدسەعید لە مەدرەسەی جەدیدە لە سەنەندج ١٢٣١ق؛ ٣- مەحموود لە ع ١٢٤١/١ق (گ٦٦ر)؛ ٤- ئەحمەدی کوڕی مەلا وەیسی نۆدشەیی ئەسڵ، ١٢٤٤ق (گ ١١٥ر)، بۆ شێخ محەمەدسەعیدی کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ ئەحمەد لە مەدرەسەی دارولئیحسان (گ ١٦٩ پ-٢٠٥ ر). ٢٠٥گ، ٢٠-٣١س، ٩٫٥×١٥سم؛ کاغەزی نەباتی ئاهار موهرە، ٢١×٥٥٫٥ سم؛ ژمارە ٦١٣٣٦.

## ٥- کۆمەڵەی ٦٤٦

ئەمە کۆمەڵەیە لە دوو بەش پێکهاتووە، دانراوەکانی هیی کورد نین و تەنیا پێشکەش بە کورد کراوە، دانراوەکانیش بریتین لە:

١- بدر الطالع فی شرح جمع الجوامع؛

٢- الحاشية على شرح جمع الجوامع.

تێبینی: بە خەتی نەستەعلیقی پوختە نووسراوەتەوە، محەمەدحەسەنی پایگەلانی، چوارشەممەی زیلحەجەی ١٢٦٤ق، پێشکەشکراوە بە شێخ محەمەدوەسیم، ١٥٧گ، ١٧س، ٦×١٣٫٥سم؛ کاغەزی ئاهاری موهرەیی ١٣٫٥×٢١سم؛ ژمارە ٧٨٧٣٣.

## ٦- کۆمەڵەی ٦٧٠

ئەم دەستنووسە لە سێ بەش پێکهاتووە و دوو بەشیان هیی کوردە و ئەوی تریان نەناسراوە.

١- ايقاد الضرام: ئیبن حاج، محەمەد. سەرەتا: بسمله. الحمدلله الذی ارسل رسوله. (گ١ پ-٦پ).

٢- المتعة؛ فتوایی در متعة: ئیبن حاج. سەرەتا: الحمدلله اولاً و آخراً. وله الشکر. (گ٦ پ-٨ر).

تێبینی: نەسخی نوێی پوختە، محەمەدڕەحیمی کوڕی لوتفوڵڵا، ١٢٩٨-١٣٣٣ق، ١٤گ، ١٩س، ١١×١٦٫٥سم؛ کاغەزی فەرەنگی نۆکی، ژمارە ٩٥٦٠٣.

## ٧- کۆمەڵەی ٦٧١

لە سێ بەش پێکهاتووە و یەکدانەیان بە دڵنیابییەوە هیی کوردە.

١- رسالة منطقية: یووسف تەختەیی. سەرەتا: بسملە. الحمدلله الذی لا مانع لعطائە. (گ٩ پ-١٠پ).

تێبینی: نەسخی نوێی پوختە، محەمەدڕەحیمی کوڕی لوتفوڵڵا، ١٢٩٨ق، ٢٠گ، ١٥س، ١٥،٥×٨سم؛ کاغەزی فەرەنگی نۆکی، ٢١×١٧،٥سم؛ ژمارە ٥٧٦٢٧.

## ٨- کۆمەڵەی ٧٧٢

ئەم دەستنووسە لە دوو بەش پێکهاتووە و هیچیان هیی کورد نییە، تەنیا نووسەرەوەی دەستنووس کورد بووە، لێرەدا تەنیا هەندێک لە وردەکاری دەستنووسەکە دەنووسین.

تێبینی: خەتی نەسخی نوێی پوختە، حەسەنی کوڕی عەبدولغەفووری کوڕی جامی حوسێنی پیر خزری میهرەبانیی موکریی ساوق و شێوە بلاغی، ٢٣ی ڕەمەزانی ١١٢٥ق، بە نیشانەی مۆری بەیزا «لا اله الا الله الملک الحق المبین، عبده محمد تقی»، ١٤٥گ، ١١-١٨س، ١٥×٨،٥سم و ١٣×١١،٥سم؛ کاغەزی ئاهاری موهرە، ٢٠×١٥،٥سم؛ ژمارە ١٠٧٦٢١.

## ٩- کۆمەڵەی ٨٧٥

ئەم کۆمەڵەیە لە چوار بەش پێکهاتووە و یەک بەشیان هیی کوردە

١- الشافية: ئیبن حاجب. سەرەتا: قال الشیخ الامام... سألنی من لا یسعنی. (گ١ پ-٣٣ر).

تێبینی: نەسخی پوختە، محەمەدنەسیری کوڕی موحەممەدئەشرەفی ئەرائیلی نائینی، ١١٠٧ق، ئەحمەدی کوڕی عەلی خوانساری ٧ی شعبانی ١٢٥٧ق (گ٣٢پ) و محەمەد مەعسووم حوسێنی خەلیفە (گ٣٣ر)، ٢٨ج١ ١٢٦٤ق (گ٣٣ پ) بە نیشانەی مۆر «یا اللّٰه المحمود فی کل فعالە» (گ ١٠٩ پ). ١١٢گ، ١٥س، ١٤×٥،٥سم؛ کاغەزی تیرمە، ١٨×١٠،٥سم؛ ژمارە ٩٧٠٥٧.

## ١٠- کۆمەڵەی ١١٣٦

ئەم کۆمەڵەیە لە هەشت بەش پێکهاتووە و یەک بابەتیان دانراوی کوردە.

١- الحاشیة علی حاشیة شرح الایساغوجی: عەبدوڵڵای کوردی حوسێنئابادی. سەرەتا: حمدا لمن تمثل من مرائی اجناس. (گ٤٦ ر-٦٤ پ).

تێبینی: بە چەند دەست نووسراوە، نەسخی پوختەی سەدەی ١٢ق (ش١ و ٢)، نەسخی نوێی عەبدوڵڵا ئەوهەنگی لە ١٢٧٩ق (ش٣گ ١١٢پ). ٢٠٧گ، ژمارەی دێرەکان یەکسان نییە، کاغەزی نۆکی فەرەنگی، ٢٢×١٥،٥سم؛ ژمارە ٥٧٥٦٩.

### ١١- کۆمەڵەی ١١٤٣

ئەم دەستنووسە لە سێ بەش پێکهاتووە و یەک دانەیان هیی کوردە.

١- شرح المحرر: محەمەد عومەری مورشدی. سەرەتا: الحمدلله الذی قسم المیراث. (گ٥ر-١٧٨پ).

تێبینی: نەسخی نوێ، ئەحمەدی کوڕی مەحموود، ١١٠٧-١١٠٨ق، ١١١گ، ئەندازەی دێڕەکان یەکسان نییە، کاغەزی نەباتی و نۆکیی قایم، ١٩×١٥سم؛ ژمارە ٥٧٥٩١.

## سەرچاوەکان


. منزوی، احمد (١٣٨٤): فهرست نسخەهای خطی کتابخانۀ مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی، جلد دوم، از شماره ٥٤٢-١١٥٠، مرکز دائرة المعارف بزرگ اسلامی (بخش کتابخانه)، تهران.






**محەمەد جەمیل عەلی، هەڵگری بڕوانامەی ماستەر**

# ئایا خوێنەر سەنتەرە؟

لەم سەردەمەدا، لە کۆمەڵگەی ئێمە جموجۆڵی نووسینی کتێب و خوێندنەوە، بڵاوکردنەوەی کتێب، بابەتی پەیوەندیدار بە کتێب لە گەشەدایە. بە بەڵگەی ئەوەی لەم سەردەمەدا (٩٣) کتێبخانەی گشتی لە هەرێمی کوردستان هەیە، هەر ئەمساڵیش تا مانگی تەمووزی٢٠٢٢ پێدانی ژمارەی سپاردن بە کتێب گەیشتۆتە (١٠٠٠). چەندین دەزگای پەخش و بڵاوکردنەوە و ڕێکخراو و گرووپ هەن کار لەسەر ئەم بابەتانە دەکەن و مەراسیم بۆ بڵاوکردنەوەی کتێب ئەنجامدەدرێت. لەوەش زیاتر، لە ڕاپرسییەکدا کە پێموایە دوا ڕاپرسییە لەمبارەیەوە هاوڵاتیان، بڕوایان بە کاریگەری کتێب هەیە و حەز دەکەن منداڵاکانیان کتێب بخوێننەوە، هەروەها بڕوایان بە کاریگەری  کتێب  لەسەر کەسێتی مرۆڤ هەیە. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە کە بابەتی پەیوەندیدار بە کتێب  کەوتووەتە سەر  ڕێگا ڕاستەکەی خۆی  و  بێ کێشەیە، بەڵکو هەندێ کۆسپ و تەگەرە و چاڵی لێ دروست بووە،  ئەگەر ئاگادار نەبین لەوانەیە  بخزێینە ناو ئەم چاڵانە  و  تووشی گرفت بین و خۆزگە بەوە بخوازین کە هەر نەهاتبواینە ناو ئەم بابەتە.

پێموایە ئەم جموجۆڵ و گەشەیە کە هەیە ئامانجی خۆی نە پێکاوە، چونکە خوێنەر نەبووەتە سەنتەر. لە ئێستادا خوێنەر سەنتەر نییە، بەشێکی دەرنەکەوتنی کاریگەری ڕاستەقینەی کتێب لەسەر تاکی کۆمەڵگەی ئێمە هۆکارەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەنتەر نەبوونی خوێنەر.

یاساکەی ساڵی ١٩٩٣ لە هەرێمی کوردستان سەبارەت بە چاپەمەنی، زۆر ئاسانکاری کردووە بۆ بڵاوکردنەوەی کتێب و لەکاتی سپاردنی ژمارەی سپاردن هیچ لێژنەیەک نیە بۆ پێداچوونەوە بە بابەتەکان و باشی و خراپی بابەتەکان، هەروەها لەبەرئەوەی ئێستا بیر و بۆچوون و ڕێباز، حیزب و ڕێکخراو زۆر هەن بە ئاراستەی جیا کار دەکەن و دەزگاکانی بڵاوکردنەوەی کتێب و نووسەرانیش بەداخەوە دابەش بوون بەسەر هەندێک لەم بیروبۆچوونانە. نەبوونی دەزگایەکی نیشتمانیش بۆ بڵاوکردنەوە لەلایەکی تر. بۆیە هەر ئەم بارودۆخە چەند دەرهاویشتەی نەرێنی لەسەر جموجۆڵ و گەشەکە دروستکردووە، کە وایکردووە ئامانجەکە نەپێکێت کە سەنتەربوونی خوێنەرە. هاوتەریب لەگەڵ ئەم بارودۆخەش بەشێکی بۆ هۆشیارنەبوونی خوێنەریش دەگەڕێتەوە بەوەی کە نەیتوانیوە باش و خراپی ئەمانەی خوارەوە دیاری بکات:

**١- نووسەر: دەتوانین بڵێین لە کوردستاندا و لەم سەردەمەدا ئەم جۆرە نووسەرانە، یان بەناو نووسەرانە بوونی هەیە.**

١-نووسەر نیە: وەرگێڕە، یان ڕۆژنامەنووسە، بە نووسەر دەیناسێنن. بەزۆری لە دەزگانی ڕاگەیاندندا ئەم تێکەڵییە هەیە، بۆی دەنووسن نووسەر. جاری وا هەیە خۆی دەڵێت:» من نووسەر نیم«. کەچی هەربۆی دەنووسن نووسەر. دەبێت بزانین لەبارەی پێناسەی نووسەر هەتا ئێستا یەکێتی نووسەرانی کوردستانیش پێوەرەکانیان کەم و کوڕی تێدایە، چونکە پێوەری ئەوان تەنها نووسینی دوو کتێبە لە بواری ئەدەب. ئەی ئەوەی نەتوانێ لە بواری ئەدەب کتێب بنووسێ، ئایا نابێتە نووسەر؟!

**٢- خۆی بە نووسەر دەناسێنێت، بەڵام لە بنەڕەتدا نووسەر نیە:** کەسێکە پارەی هەیە هەموو شتێکی تاقیکردووەتەوە دەیەوێت ئەمەش تاقی بکاتەوە. جاری وا هەیە دەڵێن: «فڵانە کەس نووسەرە، ئەی ئەوە نیە کتێبێکی هەیە.» بێ ئاگا لەوەی کەس بە نووسینی کتێبێک نابێتە نووسەر، ئەگەر وابێت هەموو ئەوانەی ماستەریان تەواوکردووە، دەبێت نووسەر بن.

**٣-نووسەرە و هەموو توانایەکی نووسینی هەیە، بەڵام کەسێکی بەرژەوەندخوازە.** بازرگانی دەکات بە نووسین و کتێب لەپێناو ناوبانگ و پارە و بەرژەوەندی خۆی. کاتێک نووسەر دەڵێ: دەمم چەور بکەن، ئەگەرنا لە دژتان کاردەکەم مانایی چیە؟!

یان ڕۆژانە دژی هەموو ئەو دروشمانە کار دەکات کە تاکی ئەم کۆمەڵگەیە بڕوای پێیەتی، بۆ نموونە دەڵێت: خێزان پیرۆز نیە !!! شەرمە هەڵگری ناوی بابمم!!! هەربۆیە لەم جۆرانە لە کوردستان ئەمڕۆ پاسەوانیان هەیە! ئەریٚ نووسەر پاسەوانی بۆچیە؟!!

بەداخەوە لێرەدا زۆرجار دەبینین خوێنەران بەتایبەت ئەوانەی بیٚ زانیارین لەمبارەیەوە. هەرکاتێک لەم جۆرە نووسەر و بەناو نووسەرانە، لە هەر شوێنێک کۆڕ و کۆبوونەوەی هەبێت دەڕۆن و گوێی بۆ ڕادەگرن، یان هەر کتێبێکی بڵاوکردەوە دەیکڕن و دەیخوێننەوە. لە کۆڕەکانی ئامادە دەبن و وێنەی لەگەڵ دەگرن و قسەکانی دەرخ دەکەن لە سۆشالمیدیاش لایک و کۆمێنت بۆ قسەکانی دەکەن. لێرەدا ئەم جۆرە کەسانە دەبنە پاڵپشت بۆ ئەو جۆرە نووسەرانە.

بەگشتی دەبێت بزانین، مێشکمان فراوان نابێت بە کتێب و نووسینی ئەم جۆرە نووسەرانە.

**٢-کتێب**

بۆ بەکلتوورکردنی خوێندنەوە و، دروستکردنی خوێنەری کتێب، زۆرجار باس لە گرنگی هەڵبژاردنی کتێب دەکرێت، بێگومان ئێمە هەموو نووسەرێک ناناسین، ئەگەر نووسەرەکە نەناسی ویستمان کتێب بخوێنینەوە، نابیٚ هەموو کتێبێکمان پیٚ باش بێت بۆ خوێندنەوە. وەکو دەزانین کتێب هەڵێنجراوی بیری نووسەرە، نووسەریش مرۆڤە، مرۆڤەکانیش باش و خراپیان هەیە. کەواتە کتێبەکان باش و خراپیان هەیە. بەڵام کەس هەیە دەڵیٚ: دەیخوێنمەوە ئەوەی باش بوو، وەریدەگرم و ئەوەی خراپ وەریناگرم. ئەمە بە هەموو کەسێک ناکرێت، دەبێت بزانین کتێب هەیە هەڵبەستراوە، یان زانیارییەکانی هەڵەیە.

**٣-خوێنەر**

یەکێک لە ڕێگاکانی ڕاکیشانی خەڵک بۆ خوێندنەوەی کتێب ئەوەیە لەگەڵ کەسانی خوێنەر تێکەڵ بێت و مامەڵەیان لەگەڵ بکات، بێگومان بۆئەوەی بابەتی قسەیان کتێب و نووسەر و خوێندنەوە بێت. بەڵام دەبێت کەسی خوێنەر بناسین نابێت هەرکەسێک کتێبی خوێندەوە پێمان باش بێت، چونکە هەیە خوێنەرە، بەڵام کتێبی خراپ کە هی نووسەری خراپە دەخوێنێتەوە. ئەو زانیارییانە وەردەگریٚ خراپە و بەمەبەستی خراپ بەکاردەهێنی، ئەگەر بەمەبەستی خراپیش بەکاری نەهێنێت، بێگومان کاریگەری خراپی هەر لەسەر دروست دەبێت.

**٤-بەرنامەی دەزگاکانی ڕاگەیاندن.** (لەبەرئەوەی دەزگایەکی ڕاگەیاندنی نیشتمانیمان نیە) لەبارەی کتێب بەشێکی زۆر ڕاگەیاندنەکان لە بازنەیەک دەسوڕێنەوە و تەنها باسی

ئەو بابەتەنە دەکەن کە لە بەرژەوەندی فکری خۆیاندان، یان تەنها ئەو کەسانە بانگهێشت دەکەن بۆ بەرنامەکان کە بە ئاوازی ئەوان دەخوێنێت. ئەگەر کەسێک کەمێک دیراسەی بابەتی کتێب و خوێندنەوەی کتێب بکات، دەزانێ بۆ بابەتی کتێب هەر دەزگایەکی ڕاگەیاندن کێ بانگ دەکات. دواتر مەرج نیە ئەوەی لە ڕاگەیاندنەکان باس دەکرێت لەبارەی کتێب و بابەتی پەیوەندیدار بە کتێب ڕاست بێت، چونکە ئەسڵی بابەتەکە ئەوەیە کە داتا نییە، زۆربەیان داتایان لەبەر دەست نیە و ئاگادار نین. بە وەزارەتی ڕۆشنبیریشەوە!! بەنموونە کەس هەیە دەڵێت: سەیری کۆمەڵگە بکە دەزانی کە کتێب ناخوێنێتەوە! خەڵک کتێب ناخوێنێتەوە جیایە لەوەی کە کتێب کاریگەری نییە. کە کاریگەری نەبوو لەوانەیە لەبەرئەوە بێت کە کتێب بە هەڵە هەڵبژاردراوە، یان پرۆسەی خوێندنەوە هەڵە بووە. لە هەمووی کارەسات تر، دەزگای ڕاگەیاندن هەیە کاتێ باس لە بابەتی پەیوەندار بە کتێب دەکات زۆرجار بۆچوونی کتێبفرۆش وەردەگرێ، کە ئەسڵ وایە بۆچوونی خوێنەر وەربگرێت.

### ٥- دەزگانی چاپ بڵاوکردنەوە و ناوەندەکانی کتێب

ئەم دەزگایانە دابەشبوون بەسەر فکرە جیاوازەکان، یان بازرگانی دەکەن بە کتێب و بەشێکیان بە خراپی ئاڕاستە دەکرێن. لەپێناو پەیداکردنی پارە، یان لەپێناو کۆکردنەوەی خەڵکی لە خۆیان بۆ سەرفی کتێبەکانیان. گوێنەدانە بابەتی کتێبەکە. بەشێک لە دەزگاکان کە کتێب چاپ دەکەن دەڵێن: «بازاڕەکە ئەمەی دەوێت، خەڵک ئەوەی دەوێت، بۆیە ئەم کتێبانە چاپ دەکەین، فرۆشی باشە.»

هەروەها ناوەندەکانی بڵاوکردنەوەی کتێب هەیە مەراسیم بۆ نووسەر دەکات، یان هەندێک کەس بەناوی نووسەر خەڵات دەکەن، تەنها لەبەرئەوەیە کە لە خۆیان نزیکە! لەوەش زیاتر کتێبی وەها دەرچووە مرۆڤ شەرم دەکات ناونیشانی کتێبەکە بڵێ!!

### ٦- گرووپ و سەنتەر و ڕێکخراوەکانی تایبەت بە خوێندنەوەی کتێب.

جگەلەوەی کە پێویستە ئاگادار بین و بزانین ئەم ڕێکخراوانە بەڕاستی لە خەمی دروستکردنی خوێنەر و بە کلتوورکردنی خوێندنەوەن، یان ئاڕاستەکراون و لەژێر ئەم ناوە بۆ مەبەستی خۆیان کار دەکەن، بەمانایەکی تر، بەڕاستی ڕێکخراون یان تێکدراون. جاری وا هەیە ڕێکخراوەکان کاریش دەکەن، بەڵام کارەکانیان زۆر کاریگەر نیە، بەڵکو زۆرجار بە ئاڕاستەی خراپ دەڕوات. بۆ نموونە کتێب دابەش دەکەن و، شانازی بەم چالاکیانە دەکەن، بەڵام ئایا ئەو کتێبانەی کە دابەشی دەکەن، باشن؟ ئایا خۆیان ئەم کتێبانەیان خوێندووەتەوە؟ ئایا گونجاوە ئەم جۆرە کتێبانە دابەش بکرێت بەسەر ئەم جۆرە کەسانە؟ دەبێت بزانین زۆرجار ئەو دابەشکردنە هەڕەمەکییان خوێنەر بە ئاڕاستەی

خراپ دەبات.

ئەمانە هەمووی وایکردووە، خوێنەر سەنتەر نەبێت، بەڵکو بەرژەوەندی و گیرفان سەنتەر بێت، لێرەدا خوێنەر بۆتە یاری دەستی نووسەر و دەزگاکانی بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن و ڕێکخراوەکان.

ئەم خاڵانەی سەرەوە کە ئاماژەمان پێکرد، بەڵگەی ڕوونن لەسەر بەدەرنەبوونی ئەو بوارە لە گەندەڵی و ئیستغلال کردنی ئەم بوارە بۆ بەرژەوەندی کەسی، لەهەمانکاتیشدا ئەم خاڵانە پێویستە:

- بۆ خوێنەرێکی جددیی و بەرهەمدار بە جۆرێک ئەو بڕیار بدات لەسەر کتێب و نووسەر و دەزگاکان.
- بۆئەوەی لەکاتی خوێندنەوەی کتێب کاتمان بە فیڕۆ نەڕوات.
- هەتاکوو ئەو پارەیەی لە کتێب خەرجی دەکەین بەخۆڕایی نەڕوات.
- بۆئەوەی لەکاتی خوێندنەوەی هەندێک کتێب تووشی ژاوەژاوی مێشک نەبین.
- هەتاکوو مێشکمان بە زانیاری هەڵە بەرنامە ڕێژ نەکرێت.
- بۆ ڕێکخراوەکان ئەوانەی بەڕاستی لە خەمی بە کلتوورکردنی خوێنەوەی کتێبن لە کۆمەڵگە.
- بۆ نووسەری باش، چونکە ئەگەر خوێنەری جدی گەواهی بۆ نووسەری باش بدات، لە بەرژەوەندی نووسەری باشە.
- بۆ کۆمەڵگە، چونکە خوێنەری وریا و هۆشیار بە هەموو کتێب و نووسەرێک بە باشی هەژمار ناکات، ئەو کاتە کێرڤی نووسەر و کتێبی باش بەرزدەبێتەوە و خراپەکان دەپوکێنەوە و لە ناودەچن.
- بۆ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی باشە، ئەوانەی خاوەن ستراتیژین لەم بوارە.

دەرئەنجام، سوودی بۆخۆمان و بۆ خەڵک دەبێت، لەوێشەوە دەتوانین ڕەزامەندی خودا بە دەستبهێنین و لە دواجاریش خوێنەرێکی وریا دروست دەکەین، کە دەبێتە سەنتەر بۆ بڕیاردان لەسەر کتێبی باش و خراپ و نووسەری باش و خراپ. بڕیار لەسەر باشەکان دەدات و کێرڤی باشەکان بەرزدەبێتەوە و خراپەکانیش بەرەو نەمان دەچێت. چونکە وەکو نووسەرێکی کورد دەڵێت: خوێنەر دوا هیوایەکە لە ڕۆشنبیری ئێمەدا پشتی پێ ببەستین بۆ ڕزگارکردنی فەرهەنگ و کولتووری ئێمە لە چنگ ئەو سیاسەتە ڕۆشنبیرییەی لەم ساڵانەی دواییدا گیراوەتەبەر لە کۆمەڵگەی ئێمەدا. هەروەها ئەو جموجوڵەی کە لە سەرەتا باسم کرد، باشتر و کاریگەری تر دەبێت، بۆ پێکانی ئامانجە سەرەکییەکەی کتێب، کە ئەویش دروستکردنی خوێنەری هۆشیار- تاکی هۆشیارە- لە وێشەوە بۆ کۆمەڵگەی هۆشیار.



# ئیسلامی سیاسی ١٩٩٧- ٢٠١٠

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پرۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠- ٢٠١٠)


**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**


**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەترە و پانی پێش درێژی نووسراوە)

پ.د.ک.: پارتی دیموکراتی کوردستان

چ.: چاپخانە

چاپ.: نۆرەی چاپ

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب: ISBN: International Standard Book Number

س.: ساڵ

ش.: شوێن

ل: لاپەڕە

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟: هەر زانیارییەکی نادیار و نەزانراو

**تێبینی:** بەکاربەری ئەم بیبلیۆگرافیا، بۆ هەر سەرنج و ڕوونکردنەوەیەک، پێویستە سەیری ژمارەکانی پێشتری گۆڤاری خاڵ بکات.

**١- چەند ڕێڕوونییەک بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان**

نووسین: عەلی باپیر

بڵاوکراوەی بەرەو واقیعێکی بەهێز و پێزتر لە کوردستاندا

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٨٤، س: ١٩٩٧، ل:١١١، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: پێناسەیەکی کورت/ پێشەکی و ڕێخۆشکردنێکی گشتی/ بەشی یەکەم: چاکتر تێگەیشتنی دین/ باشتر ئاشنابوون بە ژین/ بەشی دووەم: برایەتیی قووڵ و فراوان/ ڕێز لە بوون و کاری یەکترنان/ ڕوونکردنەوەیەکی پێویست/ بەشی سێیەم: بەجێهێنانی مافی برا لە بەر خوا/ نەبوونی دوو هەڵوێستی دژ بە یەک و جیا/ بەشی چوارەم: چەند تێبینییەکی گرینگ/ پێ لە کرچ و کاڵی خۆنان/ دان بە فەزڵ و چاکەی یەکترداهێنان/ بەشی پێنجەم: تاقە دینەمۆی ئیسلام گیانی بەرەنگاربوونە/ تەنها ڕێی حوکمڕانیی ئیسلام توانایی و دەسەڵاتداربوونە/ بەشی شەشەم: کۆمەڵ و تەوژمە ئیسلامییەکان تەواوکەری یەکترن/ کۆمەڵ و تەوژمە ئیسلامییەکان لە هەموو کەس لە یەکتر نزیکترن/ بەشی حەوتەم: پێکهێنانی کۆڕێکی ڕاوێژی فراوان گرینگترین مەرجی برابوون و یەکەمین هەنگاوی یەکبوونە/ لە کۆتاییدا حەوت ئامۆژگاری گرینگ/ نێوەرۆک.

**٢- پێکهاتەی سەرکردایەتی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان بەگوێرەی ئەنجامەکانی کۆنگرەی حەوتەم بزووتنەوە بەرەو کوێ دەبا؟!**

نووسین: هێرش

زنجیرەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلامی سیاسی لە کوردستانی عێراق

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٨، ل:٢٨، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ خشتەی دابەشبوونی ئەندامانی کۆنگرەی حەوتەم بە گوێرەی دام و دەزگا و مەکتەب و هێزەکان/ ئاماری ئەندامانی کۆنگرەی حەوتەم/ ناوی پاڵێوراوان بۆ شوورای ناوەندی لە کۆنگرەدا/ چەند ئامارێک لەسەر پاڵێوراوانی شوورای ناوەندی/ لیستی شوورای ناوەندی تازە هەڵبژێردراو/ ئاماری جیاجیای شوورای ناوەندی تازە هەڵبژێردراوی پاش کۆنگرەی حەوتەم/ چەند دەرئەنجامێک/ دەرئەنجامی گشتی.

**٣- وەڵامێک بە ڕەخنە خورافییەکانی ئیسلامیەک و دیفاعێک لە ڕەخنە و ڕەخنەگرێکی مارکسی- بەشی یەکەم**

نووسین: سامان نووری- ئازاد مەحموود

بڵاوکراوەی یەکێتیی کرێکارانی کۆمۆنیست

چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٩٨، ل:٦٠، پ.:١٥×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ کێ ژنان بە (مشاع) دەکات ئیسلام یان مارکسیزم؟/ (باوکی سومییە) و ڕاکێشانی وەرەقەیەکی سووتاوی تر؟/ لەوحەیەک لە کردەوە سیاسییەکانی بزووتنەوە و گرووپە ئیسلامییەکانی کوردستان/ سوورەتی ئەنفال (ئەنفال)ی ڕژێمی بەعس و...../ سەرچاوەکان.

**٤- دین و سیاسەت (گفتوگۆیەکی بەرفراوان لەسەر ئیسلامی سیاسی لە کوردستان)**

نووسین: سەرۆ قادر

بڵاوکراوەی کتێبی گوڵان

چاپ.: یەکەم، چ.: و- ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٥١، س.: ١٩٩٩، ل:٣٤٨، پ.:١٦×٢٣

ناوەرۆک: پێشەکی/ بەشی یەکەم: پێناسە و سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسی لە مێژوودا/ بەشی دووەم: سەرهەڵدان و کاری ئیسلامی سیاسی لە عێراق و کوردستاندا/ بەشی سێیەم: گرووپە ئیسلامییە سیاسییەکان بە دوای چیدا دەگەڕێن؟/ بەشی چوارەم: ئیسلامی سیاسی چەند گفتوگۆ قبووڵ دەکات و دیموکراسییەت پەیڕەو دەکات؟/ بەشی پێنجەم: ئیسلامی سیاسی چەند نامۆیە بە ئایین و گیانی نەتەوەیی؟/ بەشی شەشەم: ڕووی ڕاستەقینەی ئیسلامی سیاسی/ ناوەرۆک.

**٥- کێشەی کورد: «لە ستراتیژی یەکگرتووی ئیسلامی»دا بزانن؟! وەڵامێکی ڕەخنەگرانە بە تێڕوانینە ئیسلامییەکانی ئەبوبەکر عەلی لەمەڕ کێشەی نەتەوایەتی**

نووسین: تاهیر ساڵح شەریف و ئایار ئەسعەد ڕەئووف

چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ؟، س.: ١٩٩٩، ل:٥٩، پ.:١٦×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکییەکی پێویست: تاهیر ساڵح شەریف/ یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان- زادەی چ بارودۆخێکە و درێژەپێدەری چ ڕێبازێکە؟/ یەکگرتووی ئیسلامی و پاکانەیەکی شەرمۆکانە لە بەردەم کێشەی کورددا/ چارەسەری کێشەی کورد لە قەید و بەندی جیهانبینیی (یەکگرتوو)دا/ سروشتی کێشەی کورد نە (ئایینی)یەو نە (ئیسلامی)یە/ ئەو چارەسەرەی کە یەکگرتوو بۆ چارەسەری کێشەی کورد پێشنیاری دەکات؟/ یەکگرتوو دەستکەوتەکانی خەڵکی کوردستان بە (ئیسلام)ی دەکات/ یەکگرتوو بە ئەزموونی (ئیخوان موسلمین)ی میسر، کارە خێرخوازییەکان یان چاندنی تۆوی ئیرهاب لە کوردستاندا؟

**٦– ئیسلامییەکان و کێشەی کورد**

نووسین: شێخ عومەر غەریب

بڵاوکراوەی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: زانست، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٠، ل:٨٢، پ:٢١×١٥

ناوەرۆک: لە یەکەم لاپەڕەدا نووسراوە: (ئەم نووسینە لە ژمارەکانی «٢٢، ٢٧، ٢٩، ٣٠-٣١ی گۆڤاری «مامۆستای کورد» چاپی سوید بڵاوکراوەتەوە...)/ ئیسلامییەکان و کێشەی کورد/ هەڵوێست و بۆچوونەکانی ئنستیتیوتی لێکۆڵینەوەی ڕامیاری/ پەراوێزەکان.

**٧– ئیسلامی سیاسی– کۆمەڵە وتار**

نووسین: شوان ئەحمەد

بڵاوکراوەی گۆڤاری هاڤیبون

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥١، س: ٢٠٠٠، ل:١٤٨، پ:٢١×١٥

ناوەرۆک: پێشەکی: ڕامیار مەحموود/ هەندێ بابەتی وەک: کۆمیدیای ئیسلامی سیاسی/ ئیسلامی سیاسی لە واقیعی ئێمەدا/ کێشەی کورد لە ستراتیژییەتی یەکگرتوودا/ هەوڵی نەتەوە ژێردەستەکانی خەلافەتی عوسمانی.

**٨– چەند وتار و لێکۆڵینەوەیەک لەمەڕ ئیسلامی سیاسی**

ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: زانست، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٠، ل:١٥٠، پ:٢٠×١٥

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ بابەتەکان زۆربەیان وەرگێڕراون تەنیا ئەم دوو بابەتە نووسراوە...: ڕەوتی ئیسلامی و گەمە سیاسییەکان: نەوزاد عەلی ئەحمەد/ ئیسلامی سیاسی ئامرازی دەستی ڕۆژئاوایە: هەژار ئەحمەد.

**٩– ئیسلامی سیاسی و ناسنامەی نەتەوەیی**

نووسین: د.ڕەفیق سابیر

بڵاوکراوەی مەکتەب ڕێکخستن– بەشی ڕووناکبیریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ڕووناکبیری، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠١، ل:٤٤، پ:١٤×١٠

ناوەرۆک: ئیسلامی سیاسی/ هەڕەشەیەک لە ناسنامەی نەتەوەیی کورد/ ئیسلامی سیاسی و ناسنامەی نەتەوەیی/ ئیسلام و ناسنامە/ ئیسلام و بزاڤی نەتەوەیی کورد/ شەرعیەتی کاری سیاسی.

تێبینی: ئەم کتێبەمان دەست نەکەوتووە و بەپێی ئەرشیفی کۆمپیوتەریی (مەکتەب ڕێکخستن– بەشی ڕووناکبیریی «ی.ن.ک.»)ەوە، ناوەرۆک و ناسنامەی بۆ ئامادە کراوە.

**١٠- لە پەراوێزی قسەکانی (١٠/١٨)ی سکرتێری گشتی یەکێتی دا! (چەند سەرنجێک لەسەر ئیسلامییەکان)**

نووسین: ئاسۆ غەریب

بڵاوکراوەی بنیاتنانی حیزبی کرێکارانی کۆمۆنیست- عێراق

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠١ (کانوونی یەکەم)، ل:٢١، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: سەرنجێک/ هەندێ بابەتی وەک: لە پەراوێزی قسەکانی ١٠/١٨ی (سکرتێری گشتیی یەکێتی)دا-چەند سەرنجێک لەسەر ئیسلامییەکان/ دەسەڵاتی کۆماری ئیسلامی ئێران لە کوردستانی عێراقدا/ ئایا سەربەستکردنی تیرۆریزم بەشێکە لە ئازادی؟/ جوندولئیسلام.../ ئامانج لە هاوکاری و یارمەتیدانی ئیسلامییەکان چییە؟

**١١- یەکگرتووی ئیسلامیی و توێژی خوێندکاران بنیاتنانی دوارۆژ**

نووسین: هێرش

بڵاوکراوەی زنجیرەی لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلامی سیاسی لە کوردستانی عێراقدا

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠١، ل:٨٦، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ پێشەکی/ هەندێ بابەتی وەک: گرینگی توێژی خوێندکار/ ئیسلامی سیاسی و توێژی خوێندکاران/ یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی کوردستان/ زەمینەی تەشەنەسەندنی یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی لەناو توێژی خوێندکاراندا/ ئاماری ئەنجامەکانی یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی لە هەڵبژاردنەکانی ناوچەی دەسەڵاتی (ی.ن.ک.)دا/ ئاماری ئەنجامەکانی یەکگرتووی قوتابیانی ئیسلامی لە هەڵبژاردنەکانی ناوچەی دەسەڵاتی پارتی-دا/ چ ڕەوتێکی سیاسی ڕۆڵی بنچینەیی هەیە لە نانەوەی گێرەشێوێنی و تێکدانی پەیامی زانستییانەی خوێندن لە خوێندنگاکاندا؟/ پەراوێز و سەرچاوەکان.

**١٢- ئیسلامی سیاسی- تێڕوانینێک بۆ مەسەلەکانی ئینتەرناسیونالیزمی دینی، نەتەوایەتی، دیموکراسی، ئازادیی بیروڕا و عیلمانیەت**

نووسین: فەرید ئەسەسەرد، عەباس خۆشناو، د.ماهر شەریف، جان ئال سپۆزیتۆ، جیمس پیسکاتوری

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٧، س: ٢٠٠٢، ل:١٥٥، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ ئینتەرناسیونالیزمی دینی و دیاردەی فرەنەتەوەیی: فەرید ئەسەسەرد/

ململانێی ئیسلام و عەلمانییەت لە تورکیا: عەباس خۆشناو/ ئازادیی بیرورِا لە نێوان رِیفۆرِمی دینی و ئیسلامی سیاسیدا: د.ماهر شەریف/ ئیسلام و دیموکراسی: جان ئال سپۆزیتۆ و جیمس پیسکاتوری/ ناواخن.

**١٣- توندوتیژی دیاردەیەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتییە**

نووسین: سەرۆ قادر

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: و-پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٥، س: ٢٠٠٢، ل:١٣٩، پ:١٥×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی (لێرەدا نووسراوە: لەم نامیلکەیەدا، هەوڵم داوە خوێندنەویەکی مێژوویی، لەسەر تەجرەبەی توندرِۆیی لە دیرۆکی فەرمانرِەواییەکانی جیهانی ئیسلام بکەم. لەپاڵ ئەوەشدا ئاورِێکم لە قۆناغی کۆلۆنیالیزم و کاریگەریی فیکرییان لەسەر رِۆژهەڵات داوەتەوە. هەروەها نووسراوە: سەبارەت بە قۆناغی ئێستا و کاریگەریی جیهانگیری بەسەر داهاتووی ناوچەکەمان و کوردستان بەتایبەتی، باسێکم لەو ترسە کردووە کە لە جیهانگیریی هەیە...)/ هەندێ ناونیشانی وەک: پەیوەندیی نێوان ئایین و دەسەڵات/ سەرهەڵدانی فیکری عەلمانی و ئیسلامی/ کۆمۆنیزم- سەرمایەداری و ئیسلامی سیاسی/ تیرۆر و ئیسلامیی توندرِۆ/ لە کوردستاندا فیکری ئیسلامیی سیاسی چۆن سەری هەڵدا؟/ ئیسلامی سیاسی- دین- نەتەوە (چاوپێکەوتن)...

**١٤- ئیسلام و تەوژمی ئیسلامیی لە بەردەم جەنگی شێواندنی وێنەکاندا**

نووسین: ئەبوبەکر عەلی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٤٩، س: ٢٠٠٣، ل:١٣٢، پ:١٤×٢١

ناوەرۆک: پێشەکی/ هەندێ بابەتی وەک: تەوژمی ئیسلامی لە قەیرانی خوێندنەوەوە بۆ بەردەم دەرگاکانی رِەشبینی/ ئیسلام و ئیسلامییەکان- گەرِان بە دوای رِایەڵەکانی پەیوەندیدا/ لە گرفتی سیماوە بۆ کوشتنی زمانی دیالۆگ/ ستراتیژی چەواشە و شێواندنی رِاستییەکان تا ئاستی تیرۆری فیکر/ دەستپێکردن لە دوژمنایەتی ئیسلامەوە/ حیکایەتی بەزۆر سەپاندنی ئیسلام/ هەڵوێستی ئیسلامییەکانی جیهان لە مەرِ کێشەی کورد/ ئیسلامییەکان و کارەساتی هەڵەبجە- پرسیارێ لە هەڵوێست و هاوسۆزی/ سەرنجێک لە هەڵوێستی رِەسمی هەندێ لە دەوڵەتان بەرامبەر مەرگەساتەکە/ نووسەر لە نێوان جادوولێکران و جادووکردن لە خوێنەران/ کام دیموکراسی/ هەروەک چۆن ئەوە ئیخوان نەبوو ئەمەش یەکگرتوو نییە/ گەرِانەوە بۆ لۆژیکی فالچی/ کێ تیرۆری فەرهەنگی دەکات؟/

پرسی ناسنامەی نەتەوەیی لە بەردەم ئیسلام و ئیسلامییەکاندا- وەڵامێک بۆ د.ڕەفیق سابیر/ گوتاری کوردی و گوتاری ئیسلامی- هەوڵدان بۆ نانەوەی شەڕێکی دەستکرد لە نێوانیاندا/ ئیسلامییەکانی کوردستان ئیستسنائێکی تری کوردی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامی/ هۆکاری گەشەکردنی ئیسلامییەکان/ لە پێناو دیالۆگێکی ئیسلامی- عەلمانیی سەرکەوتوودا/ خولانەوە لە بازنە کلاسیکییە داخراوەکەی باسی ئیسلامییەکاندا/ پێڕست.

**١٥- بەرەو پێناسەیەکی ورد بۆ چەمکی ئیسلامی سیاسی- وەڵامێک بۆ کاک نیاز سەعید عەلی**

نووسین: قاسم محەمەد مستەفا

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦١٤، س: ٢٠٠٤، ل:٢٢، پ:١٢×١٧

ناوەرۆک: پێشەکی/ چەمکی ئیسلامی سیاسی/ پێناسەی ئیسلامی سیاسی/ سەرچاوەکان.

**١٦- (قاسم محەمەد مستەفا) هەڵەی ڕاستکردۆتەوە یان ڕاستی بە هەڵەدا بردووە؟!**

نووسین: نیاز سەعید عەلی

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٢٩، س: ٢٠٠٤، ل:١١٧، پ:١٠×١٥

ناوەرۆک: ڕوونکردنەوەیەک (لێرەدا هاتووە: ئەم نامیلکەیە لە دوو بابەت پێکهاتووە... بابەتی یەکەمیان بریتییە لە وەڵامی وتارێکی «قاسم محەمەد مستەفا...» بە ناونیشانی «بەرەو پێناسەیەکی ورد بۆ چەمکی ئیسلامی سیاسی، وەڵامێک بۆ کاک نیاز سەعید عەلی»... بابەتی دووەمیشیان... بریتییە لە وەڵامێک بۆ چاوپێکەوتنی ئامادەکراوی «قاسم محەمەد مستەفا»...).

**١٧- کورتە باسێک دەربارەی ئیسلامی سیاسی**

نووسین: دیدەوان سەید محەمەد (شەهید)

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٨٢، س: ٢٠٠٤، ل:٩٦، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: لە جیاتی پێشەکی: شەماڵ عەبدوڵڵا/ دەسپێک/ هەندێ بابەتی وەک: ئیسلام- سیاسەت/ ئیسلامی سیاسی و بڵاوبوونەوەی/ کورد- ئیسلام/ ئێران و سەرهەڵدانی گرووپە ئیسلامییەکان لە کوردستان/ لەشکری ئیسلامی کورد/ یەککگرتووی ئیسلامی/ گرووپە ئیسلامییەکان و هەڵوێستیان بەرامبەر بە بزاوتی کورد/ سێ کوچکەی بۆچوونی گرووپە ئوسوڵییەکان/ چەند نموونەیەک لە تیرۆر/ سەرچاوەکان.

**١٨– گفتوگۆکان– بەشی یەکەم**

ئامادەکردن: شوان ئەحمەد

بڵاوکراوەی هەفتەنامەی سلێمانیی نوێ– سەرۆکایەتیی شارەوانیی سلێمانی

چاپ: یەکەم، چ: ژیر، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٨٩، س: ٢٠٠٤، ل:١٦٤، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ یەکەم: دەربارەی ئیسلامی سیاسی: بەختیار عەلی/ دووەم: سەبارەت بە عەلمانیەت: ڕێبین هەردی/ سێیەم: ئیسلامی سیاسی و دیموکراسی: د.سەباح بەرزنجی.

**١٩– لێکۆڵینەوە لە ئیسلامی سیاسی– چەمک، مامەڵەی دەق، پلورالیزم، خەسڵەت**

نووسین: نیاز سەعید عەلی

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٦١، س: ٢٠٠٤، ل:٥٦، پ:١١×١٧

ناوەرۆک: پێناسە و چەمکی زاراوەی ئیسلامی سیاسی/ پەیوەندی و مامەڵەی ئیسلامی سیاسی لەگەڵ ئایینی ئیسلام/ پلورالیزم لە کاری ئیسلامی سیاسیدا/ خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ڕەوتی ئیسلامی سیاسی/ سەرەنجام.

**٢٠– ئیسلامی سیاسی**

نووسین: شوان ئەحمەد

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: سێیەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٣٨، س: ٢٠٠٥، ل:٤٨٩، پ:١٥×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی: ڕامیار مەحموود/ بەشی یەکەم: وتار و لێکۆڵینەوە/ بەشی دووەم: ڕانانی کتێب/ بەشی سێیەم: وەرگێڕان.

چاپەکانی پێشتری ئەم کتێبەمان بۆ ساغ نەکراوەتەوە، ڕەنگە چاپی یەکەمەکەی کتێبی (ژمارە ٢ی بەرگی دووەم– بەشی دووەم) بێت؟

**٢١– بە پەراوێزی بزووتنەوە سیاسییە بەناو ئیسلامییەکانەوە**

نووسین: مسوڵمانێکی بەرچاوڕوون؟

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٩٩، س: ٢٠٠٥، ل:٩٦، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: هیچ ناونیشانێکی تێدایە نییە...

**٢٢- دیموکراسی و ئیسلامی سیاسی- چەند لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی ڕەخنە ئامێزە**
نووسین: فوئاد سدیق
بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر
چاپ: یەکەم، چ: و- ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ١٦٣، س: ٢٠٠٥، ل:١٧١، پ:١٩×١٤
ناوەڕۆک: بەرکوڵ/ دیموکراسی دروستبوون و ناوەڕۆک و بەکارهێنانی/ تێگەیشتنمان بۆ ئایین و ئیسلام و ئیسلامی سیاسی/ یەکگرتووی ئیسلامی/ دەروازەیەک بۆ چوونە ناو دروستکردنی بڕیاری سیاسی/ ئیخوان موسلمین و هەڵوێستی نانیشتمانییان/ ئایین و سیاسەت/ پاکستان بە هۆی سیستمی سەقامگیری ئیسلامی ژەنراڵی- ئۆلیجارکی ناسنامەی نەتەوەیی لە دەست داوە/ خوێندنەوەیەکی سەرەتایی ململانێی جوولەکە و عەرەب+ ڕێککەوتنی ستراتیژی ئەمریکا و جوولەکە/ چەردەیەک لە هەلومەرجی نێودەوڵەتی و تاووتوێکردنێکی واقیعی سیاسیی کوردستان.

**٢٣- ڕەهەندەکانی لێکۆڵینەوە لە ئیسلامی سیاسی- وەڵامێک بۆ ڕەخنەکەی نیاز سەعید لەمەڕ (مێژووی پێوەندییە نهێنییەکانی نێوان پشتیوانانی ئیسلام و ڕێکخراوی قاعیدە)**
نووسین: فەیسەڵ عەلی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٣٠، س: ٢٠٠٥، ل:٩٨، پ:٢٠×١٤
ناوەڕۆک: دەروازە/ هەندێ ناونیشانی وەک: دیلی زانیاری/ گرووپی حەماس/ ئەندامە بێزارەکان/ پێش و پاش ڕاپەڕین/ مەلا عەلی عەبدولعەزیز/ مەلا عوسمان/ پرسەی سەلەفییەکان/ مەلا کرێکار/ سەرەنجام/ چاوپێکەوتنێک لەگەڵ (حەسەن یاسین) لەمەڕ ئیسلامی سیاسی: تارا عەبدولکەریم شاری.

**٢٤- ڕۆژنامەنووسیی ئیسلامیی لە کوردستانی عیراق ١٩٩١- ١٩٨٢**
نووسین: هەژار حاتەم
بڵاوکراوەی ڕۆژنامەی کۆمەڵ
چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٠١، س: ٢٠٠٥، ل:٢١٨، پ:٢٠×١٥
ناوەڕۆک: ناوەڕۆک/ وتەی سەرپەرشتیاری زانستی/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: لایەنی تیۆری/ باسی یەکەم: دەربارەی ڕۆژنامە و ڕۆڵی ڕۆژنامەوانی/ باسی دووەم: کاریگەری و گرینگی داهێنانی چاپ- چاپخانەی (شەهیدان) و (بێتووشی) و ڕۆڵیان لە ڕۆژنامەوانیی

کوردیدا/ باسی سێیەم: چەمکی ڕاگەیاندنی ئیسلامی/ خاسییەتەکانی ڕاگەیاندنی ئیسلامی/ بەشی دووەم: هەڵسەنگاندن و خستنەڕوو (پراکتیکی)/ باسی یەکەم: ڕۆژنامە و گۆڤارە ئیسلامییەکان- چەمکی گۆڤار و ماگازین/ ئاسۆی ئیسلام/ نداو الغریب/ ئاڵای ئیسلام (رایە الاسلام)/ (ئاڵای ئیسلام) یان ئاڵای چڵکاوخۆری و بەکرێگیراوی/ دەنگی باوەڕ/ ڕۆژنامە (النفیر)/ گۆڤاری (النفیر)/ (النفیر) و چاوپێکەوتنێکی گرینگ لەگەڵ مام جەلالدا/ هەڵەبجە/ بانگەواز/ ڕاپەڕین/ هەڵوێست/ (الصف)/ گزنگ/ بانگی هەق/ (الشهداو)/ مەشخەڵ/ بانگی ڕاستی/ باسی دووەم: بڵاوکراوە زنجیرەییەکان (نهێنی و ئاشکرا)/ ڕۆشنبیری (نیگا)/ ناودارانی ئیسلام/ هەڵکەوتووانی ئیسلام/ دوژمنانی ئیسلام/ چەند بڵاوکراوەیەکی دیکە/ شاعیرانی ناو سەنگەر/ لەگەڵ موجاهیداندا/ دەنگی شەهیدان/ بەندەکانی خوا/ پەیام/ چەکی کیمیایی و میکرۆبی/ پاشکۆی (فاجعە حلبجە کبری جرائم العصر)/ لواو صلاح الدین/ بەشی سێیەم: ئەنجام و پێشنیاز/ ئەنجامەکان/ پێشنیاز/ لیستی سەرچاوەکان/ پاشکۆ.

### ٢٥- کۆمەڵگا، دین و توندوتیژی

نووسین: سەرۆ قادر

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ١٦٢٨، س: ٢٠٠٨، ل:١٨٨، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: چۆن لە ئایین تێدەگەین؟/ بەشی دووەم: پەیوەندیی نێوان ئایین و سیاسەت/ بەشی سێیەم: ئیسلامی سیاسی- دین و نەتەوە/ ئەنجامی باسەکان/ فەرهەنگۆک.

### ٢٦- ئیسلامی سیاسی و سێکوچکەی توندڕەوی

نووسین: سەڵاح ڕەنجدەر

چاپ: دووەم (بژارکراو)، چ: گۆڤاری ڕێبەری پێشمەرگە، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٧٩٨، س: ٢٠٠٩، ل:٨٦، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێشەکی/ بەشی یەکەم: ئاییندەی ئیسلامی سیاسی لە نێوان توندڕەوی و دیموکراسیدا/ بەشی دووەم: سێ کوچکەی توندڕەوی و تەنگژەی پێکەوەژیان/ بەشی سێیەم: کۆمەڵە ئیسلامییەکان/ بەشی چوارەم: بەرەو بزووتنەوەیەکی دیموکراتی موحافیزکار...

تێبینی: چاپی یەکەمی ئەم کتێبەمان دەست نەکەوتووە




**٢٧- ڕەوتی ئیسلامی لە باشووری کوردستان ١٩٤٦-١٩٩١ توێژینەوەیەکی مێژوویی لە کار و چالاکیی پارت و کۆمەڵە ئیسلامییەکان**

نووسین: ئیدریس سیوەیلی

چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ١٥٥٧، س: ٢٠٠٩، ل:٤٧٩، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێڕست/ قسەیەک بۆ مێژوو/ پێشەکی/ دەروازە/ بەشی یەکەم: ڕەوتی ئیسلامی لە نێوان سالانی ١٩٤٦- ١٩٧١/ بەشی دووەم: لە کاری تاکە کەسییەوە بۆ کاری ڕێکخراوەیی/ بەشی سێیەم: ڕەوتی ئیخوان موسلمین ١٩٧٨- ١٩٩١/ بەشی چوارەم: چەند پارت و ڕێکخراوێکی ئیسلامی/ بەشی پێنجەم: بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق/ دەرەنجام/ ژێدەرەکان/ پاشکۆ/ بەڵگەنامەکان/ وێنەکان.

**٢٨- لە هەناوی ئیخوانەوە بۆ چەخماخەی چەک- کۆمەڵە دیدارێکە دەربارەی مێژووی ڕەوتی ئیسلامیی کوردستان**

ئامادەکردن: ئیدریس سیوەیلی

بڵاوکراوەی ڕۆژنامەی کۆمەڵ

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٥٠، س: ٢٠٠٩، ل:٣٢٥، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: پێشەکی/ کۆمەڵێک دیدار لەگەڵ: سوبحی داودی/ سدیق عەبدولعەزیز/ بورهان محەممەد ئەمین/ عەلی باپیر/ سەلاحەدین محەممەد/ نازم عەبدوڵڵا/ مەولوود باوەموراد/ عەلی عەبدولعەزیز/ ئەحمەد کاکە مەحموود/ جەعفەر مستەفا/ حەسەن شەمێرانی/ هیوا میرزا سابیر/ عەبدولستار مەجید/ محەمەد ڕەئووف/ ناوەرۆک.

**٢٩- بەڵگەنامەکان دەدوێن- بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی ١٩٩٢-١٩٩٩ بەرگی یەکەم**

ئامادەکردن: ئارام قادر- ئیدریس سیوەیلی

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٠١، س: ٢٠١٠، ل:٢٥٦، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: پێشەکی: ئامادەکاران/ هەروەک لە پێشەکییەکەدا هاتووە: (ئەم بەرهەمەش هەوڵێکی کەسیی خاکییە بۆ پاراستنی بەڵگەنامەکانی تایبەت بە ڕەوتی ئیسلامیی کوردستان، بەرهەمەکەش بە شێوەی زنجیرە بڵاودەکرێتەوە کە سێ قۆناغ لەخۆدەگرێت: بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی «١٩٩٢-١٩٩٩»- بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستانی عێراق «١٩٩١-١٩٩٩»- بزووتنەوەی یەکبوونی ئیسلامیی لە کوردستانی عێراق «١٩٩٩-٢٠٠١»... ئەم کتێبەش قۆناغی یەکەمە و ٨١ بەڵگەنامە لەخۆدەگرێت و هەموو بەڵگەنامەکانیش تایپ کراونەتەوە)/ وێنەی هەموو بەڵگەنامەکان وەک خۆیان.

**٣٠- دیاردەی ئیسلامی سیاسی و ڕەوتی ئیسلامی سیاسی لە کوردستانی عێراق**

نووسین: نیاز سەعید عەلی

بڵاوکراوەی پەیمانگای کادیران لە قەڵاچوالان

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٢٢، س: ٢٠١٠، ل:١٣٨، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ڕوونکردنەوە/ لێکۆڵینەوە لە دیاردەی ئیسلامی سیاسی/ پلورالیزم لە کاری ئیسلامی سیاسیدا/ خەسڵەتە ئایدۆلۆژییەکانی پرۆژەی ئیسلامی سیاسی/ چاوپێکەوتنی گۆڤاری (خێزان) لەگەڵ نیاز سەعید عەلی: سالار بیارەیی/ چاوپێکەوتنی هەفتەنامەی (چاودێر) لەگەڵ نیاز سەعید عەلی: سەلام عەبدولکەریم.

**٣١- دین و دونیا- چەند سەرنجێک دەربارەی شوێن و ڕۆڵی دین لە کوردستاندا**

نووسین: مەریوان وریا قانیع

چاپ: ؟، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٨٤، س: ٢٠١٠، ل:٢٠٦، پ:١٥×٢٢

ناوەرۆک: ناواخن/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: بەرخوردە هێمنەکان/ دیموکراسیەت و فەتوا.. عێراق و سیستانی/ عێراق و هێزە ئیسلامییەکانی/ ئیسلام و ڕۆژئاوا/ گەڕانەوەی سانسۆری دینی/ ئیسلامییەکان و شەریعەت و یاسا/ ترس لە عەلمانییەت/ عەلمانییەت و دین/ ئیسلام وەک ئایدۆلۆژیا/ پۆست ئیسلامیزم/ لەعنەتی پیاوە دینییەکان- سپینۆزا و ئیبن ڕوشد/ ڕووە تاریکەکانی دین لە کوردستاندا/ دین و دەوڵەت/ دین و قیرەقیر.. دین و بێدەنگی/ پیاوانی دین چ داواکارییەکیان هەیە؟/ پرسی ئینسان/ هاووڵاتی وەک ئینسان/ ڕۆشنگەری/ لە خوداناسییەوە بۆ کۆمەڵناسی/ کەی ئیسلامییەکانی کوردستان گەورە دەبن؟/ بەشی دووەم: بەرخورد و دیالۆگە فیکرییەکان/ کێشەی خراپ خوێندنەوە و خراپ تێگەیشتن/ کۆمەڵگا و لێکترازان- دەربارەی ئیسلام و عەلمانیەت و سیاسەت/ چاوپێکەوتن.

## کتێبی بێ ساڵ

**٣٢- ئیسلامییەکان و کێشەی کورد**

نووسین: شێخ عومەر غەریب

بڵاوکراوەی سەنتەری ڕاگەیاندنی کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان

چاپ: یەکەم، چ: زانست، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ؟، ل:٨٢، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپەکەی تری هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە شەش.

## دووەم: پێڕستکاری ١٩٩٧- ٢٠١٠

**١– هەڵوێستی حزبە سیاسییەکانی عێراق لەمەڕ کێشەی کورد ١٩٤٦– ١٩٧٠**

ئامادەکردن: (پ.د.ک) مەکتەبی سیاسی

بڵاوکراوەی مەکتەبی ناوەندی دیراسات و توێژینەوە

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٧، ل:٢١٤، پ:١٥×٢٢

ناوەڕۆک: دووەم: پارتە ئایینییە ئیسلامییەکان/ یەکەم: گرووپی ئیخوان موسلمین.

**٢– تورکیا و ململانێی عیلمانیەت– ئیسلام– کورد**

نووسین: ڕەزا هیلال

وەرگێڕانی لە ؟: دلێر عەباس

بڵاوکراوەی چاپخانەی ژین

چاپ: یەکەم، چ: ژین، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٩٥، س: ١٩٩٩، ل:١٠٠، پ:١٤×٢٠

ناوەڕۆک: ئەتاتورکییەکان یان ئیسلامییەکان/ ئیسلامی سیاسی لە پاش کودەتای ١٩٨٠/ داهاتووی ئیسلامی سیاسی.

**٣– تاقمە ئیسلامییەکان پێشێلکەرانی سەرەتاییترین مافەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کوردستان،.. تاوانبارن و دەبێ سزا بدرێن**

نووسین: موزەفەر محەممەدی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٩، ل:٣٧، پ:١٦×٢٠

ناوەڕۆک: تاقمە ئیسلامییەکان پێشێلکەرانی سەرەتاییترین مافەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و عەلمانی.

**٤– سەرهەڵدانی ئیسلام و پێشێل کردنی ئازادی**

نووسین: سامان نووری

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ١٩٩٩، ل:٥٨، پ:١٥×٢٠

ناوەڕۆک: پێشەکی/ ئیسلام و ئازادی/ ئیسلامییەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم و ئازادی/ ئیسلام و مافەکانی ژنان و ئازادی/ کوردستان/ دوا وتە/ سەرچاوەکان.

**٥– ئەو بابەتانەی بە ئازادی نووسیومن– چەند وتارێکی سیاسی**

نووسین: محەمەد سیاسیی ئەشکەنەیی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ١٩١، س: ٢٠٠٠، ل:٦٤، پ:١١×١٧

ناوەڕۆک: ڕەوتی ئیسلامی سیاسی/ شەڕی ناوخۆ– سوودمەندە بۆ ئیسلامییە سیاسییەکان/ جنێودان بۆ ئیسلام نەهاتووە.

**٦– بۆچوونێک لەمەڕ بە سیاسیکردنی ئیسلام– بۆ گفتوگۆکردن**

نووسین: عەلی ڕەزا

بڵاوکراوەی کتێبی گوڵان

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٤٣، س: ٢٠٠٠، ل:٨٢، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: دەروازە/ پێشەکی/ هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ئیسلامی سیاسی.

**٧– لەبارەی دیموکراسییەوە (وەڵامێک بۆ کاک مەلا بەختیار)**

نووسین: ڕێبین هەردی

بڵاوکراوەی چاپخانەی ڕەنج

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٣، س: ٢٠٠١، ل:٣٠٢، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: دیموکراسی و ئیسلامی سیاسی.

**٨– کولتوور و ناسیۆنالیزم**

نووسین: د. ڕەفیق سابیر

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٢، س: ٢٠٠٣، ل:٢٠٦، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ناوەرۆک/ بەشی چوارەم: ئیسلامی سیاسی و پێناسی نەتەوەیی کورد.

تێبینی: چاپی یەکەمی ئەم کتێبەمان دەستنەکەوتووە.

**٩– چۆن لە کێشەکانمان بدوێین؟**

نووسین: ئومێد قەرەداغی

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: ؟، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٤١١، س: ٢٠٠٤، ل:١٦٠، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پێڕست/ پێشەکی/ بەشی یەکەم: ئایین و ڕێنیسانس/ بەشی دووەم: لەبارەی بزووتنەوە ئیسلامییەکانەوە.

**١٠– ڕێبەری سایتە کوردییەکان**

ئامادەکردن: هێمن مەلا کەریم بەرزنجی

بڵاوکراوەی ڕێکخراوی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەری کوردستان KICO

چاپ: یەکەم، چ: کارۆخ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٦٦، س: ٢٠٠٤، ل:١٠٦، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: بەشی حەوتەم: ماڵپەڕە ئایینی و ئیسلامییەکان.





**١١– عەلمانیەتی ئەوان و نیگەرانی ئێمە**

نووسین: ئیسماعیل کوردە

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبیی نما

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: هەولێر؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٤، ل:١١٠، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: ئیسلامی سیاسی.

**١٢– باشووری کوردستان لە نێوان دوو هەڵبژاردندا ١٩٩٢– ٢٠٠٥**

نووسین: حامید گەوهەری

چاپ: یەکەم، چ: بڵاوکراوەی کاوە، ش: سوید– ستۆکهۆڵم، ISBN:91-631-1889-0،

س: ٢٠٠٥، ل:٦٤٢، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: جیابوونەوە لەناو لایەنە ئیسلامییەکان ئاژاوە دەخاتە کوردستان...

تێبینی: ساڵی لەسەر نییە و بەپێی ناونیشانی کتێبەکە، لەم ساڵەدا دانراوە.

**١٣– ڕوشەنبیری نەتەوەیی**

نووسین: ناقسەر نووری عەبدال

بڵاوکراوەی مەکتەبی سکرتاریەتی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان– بەشی پێگەیاندن

چاپ: یەکەم، چ: هاوار، ش: دهۆک، ژ.س: ٦١١، س: ٢٠٠٥، ل:٦٥، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ڕۆشنبیری نەتەوەیی و ئیسلامی سیاسی.

**١٤– کورد و عروبە (کۆمەڵە وتار)**

نووسین: بابەکر درەیی

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٥، ل:١٢٨، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: ئیسلامی سیاسی لە قۆناغی دیالۆگدا.

**١٥– بیرەوەریەکانم بۆ مێژوو– بەرگی سێهەم**

نووسین: خدر مەرەسەنە

چاپ: یەکەم، چ: دیلان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٣٠، س: ٢٠٠٦، ل:١٥٤، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: پرۆسەی دیموکراسی لە سیستمی ئیسلامی سیاسیدا سەرکەتوو نابێت؟

**١٦- کۆڕی هەواری خاڵی**

نووسین: شوان ئەحمەد

بڵاوکراوەی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٦، ل:١٢٠، پ:١٢×١٧

ناوەرۆک: بەختیار عەلی و وەڵامی ئیسلامییەکان.

ساڵی لەسەر نییە و بە پێی مێژووی نووسینی پێشەکییەکەی، لەم ساڵەدا دانراوە.

**١٧- پیرۆزی و ڕۆشنبیری- مشتومڕێک لەگەڵ فاروق ڕەفیق لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامە**

نووسین: فازیل قەرەداغی

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٥٥٤، س: ٢٠٠٧، ل:١١٨، پ:١٤×٢١

ناوەرۆک: تیرۆرکردنی کاراکتەر وەک هەڵەیەکی لۆژیکی و وەک تاکتیکێکی ئیسلامگەراکان (ڕوونکردنەوەیەک لەسەر هێرشە ژەهراوییەکەی ئیسلامییەکان): فاررووق ڕەفیق.

**١٨- تیرۆریسم وەک بیناکردنی کۆمەڵایەتی**

نووسین: عادل باخەوان

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٥٩، س: ٢٠٠٧، ل:٥٣٧، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: چەند بابەتێکی بە زەبروزەنگ و تیرۆریسم و ئیسلامی سیاسی و عێراق-یەکێتیی خاکی عێراق لە یادەوەریی کۆلێکتیڤی کورددیدا.

**١٩- ئۆپۆزسیۆن و ئاوارەیی- پرسەکانی ڕزگاریی نەتەوەیی لە خۆرهەڵاتی کوردستان**

نووسین: مامەند ڕۆژە

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٥٣، س: ٢٠٠٨، ل:٢٩٨، پ:١٣×٢١

ناوەرۆک: ئیسلامی سیاسی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.

**٢٠- بەهەشتی ڕازاوە لە کەلاوە- وتاری ڕۆژنامەوانی**

نووسین: بەدران ئەحمەد حەبیب

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٩١٠، س: ٢٠٠٨، ل:٥٣٦، پ:١٢×١٩

ناوەرۆک: ئیسلامی سیاسیی ناکوردی و کوردی.

**٢١- توركیا لە ئەتاتورکەوە بۆ ئەردۆغان**

نووسین: مەنال لوتفی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: مەجید سالَح- موحسین ئەدیب

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٣٩، س: ٢٠٠٨، ل:٢٤٧، پ:٢٠×١٥

ناوەرۆک: بەشی دووەم: جەنگی براکان و ناکۆکیی نێوان ئیسلامییەکان/ بەشی سێیەم: زڕباوکی ئیسلامی سیاسیی تورکی... پیاوێکی ماندوونەناس/ بەشی چوارەم: ناکۆکی نێوان ئیسلامییەکان و عەلمانییەکان.

**٢٢- کولتوور و ناسیۆنالیزم**

نووسین: د.ڕەفیق سابیر

بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

چاپ: سێیەم، چ: تیشک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٢٨٧، س: ٢٠٠٨، ل:١٨٨، پ:٢٤×١٧

ناوەرۆک: هەمان ناوەرۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بڕوانە کتێبی ژمارە هەشت.

**٢٣- سوڕی مانا- کۆمەڵێ چاوپێکەوتن لەگەڵ نەزەند بەگیخانی**

ئامادەکردن: نەزەند بەگیخانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: ؟، ژ.س: ٢٢٧٢، س: ٢٠٠٨، ل:١٢٠، پ:٢٠×١٤

ناوەرۆک: چاوپێکەوتنە لەبارەی: کۆمەڵگەی مەدەنی کوردستان/ ئیسلامی سیاسی.

**٢٤- نەتەوەیەک لەسەر کاغەز- ئیفادەیەکی کورت لەسەر نووسەرێکی «لابراوەوە»**

نووسین: ستران عەبدوڵلا

بڵاوکراوەی دەزگای خەندان بۆ پەخش و وەشاندن

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٨، ل:٤٨٤، پ:٢٤×١٧

ناوەرۆک: سووتاندنی ڕەمزی هەڵەبجە و ئیسلامییەکان.

**٢٥- دەرکەوتنی ڕێکخراوی قاعیدە لە کوردستانی عیراقدا**

نووسین: یوسف گۆران

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٥١، س: ٢٠٠٩، ل:٧٨، پ:٢١×١٤

ناوەرۆک: تەوەری یەکەم: کێ دەکرێ بە قاعیدە ناو ببرێ؟/ تەوەری دووەم: دەرکەوتنی ڕێکخراوە ئیسلامییەکان لە کوردستاندا.

**٢٦– سیاسەت گەمەیەکی بەردەوام**

نووسین: سەعید مەموزینی

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٥٦١، س: ٢٠٠٩، ل:٢٧٨، پ:٢٣×١٦

ناوەڕۆک: ئیسلامی سیاسی.

**٢٧– کتێبێک لە دژی دەسەڵات– وتاری ڕۆژنامەوانی**

نووسین: نەبەز گۆران

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:٣٥٠، پ:٢٠×١٤

ناوەڕۆک: کێ گۆڵ دەکات– نەوشیروان یان ئیسلامییەکان؟

**٢٨– مێژووی ئایینەکان– بەرگی یەکەم**

نووسین: د.کەیوان ئازاد ئەنوەر

بڵاوکراوەی کتێبخانەی ئەندێشە

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٧٩، س: ٢٠٠٩، ل:٢٢٤، پ:٢٢×١٦

ناوەڕۆک: ئایینی ئیسلام/ بەشی چوارەم: کۆمەڵە ئیسلامییەکان.

**٢٩– نەخوێندەواری لە زانکۆدا– دەربارەی گەنج و زانکۆ و شتی تریش**

نووسین: هێمن خورشید

لەبڵاوکراوەکای کتێبخانەی هەورامان

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ١٧٩٨، س: ٢٠٠٩، ل:٢٧٣، پ:٢٢×١٤

ناوەڕۆک: ئیسلامییەکان لە بەردەم پرسی گەندەڵیدا.

**٣٠– ئیسلام و عەلمانیەت لە تورکیا**

نووسین: فەرید ئەسەسەرد، د.ئیبراهیم خەلیل عەللاف، عەباس خۆشناو، د.عیسمەت عەبدولقادر، د.خەلیل عەلی موراد، ئیدریس بووانو، د.نەوال سوڵتان، محەمەد ڕەزا زارع

بڵاوکراوەی سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجیی کوردستان

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٤٢، س: ٢٠١٠، ل:٣٣٢، پ:٢٤×١٧

ناوەڕۆک: دیموکراسی و ئیسلامی سیاسی لە تورکیا: محەممەد ڕەزا زارع.

**٣١– سیاسەتی ڕۆژ– زنجیرە وتارێکی سیاسی و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنوسییە**

نووسین: هاودەنگ فارووق

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆژهەڵات، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٢٨٢، س: ٢٠١٠، ل:٢٠٦، پ:٢٣×١٧

ناوەڕۆک: بەشی چوارەم: فاکتەرەکانی هەرێمی– ئیسلامی سیاسی و تیرۆریزم (کۆمەڵێک بابەت).

